


زنجیرەی ١٢

میران ئەبراهام

# شەوگەڕەکان


- بابەت: ڕۆمان
- نۆبەی چاپ: ٢٠١٥
- چاپی سێیەم: ٢٠٢١
- کتێبی: ناوەندی بڵاوکردنەوەی کەپر
- دیزاینی بەرگ و ناوەوە: ناوەندی کەپر

ISBN: ٩ ٧٨١٢٣٤ ٥٦٧٨٩٧

٢٠٢١ سوێد




Keper.org

بۆ باوکم و سێوە

کاتی نووسینی ئەم ڕۆمانە، بەردەوام لە خەیاڵمدا بوون.

## ١
# ماڵەوە

دوای سەفەرێکی دوور و درێژ لە ڕۆماوە بۆ برۆکسل و پاشان بۆ شارەکەم گەڕامەوە، کاتێک خۆم کرد بە کۆلانی فریدریکدا، کاتژمێر هەشتی شەو بوو، ئەو کۆلانەی ماڵی ئێمەی لە شاری ئەمستردام لێ بوو.

کۆلانێکی بەرتەسک و درێژکۆلە، هەموو ئەو ساڵانەی من لەوێ ژیام، هیچ شتێک تێیدا نەگۆڕا، تەنها ئەوەندە نەبێت، وەرزەکان ڕەنگێکیان دەبرد و ڕەنگێکی دییان بە کۆلانەکەمان دەبەخشییەوە.

بەهاران، بەدرێژایی ئەمبەر و ئەوبەری ئەو کۆلانە، بە گوڵی ڕەنگاوڕەنگ دەڕازایەوە. بێجگە لە داربەڕووە پیرەکان، کە باڵایان تا ئاستی بەرزی ماڵەکان هەڵچووبوو، لە هەوادا شانیان لە شانی یەک گیر کردبوو، دارگڵۆپەکانی سەر شۆستە بەرد ڕێژەکان، شەوانە بەکۆمەڵ نیگابانی کۆلانیان دەکرد، بە ڕۆژیشدا چاویان لێک دەنا و خۆیان لە بنهەنگڵی داربەڕووەکان توند دەکرد. من و پشیلەکانیش، تا بەرەبەیان بێدار بووین و لە خامۆشی و بێ

سـرتەیی کۆلانمـان دەڕوانـی، بـە تەمـەنی مـن، لـەو کۆلانـەدا نـە داربەڕوویـەک و نـە دارگلۆپێـک لا بـراون و نـە خێزانێـک بـاری کردووە و نە خانوویەکیش نۆژەن کراوەتەوە.

کۆلانەکـەمان یـەک دەروازەی هـاتنەژوورەوەی هـەبوو، ئەوسـەری بە کەناڵێکی ئاو کۆتایی دەهات، ماڵی ئێمە دەکەوتـە بـەر دەسـتی ڕاستی کەناڵەکەوە، چەندین داربەڕوو دەوریان دابوو، لە تیرۆانین و پرشنگی خۆر دەیان پاراست.

سی ساڵ پێش ئێستا، من لـەو خـانووە کۆنـەدا لـەدایک بووم، ئـەو خانووەی زیاتر لە سێ بەشـی ژیانم لەبـەینی دیوارەکانیدا بەسـەر بردووە، ڕۆحم لەگەڵ هەیکەلی ئەو ماڵەدا، هۆگری یـەک بوون، بـە جۆرێک، لەبەینی دیوارە ڕەنگاڵەکانی ئەم خـانووەدا ئاسوودەم، بـە پێچەوانەوە، لە سـنووری دەرەوەی ئـەم ماڵـە، بـەردەوام بێهۆش و ونـم، ماڵێـک، یـەک ڕۆژ لێـی دوور بـم، هەسـت دەکـەم لـە خـۆم دوورم.

لـە سـەردەمی منداڵیمـەوە تـاوەکوو ئـەمڕۆ، لـە کۆلانەکەماندا تـەنها هاوڕێیەک چییە، نەمبووە، ئەگەر باش بەبیرم بێتەوە، هۆکەی ئـەوە بـوو، لـەو کاتـەدا گـەڕەک هـیچ هاوتەمـەنی منـی تێدا نـەبوو، زۆر بەئەستەم ڕێبوارێکیش بەوێدا گوزەری دەکرد، ئەگـەر بەڕێکـەوت ڕووی بدایـە، تـاوەکوو لـە گـەڕەک دەر دەچـوو، بـەردەوام لـێم دەڕوانـی، شـێوازیم لـە خەیاڵمـدا هەڵدەگرت، پاشـان لـە دەفتـەری یادەوەرییەکانمدا سکێچیم دەکرد.

سـەردەمی منـداڵیم بەتـەنها گوزەرانـد، بـەبیرم دێـت، لـە پشـتی داربەڕووەکانەوە لەگەڵ دارگلۆپەکاندا چاوشـارکێمان دەکرد، هـەر ڕۆژەی لەگـەڵ یـەکێک لـە دارەکـان دەبوومـە هـاوڕێ. دەسـتم لـە

دەستیان دەنا و بە بالایاندا هەڵدەزنام. بێجگە لە باخی پێش و پشتی ماڵەکان، وەکوو ناو گیرفانی پانتۆڵەکەم، شارەزای تەواوی کۆڵانەکەمان بووم، ئەوانەی کۆڵانەکەمانم لەگەڵدا بەش دەکردن، چەند پشیلەیەک بوون، کە پێکەوە ئەرکی پارێزگاریکردنی کۆڵانمان لە ئەستۆ بوو، تا کۆڵان لەو پشیلە و سەگ و منداڵە غەریبانە بپارێزین، کە بە قاچاخ لە گەڕەکەکانی ترەوە دەهاتنە کۆڵانەکەی ئێمە.

بەدەم خەیاڵەوە لەوەدا بووم، بۆ بەردەم دەرگای گەراجی ماڵەکەمان لێخوڕم، سەرسام بووم بەوەی جیپێکی ڕەنگ سەوز جێگەی ئوتومبێلەکەی منی گرتبوو، فیاتە بچووکە سوورەکەی دایکم لە بەردەمیدا وەستابوو، درێژیی بەردەمی گەراجەکەمان، دوو ئوتومبێلی دەگرت، ناچار بووم ئوتومبێلەکەم لە سەر شۆستەکە ڕابگرم.

بەدەم فیکەلێدانەوە، لە ئوتومبێلەکەم دابەزیم، جانتاکەم و ئەو دیارییەی بۆ ڕۆژی لەدایکبوونی دایکم لە کاغەزی ڕەنگاوڕەنگم گرتبوو، گرتم بە دەستمەوە و بەرەو ڕووی ماڵ کەوتمە ڕێ.

کاتێک بەلای جیپە سەوزەکەدا تێپەڕیم، جارێک بەدەوریدا سووڕامەوە و لێم ڕوانی، پاشان لە خۆمم پرسی، "دەبێت کێ میوانی دایکم بێت؟"

هەرچەندە دوودڵ بووم لە چونەژوورەوەم، بەڵام نەمدەویست ئەو ڕۆژە تێپەڕێت و من دایکم نەبینم، چونکە ئەو ڕۆژە، ڕۆژی لەدایکبوونی بوو.

گەیشتمە بەردەم دەرگاکە، ساتێک دەستەونەزەر ڕاوەستام. چەند هەناسەیەک لەناو بێدەنگیی چواردەورمدا هەستەکانم لە خامۆشی

و بێسرتەیی گەڕەکەکەماندا ڕاگرت و گوێم نا بە دەرگاکەوە، لە نادیارەوە دەنگی موزیکی جازم دەبیست، ئەو موزیکەی دایکم بەردەوام گوێی لێ دەگرت، بە ئاوازە دەنگی دایکمم دەبیست، پاشان، لەبەینی شەپۆلی دەنگی موزیکەکەدا، دەنگێکی تر دەهاتە گوێم، ئەوسا لەبەر خۆمەوە بە خۆمم وت، 'ئەوە دەنگی میوانەکەی دایکمە.'

بەدەم گوێگرتنەوە، دەرگام کردەوە، لە داڵانەکەوە بەرەو ڕووی چێشتخانەکە چووم، ئەو جێگەیەی ئاهەنگەکەی لێ ساز کرابوو.

کاتێک دەرگای چێشتخانەکەم کردەوە، بێجگە لەوەی دەنگی مۆسیقا و گۆرانییەکە لەبەر گوێمدا دووقات بوو، ڕوانیم، دایکم لەژێر باڵی کابرایەکی نەناسدایە و بە جووت لە بەردەم کەوانتەری چێشتخانەکەدا ڕاوەستابوون. دیمەنێک، لە ڕابردوومدا چەندین جار دووبارە بووبووەوە و نامۆ نەبوو بە ڕۆحم، پشتیان لە من بوو، یەکی کەوچکێکی داریان بە دەستەوە بوو، لە شێوەی مایکرۆفۆن و پڕ بە قوڕگیان گۆرانییەکەیان بە کۆرس دەچڕی، ئاگایان لە هاتنەژوورەوەی من نەبوو، بەختی ئەوەم هەبوو، لە نزیکەوە ببینم چۆن دایکم ئاهەنگی ڕۆژی لەدایکبوونی خۆی دەگێڕێت.

لەبەینی من و ئەواندا، مێزێکی داریی قاوەیی چوارنەفەری نانخواردن هەبوو، لەسەر مێزەکە، دوو شووشەی شەراب دانرابوو، یەکێکیان پڕ و ئەوی تریان هێندەی قوڕگی پێ تەڕ بکەیت، شراب لەبنیدا مابوو، دوو پەرداخی ملبەرز، لە سێبەری شووشەی شەرابەکاندا بوون، پەرداخەکان ئاسەواری شەرابی سوور بە لێویانەوە دیار بوو.

لەگەڵ تەواوبوونی گۆرانییەکەدا، دەستیان لەیەک بەر دا و دایانە قاقای پێکەنین، کاتێ ئاوڕیان دایەوە، ڕاچڵەکین و تاوێک بێدەنگ و سەرسام لێیان ڕوانیم، دایکم بزەیەکی بۆ کردم و بە دەنگێکی نووساوەوە وتی، 'چۆنی ئەزیزم، ئەوە دەمێکەیە لێرەیت؟'

ڕووبەڕووی یەک چووین و لەسەر سووچی مێزی نانخواردنەکە، باوەشمان بە یەکتردا کرد، زۆری نەبرد، خۆی لە باوەشمدا ڕاپسکاند، دەستی گرتم و ڕایکێشام بۆ لای کەوانتەرەکەوە و وتی، 'دەڵێم، مارتن، با کەسێکی تایبەتت پێ بناسێنم!'

پیاوەکە خۆی ڕاست کردەوە و دەستی بەرەوڕووم درێژ کرد، کاتێ دەستم لەناو دەستی نا، ئەو وتی، 'من کارلم، کارل لاوتین.'

چاوم بڕییە چاوی، ڕووی گەشاوە و دەمێکی بەپێکەنین، چاوی لە تەڕیدا شەوقی دەدایەوە، قژێکی زەردباوی لوول، بە ئاڵۆسکاوی بە لایدا خستبوو، باڵای زۆر بەرز و بەخۆوە بوو، من و دایکم بەئەستەم دەگەیشتینە شانی. پێدەچوو تەمەنی سەروو پەنجا ساڵ بێت، ئینجا لە دایکم ڕوانی و بینیم، خوێن لەسەر ڕوومەتەکانی کۆ بووبوونەوە، چاوی دەگەشایەوە، دڵخۆش و بەختەوەر دەهاتە پێش چاوم، وەکوو تازە لە خەو ڕابووبێت و بۆ دەستپێکی ڕۆژێکی نوێی ئامادە بێت، ڕووم لە کارل کرد و پێم وت، 'من مارتنم.'

'بەڵێ، دەزانم بەڕێزت مارتنیت، هەموو شتێکم دەربارەی تۆ بیستووە، دایکت لە باسی تۆ زیاتر، هیچ باسێکی تری لا نییە.'

لەگەڵ دایکم، لە چاوی یەکترمان دەڕوانی، پاش تاوێک بێدەنگی، پێم وت، 'دایە، ڕۆژی لەدایکبوونت پیرۆز بێت.'

لە کاتێکدا هەردووکیان شانبەشانی یەک ڕاوەستابوون، دەستیان

له دەستی یەک هەڵپێکابوو، دایکم هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بە ساردییەکەوە، 'بەڵێ، پەنجا ساڵ.'

'بوویت بە سارا، یان بۆم هەیە بڵێم، بوویت بە پیرێژن؟'

'ئاگات لە دەمت بێت.'

پێکەنی و دەستێکی خستە سەر شانم و دووبارە وتی، 'دەتەوێت بەم قسانە لەبیرم بەریتەوە، دەی بزانم، چ دیارییەکت بۆ هێناوم؟'

لەو دەمەدا، پشتم تێ کردن و چووم لە دالآنەکە دیارییەکەم بۆ هێنا و چوومە بەردەمی، بۆم ڕاگرت، 'فەرموو، خانم.'

پاش لێکردنەوەی ئەو کاغەزە ڕەنگالآنەی تێمەوە پێچابوو، تاوێک لەگەڵ کارل سەرسام لێیان ڕوانی، تابلۆیەک کە خۆم کێشابووم، بەدەم تەماشاکردنیەوە، دایکم وتی، 'زۆر تایبەتە، بیرۆکەکەی دەناسمەوە و ڕەنگەکانی غەریب نین بە خەیاڵم.'

لەسەر کەوانتەرەکە دای نا و دەستی کارڵی گرت و پێکەوە بەرامبەری، تاوێک بێدەنگ ڕاوەستان، کاتێک دایکم لە تابلۆکەی دەڕوانی، بە سەرسامییەکەوە وتی، 'دیمەنێکت خوڵقاندووە، داوا لە تەماشاکەر دەکەیت، بیر بکاتەوە، پاشان من دەمەوێت بزانم تۆ دەتەوێت چیم بۆ باس بکەیت، یان...'

پاش تاوێک بێدەنگی، بەردەوام بوو، وتی، 'ئەوەی من دەیبینم، دوو ماسکن لەناو یەکدا، هێڵەکانت بەئەستووری بەسەر فۆرمەکاندا ڕاکێشاون، ناواخنت بەتەختی و لە کاڵەوە بۆ تۆخ، لە سێبەری هێڵەکاندا ڕاخستووە، بەو ڕەنگانەی بەکارت هێناون، کارێکت کردووە، کە لە هەر گۆشەیەکەوە لێیان بڕوانیت، هیچکام لە ڕووخساری ماسکەکانت لێ ون نابێت.'

ئاوڕی لێ دامەوە و باوەشێکی توندی پێدا کردم، 'دەستت خۆش،

ئەزیزم، زۆر سوپاس، پێم بڵێ ئەم، دوو ڕوخسارە دەبێت کێ بن؟'
'خۆت هەڵی بێنە.'
سەیرێکی یەکترمان کرد و دەستمان کرد بە پێکەنین.
دایکم دەستی لەیەک هەڵپێکابوو، وەکوو خوویەکی هەمیشەی، لەبەر خۆیەوە بەهێواشی گۆرانیی دەچڕی، دەستی دایە شووشەیەک لە شەرابەکان و پێی وتم، 'دەڵێم مارتن، پەرداخێک شەرابمان لەگەڵدا دەخۆیتەوە، بە بۆنەی بەپیرێژنبوونی دایکتەوە؟'
بێ ئەوەی وەڵامی بدەمەوە، پەرداخێکم لە کەوانتەرەکە دەرهێنا و لەتەنیشت دوو پەرداخەکەی ئەوانەوە دام نا، 'تەنها پێکێک.'
دوای ئەوەی دایکم پەرداخەکانی نیوە کرد، بەدەوری مێزی نانخواردنەکەدا ڕاوەستابووین، پەرداخەکانمان هەڵبڕی و هەرسێکمان بە کۆرس، 'بۆ ئێمە.'
دوای ئەوەی قومێکی تەواوم لە شەرابەکە دا، پەرداخەکەم لەسەر مێزەکە دانایەوە و زیاتر لێم نەخواردەوە، دایکم ڕووی تێ کردم، 'مارتن، بۆم باسکە، سەفەرەکەت چۆن بوو؟'
'بەدڵی خۆم بوو.'
'ئەی کارمن چۆنە؟'
'باشە، لە برۆکسل دەژی و لە نووسینگەیەکی گەشتوگوزار کار دەکات.'
'ئەی خۆشتان ڕابوارد؟'
'زۆر جێگەمان بینی.'
بە پێکەنینەوە دەستێکی خستە سەر شانم و بە دەنگێکی شەرمنانەوە وتی، 'مەبەستم ئەوە نەبوو، ویستم بزانم پەیوەندیی

تۆ و کارمن گەیشتە کوێ؟ چوویتە جێگەوە لەگەڵی یان نا؟'
'بمبوورە.'
'دەڵێم...'
'دایکە، تکایە، ئەوە هیچ پەیوەندیی بە تۆوە نییە.'
'بەڕاستتە؟'
'ئەوەتا من پرسیاری ئەوەت لێ ناکەم گوایا تۆ لەگەڵ کارڵ چوویتە ناو جێگەوە یان نا!'
'ئەگەر تۆیش وەکوو دایکت لووتژەن بیت، کەواتە بۆت هەیە هەموو شتێک بزانیت، خۆت دەزانیت من هیچ نهێنییەکم نییە.'
'نەخێر، بمبوورە، پێویست ناکات بزانم.'
بە تەوسێکەوە لێی ڕوانیم، 'ئەزیزم، ئەم کردەوەیەت نوێیە، بۆ تەندروستیت باش نییە!'
'تێناگەم، نازانم تۆ باسی چی دەکەیت.'
'باشە، بەڵام دەزانیت، مارتن، هیوام وایە بەدڵی خۆت لە کارمن پەڕیبیت.'
سەیرێکی دایکمم کرد و تاوێک لێم ڕوانی، بەبێ ئەوەی هیچ بڵێم، سەرم لێ ڕاوەشاند، پاشان ئەو وتی، 'ئاخ، دیارە، تۆ شەرابت کەم خواردۆتەوە.'
دایکم ئەمەی وت، پاشان شووشەی شرابەکەی هەڵگرت، کە لە نیوەی کەمتری تێدا مابوو، لەسەر پەرداخەکەی من ڕای گرت و بۆ سەر لێوارەکەی لاری کردەوە، خێرا لەسەر دەمی پەرداخەکەم لەپی دەستم ڕاگرت، بەبێ ئەوەی هیچ بڵێم، تا دوا دڵۆپی شەرابەکە هەردوو پەرداخەکەی تری لێ پڕ کرد، لەبەر خۆیەوە، بێ ئەوەی سەر هەڵبڕێت و سەیرمان بکات، وتی، 'کارڵ، ئەگەر

تۆیش وەکوو مارتن نەڵێیت بەسە؟'
'نا، من ئەمشەو ناڵێم بەسە.'
کارڵ کاتێک ئەمەی وت، دەستی لە ملی دایکم کردبوو. دایکم بە شڵەژاوییەکەوە، خێرا خۆی گەیاندە تەسجیلەکە و دەستی بە دوگمەیەکدا نا، زۆری پێنەچوو، دەنگی سەکسیفۆن ژوورەکەی پڕ کرد لە سۆزی نەغمەی خۆی، پاشان هەردووکیان باڵیان لە ملی یەکترەوە ئاڵاند، لەگەڵ بەرزی و نزمیی ڕیتمی تۆنی سەکسیفۆنەکەدا، دەستیان کردەوە بە گۆرانی چڕین. بەنیازی ڕۆیشتن بووم، چووم لەناو دەرگای چێشتخانەکەدا ڕاوەستام، سەیرێکی دایکم و کارڵم کرد و بە دەنگێکی بەرز وتم، 'من لە ژوورەکەی خۆمم.'
دایکم بەدەم گۆرانی چڕینەوە سەرێکی بۆ لەقاندم، کارڵ دەستێکی بۆ بەرز کردمەوە.
لە چێشتخانەکە چوومە دەرێ، ئەوەی لە داڵانەکە سەرنجی ڕاکێشام، تابلۆیەک بوو کە بە دیوارەکەیەوە هەڵواسرابوو، ئەوە خوویەکی هەمیشەیی دایکم بوو، لە داڵانەکە و لەسەر هەمان دیوار، هەمیشە تازەترین کاری خۆی هەڵدەواسی و نمایشی دەکرد، تابلۆیێک، کە چاومیان خێرا ماندوو کرد، جیاواز، زۆر جیاواز، قەبارەی گەورە و ناوەرۆکێکی بێڕەنگ، تەخت، بەتاڵ، هیچ پەیوەندییەکی ڕۆحیی بە ژیانەوە نەبوو، زۆر جیاوازتر لە هەموو کارەکانی تری، کە لە تەواوی وڵاتدا و بگرە لە زۆرێک لە وڵاتانی ئەوروپاشدا ئەویان بەناوبانگ کردبوو، چەند هەناسەیەک بەرامبەری ڕاوەستام و لێم دەڕوانی، هەستم کرد، تا دەهات، ڕۆحمی لە چۆڵایی و بەتاڵیی خۆیدا گیر دەکرد و خۆمم لێ ون

دەبوو، خێرا ڕووم لێ وەر گێرا و جانتای سەفەرەکەم بە دەستەوە گرت و بە پلیکانەکاندا بۆ ژوورەکەی خۆم سەر کەوتم.
بە سەرسامییەوە لەناو دەرگای ژوورەکەمدا ڕاوەستام، بینیم ژوورەکەم لە ماوەی تەنها یەک حەفتەدا زۆر گۆڕابوو، سەرتاپای دیوارەکانی بە وێنەی جۆراوجۆر داپۆشرابوو، وێنەی سەردەمی منداڵیم، تەنانەت وێنەی ساڵێک بەر لە ئێستا، کە لەگەڵ دایکم پێکەوە لە پاریس بووین، لەپشتی هەموو وێنەکانەوە ئەو ڕەنگ و خەتانەم دەبینی، کە بووبوون بە باکگراوندێک بۆ وێنەکان، ئەو نیگارانەی خۆم و خۆی لە سەردەمی منداڵیمدا پێکەوە کێشابوومان، دەمزانی، دایکم هەموو جارێک، دوای ئەوەی هاوڕێیەکی تازەی دەگرت، گۆڕانکاریی لە ماڵەکەدا دەکرد، بەڵام ئەوە بۆ یەکەمین جار بوو لە ژوورەکەمدا گۆڕانکاری ڕوو بدات و ئەو دەستکاریی ژووری من بکات.
نازانم، زۆر باش نایەتەوە یادم، کام وێنە زۆر سەرنجی ڕاکێشام و کامیان دەستی گەورەییان گرتم و بردمیانەوە بۆ سەردەمی منداڵیم، وێنەی من لەگەڵ هاوڕێکانی دایکمدا، وێنەی ئەو پیاوانەی ئاسان و ساویلکانە هۆگریان دەبووم و لەناکاو خۆیان لێ ون دەکردم.
وێنەکان، هەریەکە بە لایەکدا ڕایان دەکێشام و خەیاڵیان پەرت دەکرم، هەموویان بەشێک بوون لە ڕابردووم، ئەوەی ئێستامی لەوسام جیا دەکردەوە وێنەکان و کەرەستەی ناو ژوورەکەم نەبوون، بەڵکوو ئەوە تەنها خۆم بووم.
بە بێزارییەکەوە جانتاکەم لەسەر جێگەکەم دانا و زنجیرەکەیم کردەوە، لە یەک ساتەوەختی کورتدا، بۆنوبەرامێک بە ژوورەکەمدا

بڵاو بووەوە، بۆنی ئوتێلەکەی ڕۆما، بۆنی عەترەکەی و هالاوی تێکەڵاوبوونی ئارەقی جەستەی من و کارمن بوو، بۆنی حەفتەیەک پێکەوەبوونمان لە ڕۆما.

حەفتەیەک لە ڕۆما پێکەوە بووین، لە بەیانی زووەوە، تا درەنگانی شەو، بەسەر کوچەوکۆلانە هەزار ساڵ کۆن و سەرنجڕاکێشەکانی ئەو شارەدا گەڕاین.
دەتوانم بڵێم، پەیوەندیی من و کارمن، تاوەکوو ئەمڕۆیش، هێشتا لە چوارچێوەمان نەگرتووە و ناوونیشانێکمان پێ نەداوە، پێم وا بێت چەند ساڵێک پێش ئەو شەوە بوو، شەوی دوای ئەو ڕۆژەی لە شاری ئەمستردام پێکەوە لە زانکۆی ئەمستردام دەر چووین، هەردووکمان بەشداریی ئاهەنگی دەرچوونمان کرد، شەوی دوای ئەو ڕۆژە، لێک جیا بووینەوە و ماڵئاواییمان لە یەکتری کرد، کارمن گەڕایەوە بۆ بەلجیکا و منی بەجێ هێشت، چۆن و بۆچی؟ لەم چیرۆکەدا، جارێکی تر دەگەڕێمەوە سەر ئەو باسە.
بەڵام دوای ئەو شەوەی لێک جیا بووینەوە، هەرگیز دەنگمان لێک دانەبڕی و ڕۆژانە تەلەفۆن و ئیمایل لەنێوانماندا هەر بەردەوام بوو، ساڵی جارێک یان دووجاریش، بۆ پاریس یان بۆ شارێک لە شارەکانی ئیتالیا دەچووین.
ئەو حەفتەیەی لە ڕۆما بووین، دوو ڕۆژی یەکەم، لە ژووری ئوتێلەکە نەهاتینە دەرەوە، هەستم دەکرد ژوورەکەمان لە تێکەڵبوونی ئارەقی هەردووکماندا، بۆگەنی کردبوو، ئەو بۆنەی هەرگیز لووتەکانم لێیان پاک نابێتەوە، بۆنی تێکەڵاوبوونی هۆرمۆنی دوو دڵدار، درەنگانی ئێوارەیەک، کارمن بێدەنگیی

نێوانمانی شاکاند و بە دەنگێکی شەرمنانەوە وتی، 'کاتی ئەوە هاتووە، لە ئەمستردام یان لە برۆکسل پێکەوە بژین.'

سەرسام و دەستەونەزەر بێدەنگ لێم دەڕوانی، دیسان کارمن لەبەر خۆیەوە وتی، 'زۆر باش بیرم لێ کردۆتەوە.'

لەسەر جێگاکە هەستایە سەر ئەژنۆ و چاوی بڕییە چاوم و بەردەوام بوو، 'دەمەوێت لەگەڵ تۆدا بژیم.'

توند هەردوو دەستی گرتم و لێی ڕوانیم، 'پێت چۆنە؟'

قسەکانی ئەوم بە سەرنجەوە وەر نەگرت و دەستم کرد بە پێکەنین.

'دەی، وەڵامم بدەرەوە.'

بەملا و لادا خۆی لار دەکردەوە، لە دەرفەتێک دەگەڕا، بیقۆزێتەوە و لە چاوم ڕابمێنێ، سەرم داخست و لەبەر خۆمەوە وتم، 'کارمن، تۆ دەتەوێت فرسەتم لێ بێنیت، تکایە گوشارم مەخەرە سەر، نەبا وەڵامێکی نەشیاوت بدەمەوە.'

هەستامە سەر چۆک و لە کارمنم ڕوانی و پێم وت، 'پێویستە بیری لێ بکەمەوە.'

بە غەمگینییەکەوە چاوی لێک نا و بەهێواشی سەری لەسەر سنگم دانا. ئەو شەوە، کاتژمێرێک دوای ئەو لێدوانەمان، بۆ ئەوەی لە دەست بێدەنگی و بۆدڕنی ژوورەکەمان ڕزگارمان بێت، ژووری ئوتێلەکەمان بەجێ هێشت و چووین بۆ گەڕان، بەبێ پلان، شۆستەی ڕاستە شەقامێکمان گرتە بەر، ئەمبەر و ئەوبەری تەنها چێشتخانە بوون، بۆنی دەیان جۆر بەهارات تێکەڵا و بە هاڵاو و گەرمیی ئەو شەوە بووبوو، هەوایەکی چەور و شێدار، هەناسەی تەنگ کردبووین، خێرا لەو شەقامە دەرباز بووین، دەمانزانی لە

چێشتخانەکاندا زەحمەتە ئەوەمان دەست بکەوێت، کە ئێمە لەدوای دەگەڕاین، ئەویش نۆشینی شەرابی ئیتالی بوو، زیاتر لە دوو کیلۆمەتریک بەسەر ئەو کاشی و خشتە کۆنە چاڵوچۆڵانەدا ڕۆیشتین، کارمن بە پێڵاوە پاژنەبەرزەکانیەوە بەردەوام لەگەڵیاندا لە شەڕدا بوو، لە گەڕانەوەماندا، بە مەستی پێڵاوەکانی گرتبوو بە دەستیەوە و بە پێی پەتی شانبەشانی من دەڕۆیشت، کە بەبێ پێڵاوە پاژنەبەرزەکانیشی، چەند سانتیمەتریک لە من هەڵکشاوتر بوو.

بەڕێکەوت ڕێمان کەوتە بارێک، مەیخانەچییەکە لە ڕێوە ئاگاداری کردینەوە و پێی وتین، 'بۆ زانیاریتان، لێرە تەنها شەراب دەخورێتەوە، تەنها شەرابی ئیتالی!'

'کەواتە لە ئەدرەسێکی هەڵە نین.'

کاتێک ئەمەم بە پێکەنینەوە بە مەیخانەچییەکە وت. دیسان ئەو پێی وتین، 'ئەگەر شەرابخۆر بن، ئەوا ئێوە لە شاری ڕۆمادا، لە بە ناوبانگترین و کۆنترین ماڵی شەرابن!'

کارمن خێرا چاکەتەکەی داکەند و دای بەسەر قەراغی کورسییەکەیدا، بە دەنگێکی نەرم و بە نازێکەوە بە مەیخانەچییکەی وت، 'دەی، خێرا بۆ ڕاوەستاویت، ڕێنماییمان بکە، لە چ جۆرێکەوە دەست پێ بکەین.'

کارمن شان و سنگی لێ ڕووت کرد، نەک تەنها مەیخانەچییەکە، کە لەتاوا هەموو شەرابی بارەکەی قورگی تەڕ نەدەکردەوە، بەڵکوو چەند مشتەرییەکیش لێمان نزیک بوونەوە و لەگەڵماندا دەستیا کرد بە لێدوان و شەرابخواردنەوە. ئەو شەوە، لەسەر گیرفانی تەماشاکەرانی کارمن زۆرمان خوارد و خواردەوە.

ڕۆژی دوایی، کاتێک لە خەو هەستام، کاتژمێر یەکی دوانیوەڕۆ بوو، شەوی ڕابردوو چیمان کرد و چ ڕووی دا، ئەو پرسیارە بێ وەڵام مایەوە، کارمن هێشتا نوستبوو، چەند جارێک بانگم لێ کرد. لەژێر لێوەوە داوای لێ کردم وازی لێ بێنم، چونکە سەری زۆر دێشێت، بەهێواشی خۆم خزاندە ژێر چەرچەفەکە و تاوێک بەڕووتی خۆم لێ هەڵسوی، لەسەر دەم تەخت لێی کەوتبوو، هەستم دەکرد زۆر ماندوو بووم و کەمێک سەرم ئازاری دەهات، گەرمیی شەهوەتێک هەموو ئازای لەشمیان خستبووە سەر ئارەقەیەکی لینج، کاتێک جەستەی ڕووتمان بەر یەک کەوتن، هەستم بە گەرمی و بۆنی لەشی کارمن کرد، هەستم کرد خوێنی شەپۆلی دەدا و بەلێشاو خۆیان دەدا بە دیواری پێستی نەرم و تەنکیدا، لەو دەمەدا زەنگی کەنیسەیەک، زۆر لە دوور، بەهێواشی دەستی بە لێدان کرد، خێرایی جوڵەم، هێواش هێواش، لەگەڵ ڕیتمی لێدانی زەنگی کەنیسەکەدا ڕێک خست، لەپڕێکدا هەستم بە ماسولکەکانم کرد، وەکوو پارچەئاسنێکی سوورەوەبوو ئاوی ڕژابێتە سەر، کەف و چرەدووکەڵیان لێ هەڵدەسا، کفت و پرزە لێبڕاو، هەردوو باڵەکانم لە لەشیەوە ئاڵاندن و توند دەموچاوم چەقاندە نێوان شانەکانی و ناو نێوان قژە لوولە ئاڵۆزکاوەکەی، تاوێک دەنگم لە خۆم بڕی، تا تەواو هەستم بە ڕووتیی لەشی ئەو کرد.

پاش ئەوەی دوشێکم کرد و خۆم گۆڕی، کارمن هێشتا پرخەی خەوی دەهات، لەسەر پارچەیەک کاغەز بۆم نووسی، 'ئەگەر تا شەشی ئێوارە نەگەڕامەوە، ئەوە بزانە من لەگەڵ کاتدا سەفەرم کردووە و لە هەزار ساڵ پێش ئێستای ڕۆمادام.'

لە پرسگەی ئوتێلەکە ڕێبەرێکم کڕی، کۆی ئەدرەسی شوێنە مێژووییەکانی ڕۆمای تێدا بوو، لە چوونەدەرەوەمدا بە دەستی ڕاستدا، شەقامی بەردەمی ئوتێلەکەم گرتە بەر، لە کۆتایی ئەو شەقامە گۆڕەپانێک بوو، کە بەقەدەر یاریگەیەکی تۆپێن دەبوو، پاش تاوێک، پشوودان و لێڕوانینی دەلیلەکەم، خۆم کرد بە شەقامی ڕۆمیلۆسدا، کە یەکێک بوو لەو پێنج شەقامانەی دەکەوتنە سەر گۆڕەپانەکە، لەو شەقامەدا هەموو ئەو شتانە ئامادەییان هەبوو، کە ئیتالییەکان شانازییان پێوە دەکرد، کچ و کوڕی بالابەرز و ڕێکپۆش و قەشەنگ، بالاخانەی چەندین سەدە کۆن و ئەنتیک، بۆنی کافاین و ڕافیۆلی و پیتزا، گرمەی دەنگی مەکینەی ئوتومبێلی فێراری، گومانکردن لە هەموو ئیتالییەک، کە پێدەچێت مافیا بێت.

لەسەر شۆستەی هەمان ڕاستەشەقام، پاش ئەوەی دوو کیلۆمەترێکم بڕی، لە کۆتایی ئەو شەقامە، بۆ پشوودان لەژێر سێبەری چەندین پایەی کۆن و ڕەنگ دێزدا، وەکوو لە سەهۆڵ داتاشرابێتن و تەپوتۆزی کات و شەقامەکان چڵکنی کردبن، لێی دانیشتم، سەرنجم دا بە بەرزایی پایەکانەوە، بە لاتینی نووسرابوو، پالاتاین، تاوێک لە خۆمدا بۆ ماناکەی گەڕام. هەستم دەکرد پێشتر ئەو ناوەم بیستووە، بە چاوخشانێک بە ڕێبەرەکەدا، زانیم لەکوێ گیرساومەتەوە، پالاتاین، یەکێکە لەو حەوت گردەی ڕۆمای کۆنی لەسەر دروست کراوە، بە خۆمم وت، 'کێ دەڵێت من ئێستا دەست لەو بەردە نادەم، کە ڕۆمیلۆس لە بیستویەکی چواری ساڵی ٧٥٣ی پێش زاییندا، لەم جێگەیە بە دەستی خۆی بۆ بنیادنانی ڕۆما دای ناوە؟!'

هاتبوومه سەر چۆک و سەرنجی یەک بە یەکی ئەو خشتە سواوە لەیەک نەچووانەم دەدا، کە شەقام و شۆستەکانیان پێک هێنابوو.
بە چواردەورمدا هەراوزەنای ڕۆمای ئێستام دەبیست، لە خەیاڵمدا دەمویست وێنەی ئەوسای ڕۆما بخولقێنم، زیندوو کردنەوەی وێنەی ئەوسای ڕۆمیلۆس، کە لەم جێگەیەدا سەرگەرمی دروستکردنی ئەم ڕۆمایەی ئێستا بووە. هەستەکانم لەناو کپی و خامۆشیی خۆمدا ڕاگرتن و سەرنجم خستەسەر بەرپێیەکانم، گوێم لێ بوو دەنگەکان وردە وردە دەگۆڕان و ڕەنگەکانی چواردەورم، تا دەهات، کاڵ دەبوونەوە، چەندین دەستە سەرباز لە پێشچاومدا گوزەریان کرد، دەنگی پێڵاوە بزمارڕێژکراوەکانی پێیان، بۆخۆیان کۆدێک بوون، کە نەمدەزانی ئاخۆ چ بانگێکیان دەدا بە گوێی خەڵکی ئەوسای ڕۆمادا، بۆنی تێکەڵاو بوونی ئارەق و خوێنی ئەو کۆیلانەم دەکرد، کە بۆ دروستکردنی کۆشکەکانی ڕۆمیلۆس، گابەردەکانیان کێش دەکرد، لە خشتی سەر شەقامەکان و گابەردی پایە و دیوارەکانەوە، لەلایەن ڕۆحی ئەو کارگەرانەوە، چەندین جار بانگ کرام، پێدەچوو لەژێر ڕەقیی زۆرداریدا، ڕۆحی خۆیان لەناو بەردەکاندا شاردبێتەوە، دەیان وت، 'ڕۆما بە هێزی شان و باڵی ئێمە دروست کراوە.'
چەند کارگەرێک لە فرسەت دەگەڕان هەتا هەڵبێن، زۆربەیان دیار بوو هەواڵی هاتنی سپارتاکۆسیان بیستبوو، هەر بۆیە پاڵیان لێ دابووەوە و بووبوونە کۆیلەی چاوەڕوانی. هەزاران سەرباز لە ڕەقیی بەردەکاندا تواببوونەوە و دوور لە زێد و ئازیزانیان، لەپێناوی ڕۆمیلۆس و ڕۆمادا گیانی خۆیان بەخشیبوو. دیمەنی سەردەمێکم بینی، بەردەوام مرۆڤ لەگەڵ وەیشوومەی ژیاندا لە

کێبەرکێدا بوو، بە تێڕامانێکی غەمگینەوە لە کاتێکم دەڕوانی، کە مرۆڤ بۆخۆی هێشتا گیاندارێکی قسەکەر بوو، لە یەک ساتەوەختی کورتدا، هەزاران دیمەنی ئەوسای ڕۆمام بینی، لەو ماوە کورتەدا، ڕۆحم خێرا نوقمی بۆنی خوێن و زوڵم بوو، شین و واوەیلا و زریکەی ڕۆحی مرۆڤی ئەو سەردەمە، لە خەیاڵەکانم بێزاریان کردم، بێزار و دڵشکاو، خێرا خۆم گەیاندەوە ئوتێلەکە بۆ لای کارمن.

دوایین ڕۆژمان لە ڕۆما، لەگەڵ کارمن چووین بۆ ئەکادیمیای هونەری، *فیا دی ڕیپیتا*، بۆ بینینی کاری هونەریی سەردەمی ڕێنیسانس، لەو دەمەدا لەوێ نمایش کرابوون، وەکوو تر، هەموو ئەو تابلۆ و سکێچ و پەیکەرانەی لەوێ دەبینران، کاری ئەو قوتابییانە بوون، کە لە ساڵانی ڕابردوودا لەو ئەکادیمیایە خوێندبوویان، سەرجەم ئەو کارە هونەرییانەی لەو ئەکادیمیایە چاوم پێیان کەوت، هیچ ئاسەوارێکیان لەلا بەجێ نەهێشتم، تاکوو لێرەدا باسیان لێوە بکەم، من و کارمن زیاتر چاومان لەسەر خودی کوڕ و کچە هونەرمەندە لاوەکان بوو، وەی لە کارەکانیان، کە زۆرینەیان دەستی جوانکاریی سروشتیان پێوە دیار بوو.

لە ژوورەکەی خۆمدا، لە دوای مێزەکەمەوە دانیشتم، لە دەفتەری یادەوەرییەکانمدا، چەند دێڕێکم تۆمار کرد، لەگەڵ نووسینەکاندا، چەند سکێچێکم کێشا.

نازانم چەندێک بوو دەنگی موزیک نەدەهات و ماڵەکە بێدەنگ بووبوو، لە دەفتەری یادەوەرییەکانمدا، هێڵی سکێچێکم تۆخ دەکردەوە، لە ژوورەکەی دایکمەوە گوێم لە ورتەورت و نەرمە قاقای دایکم و کارڵ بوو، کە لەگەڵ دەنگی چەرپاکەی دایکمدا

تێکەڵ بەیەک دەبوون. دەنگێک لەسەر دیوارەکانی بیرەوەریم هەڵکەنرابوو.

زیاتر نەمدەتوانی لە ژوورەکەی خۆم دابنیشم و گوێبیستی هاتوهاواری دایکم و کاڕڵ بم. تا دەهات، هەناسەم تەنگتر دەبوو، لەشم ئارەقێکی ساردی کردبوو، هەستم دەکرد پێویستم بە هەڵمژینی هەوایەکی پاکە، زۆری پێ نەچوو، بە چەند هەنگاوێک و خێرا خۆم گەیاندە دەرەوەی ماڵەکەمان.

دوای زیاتر لە کاتژمێرێک گەڕان بەسەر ئەو کەناڵە درێژەی ئەمبەر و ئەوبەری دوو ڕاستە شەقامی تەسک بوون، بەدرێژایی کەناڵەکە بەلەمی کابینەدار بوون و زۆربەیان هێشتا گڵۆپەکانیان دەگڕان، هەموویان لە ڕووی ئاوی کەناڵەکەدا وێنەیان دووبارە دەبووەوە. جارجار ئۆتومبیلێک بە دەنگ و شەوقی لایتەکانی، ئاراستەی بینینمیان دەگۆڕی و لە خەیاڵمیان دادەبڕیم.

بەبیرم دێت، ئەو شەوە زیاتر لە کیلۆمەترێک قووتوویەکی بیرەی بەتاڵم بە شەق دابووە بەر خۆم، هەستم دەکرد لەگەڵ هەموو دەنگ و تەپاوتلێکیدا، تەواوی سەرنجی ڕادەکێشام، ئەو منی وەکوو خۆی، تاوێک لە جەنجاڵی بەتاڵ دەکردەوە، چەندین جار لە تاریکییەوە بازم دەدایە ناو بازنەی ڕووناکیی ژێر دارگڵۆپەکان و ڕام دەچڵەکاندن، بۆ تاوێک بێدەنگی و سێبەری خۆمم دەهاویشتە ژێر ڕووناکییانەوە.

کەوتمە ژێر کۆمەڵێک دار، کە پەلی دارەکان ئەوەندە بەسەر شۆستەکەدا شۆڕ بووبوونەوە، پەل و گەڵاکانیان تاوتاو پەنجەیان لەناو قژم دەنا، نزمیی دارەکان، کە ڕووناکیی دارگڵۆپەکانیان لەناو هەناوی خۆیاندا قووت دابوو، کارێکیان کردبوو، کە پیادەڕەوێکی

وەکوو من، بەرپێی خۆی ئاسان نەبینێ.
لە دەستی ڕاستمەوە کۆمەڵێک دار بوون، کە بۆ بەردەمی قاوەخانەیەک ڕێبەرییان دەکردیت. سەرنجیان ڕاکێشام، دارەکان بەڕیز لەسەر شۆستەی شەقامە خشتڕێژکراوەکە بەرز بووبوونەوە، هەموو قەد و پەلی دارەکان، بە گڵۆپی وردی ڕەنگاوڕەنگ ڕازابوونەوە، لە قاوەخانەکەوە دەنگی موزیک بەرگوێم دەکەوت، ئەو دیمەنانە لە هەرجێیەک بن، زۆر سەرنجم ڕادەکێشن و بەگومان نیم لە سەردانکردنیان، ئەگەر تەنها بۆ چاوگێرانێکیش بێت. هەر بۆیە تاکوو نێو دەرگای قاوەخانەکە، شۆستە کێشراوەکەم گرتە بەر، دەرگاکە لەسەر پشت بوو، چەند هەنگاوێک چوومە ناو قاوەخانەکەوە، هەوڵم دا لە قەراغی بارەکە نزیک ببمەوە، بەڵام جێگە نەبوو، لەپشتی بارەکەوە کچێکی باڵابەرز، هێندەی لە منەوە دیار بوو، قژ زەرد، سپی پێست، چاو شین، پارچەیەک قوماشی تەنکی سووری بەسەر گۆی مەمکە قنجەکانیدا دابوو، لەپشتیەوە توند بە تاڵێک پەت بەستبووی، شان و مل و ورگە ڕووتەکەی، وەکوو ئاوێنەیەکی بێگەرد دووبارە گڵۆپەکانی تێدا دەگڕانەوە. تاوێک سەرنجی ئەو دیمەنەم دا، هاوشێوەی نمایشی ئەکتەرێک، کە چۆن بە جوڵەی لەشی، بینەرانی خۆی بێدەنگ و سەرسام دەکات، تەماشاکەرانی ئەو کیژە مەیخانەچییە، هەموو پیاوی پشتپان و سەرتاشراو بوون، بە هەموویان دەوری بارەکەیان تەنیبوو، بەدەوری ئەو هەموو جوانی و چێژەدا سنوورێکیان دروست کردبوو. هەوڵی شکاندنی ئەو سنوورەم نەدا، هەرچەندە لەو قاوەخانە و بارە لاچەپانەدا، شەوانە خواردنەوەی بیرەیەکم بە پێویست دەزانی بۆ وزەپێدانم و زیاتر

بەردەوامبوونم لە گەڕان. ئەو شەوە، داوای هیچم نەکرد و ڕووم وەر گێڕا و چوومە دەرەوە.

هەر ئەو شەوە، لە گەڕانەکەمدا، بیرم لە دایکم کردەوە، کە چۆن ئەو، بەدرێژایی تەمەنی من بێوچان بەدوای خۆشەویستێکدا دەگەڕا، پیاوێک؛ کە دڵی ئەو قبوڵی بکات و بۆ هەرگیز ئەو بەختەوەر بکات، دایکم هەردەم خەمی گەورەی من بوو.

کاتژمێری مۆبایلەکەم کاتژمێر چواری شەوی نیشان دەدا، هەرچەندە ئەوە بۆ جاری یەکەمم نەبوو تاکوو ئەو درەنگانی شەوە بەتەنیا یان لەگەڵ هاوڕێکانمدا لەسەر شەقامەکان بمێنمەوە، بەتایبەتی ئەو هاوڕێیانەم، کە ئامادە بوون گوێ لە چیرۆکەکانم بگرن و سەری بۆ ڕابوەشێنن.

یەکێک لەو هاوڕێیانەم، سمکۆ فەرهاد بوو، بەڕێکەوت لە یەکێک لەو شەوانەدا بوو بە هاوڕێم، سمکۆ یەکێک بوو لەو گەنجە غەریبانەی شاری ئەمستردام، پێکەوە بەردەوام لە مۆدێلی کۆڵانێک دەگەڕاین، کە لە بیرەوەریی ئەودا تۆمار بوو، وێنەی کۆڵانێک؛ کە لەسەر دیوارەکانی ڕۆحی ئەو هەڵکەندرابوو.

وەک سمکۆ خۆی دەی وت، 'من لە کۆڵانێکی قیرتاونەکراو، بێشۆستە، بێدار، بێدارگڵۆپ و پڕ لە چاڵوچۆڵ دەگەڕێم. کۆڵانێک، ماڵەکان بە دیواری بەرز چواردەوریان گیرابێت و پەنجەرەکانیان بچووک و پەردەکانیان ئەستوور بن، کۆڵانێک، هەموو ڕۆژێک چەند جارێک چلوورەفرۆشێک لێوەی تێپەڕێ و ژنان بەکۆمەڵ لەبەر دەرگای ماڵەکاندا دانیشتبن، کۆڵانێک، هەمیشە بۆنی غاز و نەوتی لێ بێت، کۆڵانێک، بۆنی یادەوەرییەکانی سەردەمی منداڵیمی لێ بێت.'

من ئەوسا پێم وا بوو، هاوشێوەی ئەو کۆڵانەی ئەو باسی لێوە دەکرد، پێدەچێت تەنها لە خەیاڵی سمکۆدا بوونی هەبووبێت.

کاتێک نزیکی ماڵی خۆمان بوومەوە، ویستم سەردانی سەوسەن بکەم، ئەو دوو کۆڵان لەولای ماڵی خۆمانەوە بەتەنیا دەژیا، لە تەمەنی شازدە ساڵیمەوە، پەیوەندیم لەگەڵیدا هەبوو، کاتێک ئەو لە قوتابخانەی ناوەندی مامۆستام بوو، بووین بە هاوڕێ و هاودەنگی یەکتری، جاری یەکەمم بوو لەگەڵ ئافرەتێکدا بچمە ناو جێگەوە، باش بەبیرم دێت، بەدرێژایی ئەو ڕۆژە لەلای مامەوە و نەیهێشت بڕۆم. لە کاتێکدا هەست بە تەنیایی و بێزاری بکەم، تاوێک لەلای ئەو پشوو دەدەم و لە باوەشی گەرمیدا تێر دەنووم، هەرچەندە سەوسەن پازدە ساڵێک لە من گەورەترە، بەڵام ئەو جیاوازیی تەمەنە نەبووەتە کێشەیەک لەنێوانماندا، نە لە تێکئاڵانمان لەنێو جێگەدا و نە وەکوو هاوڕێش. بەڵام ڕووداوەکانی ڕۆژانی ڕابردوو کاریگەریان بەسەر خەیاڵمدا هێنابوو، هێزی ئەوەم تێدا نەبوو، تاکوو بتوانم سەردانی لای سەوسەن بکەم.

دەمویست خێرا بگەمە ماڵەوە و تۆزێک چاوم لێک بنێم، کاتێک گەیشتمەوە ماڵ و چووم لە هۆڵەکە تاوێک بێدەنگ ڕاوەستام، هەموو شتێک خۆی لە بێدەنگیی ماڵەکەدا نوقم کردبوو. لە ژووری دانیشتنەکە، لەسەر قەنەفەکە، خۆم گرمۆڵە کرد، ئەوەندە ماندوو بووم، زوو خەوم لێ کەوت.

لە دەنگی پرخەپرخی خۆم بەخەبەر هاتمەوە، هەموو لەشم ئارەقێکی گەرمی کردبوو، بۆگەنی ئارەقەی لەشم، هەناسەی خۆمیان توند کردبوو، ڕوانیم بەتانییەکی ئەستوورم پێوە بوو، ویستم بچم بۆ ژوورەکەی خۆم و پاشان دوشێک بکەم، کاتێ کە

دەبووایـــە بـــە بـــەردەمی ژوورەکـــەی دایکمـــدا تێپەڕیمایـــە بـــۆ ژوورەکەی خۆم، گوێم لە دایکم و کارڵ بوو قسەیان دەکرد.

چوومـە نـاو دەرگـای ژووری خەوتنەکـەی دایکـم و پـاش چەنـد هەناسەیەک لێڕوانینیان پێم وتن، 'بەیانیتان باش.'

هەردووکیان لە شانی یەکەوە، لەژێر چەرچەفێکەوە، ڕاکشابوون و تەنها سەریان بەدەرەوە بوو. پێکەوە بە کۆرس، 'نیوەڕۆت باش.'

دایکم بـە تەوسێکەوە وتـی، 'ئـەوە دوێنـێ شـەو بۆ لەپڕێکدا دیـار نەمایت، بۆ کوێ چوویت؟'

کـارڵ بـە پێکەنینـەوە وتـی، 'لەسـەر قەنەفەکـە خەوتبوویـت، لـە سەرمادا وا خۆت گرمۆڵە کردبوو، بەتانییەکەی خۆمم پێدا دایت.'

بێدەنگ سەیرێکی هەردووکیانم کرد، بێ ئەوەی هیچ بڵێم، چووم بۆ ژوورەکەی خۆم.

# ٢

# دایکم

ئەو بەیانییە، دیسان بە دەنگی ئەو بەئاگا هاتمەوە، دەنگێک، کە هەموو ڕۆژێک وزەی پێ دەبەخشیم بۆ ڕابوونم و لەماڵدەرچوونم و کارکردنم.

گوێم لێی دەبوو، چەند جارێک لە نهۆمی خوارەوە بانگی کردم، 'مارتن، مارتن.'

خۆم لێ بێدەنگ دەکرد و وەلامم نەدەدایەوە، چاوەڕوان بووم، تەمەنام دەکرد سەرلەنوێ دەست بە گۆرانی چڕین بکاتەوە، لە خەیاڵی خۆمدا وتم، 'دەی، دەی، گۆرانی بچڕە، زۆر تامەزرۆی ئەو دەنگەی تۆم.'

تاوێک بوو خۆم مەلاس دابوو، گوێم لە هەوادا هەڵخستبوون، ئینجا بە هەردوو لەپی دەستم، دوایین توێژاڵی خەوم لەسەر پێڵوی چاوم لا دا، بینیم چۆن دەزوولەی خۆرێکی نەرم لە کونی وردی پەردە تەنکەکانەوە بەکۆمەڵ ڕووی ناسکی پەردەکەیان سمیبوون و بەسەر دیواری ژوورەکەمدا بڵاو بووبوونەوە، بێ

پرسی من، ڕەنگی خۆیان وەژوور خستبوو. وەکوو ئەوەی ڕەنگێکی زەردی کاڵت بەسەر دیوارەکاندا پرژاندبێت. دایکم خۆی کرد بە ژووردا و کوپێک قاوەی بە دەستەوە بوو، هات لەتەنیشت جێگەکەمەوە ڕاوەستا، بە پێکەنینەوە، 'بەیانیت باش.'
بێجگە لە بۆنی قاوە گەرمەکە، بۆنی ئەو عەترەم کرد، کە هەستی بۆنکردنم دەمێک بوو غەریب کەوتبوو پێی، بۆنی عەتری شانێل، ئەو بۆنە یاخییەی ڕۆحمی دەگوشی و زیاتر دەیترنجاندمەوە ناو خۆم. عەزییەکی تەسکی ڕەشی تا سەر ئەژنۆی لەبەردا بوو، قژە قاوەییە تۆخەکەی بەسەر شانیدا بەر دابۆوە.
کوپەکەی لەسەر کۆمیدیی تەنیشت جێگەکەمەوە دانا، هێشتا هەڵمی گەرمی لێ هەڵدەستا، لێی ڕوانیم و وتی، 'گوێت لێم نەبوو، بانگم کردیت؟'
لەو دەمەدا کە هێشتا من بە بالایدا هەڵم دەڕوانی، سەرم بە نا بۆ ڕاوەشاند.
'چۆنم بەلاتەوە؟'
هەردوو دەستی بڵاو کردەوە و بازێکی دایە سەر جێگەکەم، بە خۆبادان نمایشی خۆی دەکرد و دووبارە پرسی، 'جوانم، بەلاتەوە؟'
چەند جارێک نووکی پێیەکانی لە ڕانم کوتان، دیسان بەردەوام بوو، وتی، 'چییە، ئەوەندە سەرسام بوویت پێم، دەمت گۆ ناکات هیچم پێ بڵێیت؟'
بێدەنگ لێم دەڕوانی و لە خەیاڵی خۆمدا وتم، 'دەبێت ئەم هەموو وزەیەی لەکوێوە هێنابێت، دوێنێ بێزار و کەنەفت، کە حەوسەڵەی قسەکردنیشی نەبوو، کەچی ئەمڕۆ...'

'هەستە، وەرە لەگەڵم.'
دەستی بۆ درێژ کردم و بە خەندەیەکەوە لە لێی ڕوانیم، کوپی قاوەکەمم لەگەڵ خۆم هەڵگرت و ناچار دوای کەوتم بۆ نهۆمی خوارەوە، لەسەر پلیکانەکان پێم وت، 'ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە؟'
بێ ئەوەی ئاوڕم لێ بداتەوە، پێی وتم، 'بۆ من ڕۆژێکی زۆر تایبەتە.'
'تەنها بۆ تۆ؟'
'ئازیز، من و تۆ، لە خۆشی و ناخۆشیی یەکدا بەشدارین!'
گەیشتینە هۆڵەکە و کوپەکەی لە دەستم وەر گرت و لەسەر مێزی تەلەڤزیۆنەکە دای نا، هەردوو دەستی گرتم و دەستی کرد بە سەماکردن، بەردەوام لەگەڵ خۆیدا بای دەدام، پێکەوە لەسەر نووکی پێ، بەدەوری یەکتردا دەخولاینەوە، لەبەر خۆیەوە، 'زۆر ئەوە نییە؟'
'زۆر چی نییە؟'
'مەبەستم...!'
کاریگەریی ئەو گومان و دوودڵییەی بە ڕوویەوە دیار بوو، بوارم پێ نەدا بیر بکاتەوە، پاش ئەوەی لە خۆبادان وەستاندم، بەقووڵی لە چاویم ڕوانی و پێم وت، 'ئەگەر تۆ پێم بڵێیت کوێت دێشێت، ئەوکات...'
'ئەوکات چی...؟'
بە شڵەژاوییەکەوە هاواری کرد بە سەرمدا و دیسان وتی، 'مەبەستم، سەرنجڕاکێشم؟'
لە بەردەممدا جارێک خۆی بادا، بە زەردەخەنەیەکەوە وتی، 'عەزییەکەمت بەدڵە، ئەی پێڵاوەکانم، مەبەستم ئەوەیە، لەگەڵ

ڕەنگی عەزییەکەمدا دەگونجێن؟'
چاوی دەبریقایەوە، لە ڕوخساریدا گەنجێتیم تێدا دەبینییەوە، لچ و لێوی وشک و ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا بوو.
'خواردنم ئامادە کردبوو، لەوە دەچێت ساردیش بووبێتەوە.'
لەسەر قەراغی قەنەفەکە دانیشتبووم، جارجار قومم لە قاوەکە دەدا، تامی تاڵی قاوەکە، دواڕەگی خەوی لە چاومدا ڕەواندەوە، ئەو وەکوو شتێکی بیر کەوتبێتەوە، بەخێرایی هۆڵەکەی بەجێ هێشت و بە پلیکانەکاندا بەپەلە چوو بۆ نهۆمی سەرەوە، گوێم لە تەقوهوڕ بوو، دیار بوو بەهەڵەداوان لە شتێک دەگەڕا.
پاش گەڕانەوەی، بینیم چەندین سیدێی بە دەستەوە بوو، لەپێش ڕیکۆردەکەدا هەڵوێستەی کرد، یەک یەک تاقیی دەکردنەوە، لەسەر یەکێک لە گۆرانییەکان وەستا، بەباشی لەبیرم نەماوە چ گۆرانییەک بوو، هەستا و دیسان دەستی گرتم و توند بۆ لای خۆی ڕایکێشام و نووساندمی بە خۆیەوە، ئینجا لەگەڵ ڕیتمی موزیکەکەدا، لەگەڵ خۆیدا بای دەدام، تاوێک بە ڕاست و چەپماندا هەنگاومان دەنان و سەمامان دەکرد.
لە کاتێکدا ئەو لە قووڵایی چاومی دەڕوانی، وتی، 'ڕای خۆتت هەر پێ نە وتم!'
'بەگومان مەبە لە خۆت.'
هەستم پێ کرد و بە ڕەنگیشیەوە دیار بوو، دەمزانی چەندە پێویستی بە من بوو، تا ڕای خۆمی پێ بڵێم، هەردوو ڕوومەتی سوور بووبوونەوە و خوێنیان تێ زابوو، بەهێواشی چاوی لێک نا و سەری نا بەسنگمەوە. پاشان لەژێر لێوەوە، 'بەگومانم لە تەمەنم!'

'هیچ گومانت لە خۆت نەبێت، سروشت هەموو شتێکی پێ داویت، ڕەنگبێ خۆت هەستیان پێ نەکەیت.'
هێشتا سەری لەسەر سنگم هەڵنەبڕیبوو، بێدەنگ باوەشمان بەیەکدا کردبوو و خۆمان لەگەڵ ڕیتمی تۆنی مۆسیقاکەدا دەلەنگاند، هەستم بە ماندوویێتیی ئەژنۆم دەکرد، چەند جارێک داوام لێ کرد، کە دابنیشین و پشوویەک بدەین، پاش ئەوەی بەدەم سەماکردنەوە هەموو هۆڵەکەی پێ گێرام، ماندوو، هەردوو لەتەنیشتی یەکەوە، لەسەر قەراغی قەنەفەکە دانیشتین، لەشم گەرم داهاتبوو، توند باڵەکانی لە ملمەوە ئاڵاند، وەکوو شەرم لە دەنگی خۆی بکات، هێواش بە گوێچکەمیدا چپاند، 'خۆ بەلاتەوە گران نییە؟'
'چی؟!'
'هاوڕێیەکی تازەم گرتووە.'
'بە خۆشی بێت!'
یەکەمین جارم بوو، ئاوا دەسەوسان ببینم، شێوازی هیچ نە گۆڕابوو، ئەوەندە نەبێت، تۆزێک بەرچاوی ئاوسابوو، هەوڵی دابوو بە بۆدرە بیانشارێتەوە، بەڵام ئاسەواریان هەر دیار بوو، ئەو هەردەم لە پێشچاوم دا جوانترین مرۆڤ بوو.
دایکم لەو ساڵانەی دواییدا، لە خۆی زۆر بەگومان بوو، تەنانەت لە کارکردنیشدا، لە توانای خۆی دڵنیا نەبوو، ڕۆژانە دەیان کەنفاسی ڕەنگ دەکرد و پاشان بە توڕەییەوە لەژێر پێی دەنان و تێکی دەشکاندن، یان بەکۆمەڵ لە حەوشەکەدا ئاگری تێ بەر دەدان.
باش بەبیرم دێت، زۆرینەی کات ئەوەندە بێزار دیار بوو، ماڵی بەجێ دەهێشت و چەندین کاتژمێر ون دەبوو، پاشان بەدەم

پێکەنین و گۆرانی چڕینەوە، بەمەستی دەگەڕایەوە، دیسان بێدەنگیی ناوماڵەکەی دەشکاند، سەرلەنوێ دەستی دەکردەوە بە نیگارکێشان. لەو کاتانەدا ئیشی من تەنها ئەوە بوو، کە بە شانامە بەبالآیدا هەڵبدەم، لە خۆم ببوورم و هێز بدەمە بەر ئەو، تاوەکوو بتوانێت بەردەوام بێت لە ژیان و تێک نەشکێت، هەندێک جار چەند ڕۆژێک، یان بە حەفتە، دەڕۆیشت و خۆی لێ ون دەکردم، بەردەوام وا هەستم کردووە، دایکانی هەموو دونیا وان و هیچ دایکێکیش نییە لە دایکی من جوانتر و باشتر بێت.

باش بەبیرم دێت، وا دەزانم ئێستایە، دە ساڵێک لەمەوبەر، بەیانییەکیان زوو، منی لە خەو هەستاند، بە ڕوویەکی خۆشەوە پێی وتم، 'هەستە مارتن، تۆ قاوەیەک دروست بکە، هەر ئێستا دەچم نانی گەرم و پەنیری تازە لە بازاڕ دەکڕم.'
خێرا لەخەو ڕابووم و مێزی نانخواردنەکەم ڕازاندەوە، دانیشتبووم. دوای چەند کاتژمێرێک چاوەڕوانیم، بە پاسکیل بۆ چەند سەموونخانەیەک و بازاڕێکی نزیک ماڵەکەمان چووم، بەدرێژایی ئەو ڕۆژە چاوەڕوانی بووم، خەمیم بوو، خەیاڵی ناخۆشم دەکرد، لەبەر خۆمەوە بەردەوام دەم وت، 'بۆ دیار نەبوو، ئاخۆ چیی بەسەر هاتبێت؟'
ئەو ڕۆژە، هەتا درەنگانێکی شەو، چاوەڕوانی بووم، بەبیرم دێت، کە لە ژووری میوانەکە، بەتەنیشت تەلەفۆنەکەوە خەوم لێ کەوتبوو.
دوای سێ ڕۆژ، درەنگانێکی شەو، بە زەنگی تەلەفۆنەکە لە خەو ڕابووم، ئەوەندە مەست بوو، باش قسەی بۆ نەدەکرا، دەنگی چەند

کەسانێکی تریش تێکەڵا و بە دەنگی ئەو دەبوو، چەند جارێک لەسەر یەک وتی، 'چەند ڕۆژێکە لە پاریسم و چەند ڕۆژێکی تریش دەمێنمەوە.'

کوتوپڕ دەنگی دایکم گۆڕا بە دەنگی پیاوێک، دیار بوو دایکم مۆبایلەکەی دابووە دەستی ئەو، وتی، 'من جۆنم و لە دەنهاخ دەژیم، حەفتەی داهاتوو دێم بۆ ئەمستردام، تا لە نزیکەوە یەک بناسین.'

بێ ئەوەی هیچ وەڵامێکی بدەمەوە، بەردەوام بوو، وتی، 'مارتن، تۆ باشترین دایکت لە دونیادا هەیە، دەبێت خۆت بە بەختەوەر بزانیت، کە کوڕی ئەو ئافرەتەیت.'

لەم قسانەدا بوو، هێڵەکە بچڕاو دەنگی نەما.

هێشتا تەلەفۆنەکەم بە گوێوە بوو، لەبەر خۆمەوە وتم، 'بێگومان.'

پاش چەند ڕۆژێک، لە نیوەشەودا، لەسەر پلیکانەکان بە دایکم گەیشتم، وەکوو منداڵێک کە لاسارییەکی کردبێت، سەری داخست و بێدەنگ بەتەنیشتمەوە ڕەت بوو، بە پلیکانەکاندا سەر کەوت و چوو بۆ ژوورەکەی خۆی.

هەستم دەکرد لەو دەمەدا پڕ بووم لە تووڕەیی و لە هەمان کاتیشدا، دڵخۆش بووم بە بینینی، نەمدەزانی چی بکەم و چیی پێ بڵێم، حەزم دەکرد باوەشێکی توندی پێدا بکەم و پێی بڵێم، بیرم دەکردیت و دڵم زۆر لات بوو، ئۆخەی گەڕایتەوە، لەو کاتەدا نەمتوانی خۆمی لێ نیگەران بکەم، تەنانەت پرسیاری ئەوەیشم لێ نەکرد، ئاخۆ لەکوێ بووە.

خەمێک دای گرتم و تاوێک لەسەر پلیکانەکان لێی دانیشتم، هێواش قسەم لەگەڵ خۆمدا دەکرد، هەستم بە گەرمیی فرمێسکەکانم کرد،

که بەسەر ڕوومەتەکانمدا تل بوونەوە بۆ سەر ڕووی بیجامەکەم، تێگەیشتم کە دیسان بەدڵشکاوی گەڕاوەتەوە، هەموو جارێک، وەک سەربازێکی زامدار و لە جەنگدا دۆڕاو، ڕۆژێک یان دووانی پێویست بوو بۆ قبوڵکردنی دۆڕانەکەی و ساڕێژبوونی برینەکانی، پاشان سەرلەنوێ، وەک پیشەی هەمیشەیی، دەستی دەکردەوە بە گۆرانی چڕین و ڕەن گرشتن و نیگارکێشان، هەمدیسانەوە ئەو وەکوو پەپوولە بە دونیای مندا دەستی دەکردەوە بە فڕین. منیش چەند ڕۆژێک مەست و بێزاری ڕووداوەکان دەبووم.

# ٣

# غەریب

تـا درەنگـانی شـەو، بـە شـەقام و کۆلانـە تاریـک و چۆڵـەکانی شـاری ئەمسـتردامدا دەگـەڕام، گینگڵم دەدا. دەمەوبـەیانییانیش بـۆ پشوودان، لە قاوەخانـەی گرانت دەگیرسامەوە و لـەوێ گوێم لـەو موزیکژەنە غەریبانە دەگرت، کە بەڕێکەوت ڕێیان کەوتبووە شاری ئەمستردام و وەک کەشتیوانێکی وێڵ لە دەریـادا، لـە بەندەری ئـەو شارە دەگیرسانەوە.
لە مێژووی شەوگەڕیمدا، زۆر کەسم دوانـدووە و نـاسی، بێگومـان ئـەو کەسـانە هـەموو لـە غـەریب و بێدەرەتانـەکانی شـار بـوون، ئەوان، شـەوان ڕۆحیـان دەکردەوە بـە بـەری شـاردا، بـەردەوام بـە شـادەمارەکانیدا دەگـەڕان، شـارێک، کـە غەریبـەکان بـەردەوام تێیدا ون دەبـن، شـارێک، کـە جـادوو لـە غـەریبان دەکـات و هـەموو ئاڕاسـتەکانی هـزر و خـەیاڵیان لـێ ون دەکـات، غەریبـەکانی ئـەم شارە، زۆربەیان هەڵگری چیرۆکی سەرنجڕاکێشن.
شەوگەڕیم، گەڕانم بوو بەدوای خۆمدا، لە نهێنیی ئەفسونی شـەودا

و لـەناو قـوولایی خەیاڵەکانمـدا، لـە کاتێکـدا جەسـتەی بـەتاڵم شۆسـتەی شـەقامە چۆڵـەکانی شـاریان دەپێـوا، چـاوە زیتـەکانم دارگڵـۆپی سـەر شۆسـتەکانیان دەژمـارد، بـەردەوام بـەرەو ڕووی هیوایەک بەڕێوە بووم، ڕۆحـم لـە جەستەم دوور، خـەریکی گەڕان بـوو بـەدوای وەڵامـی ئـەو پرسـیارانەدا، کـە بەشـێکی زۆری خەیاڵمیان داگیر کربوو. یەکێک لە شـەوە گەرمەکانی هـاوین بوو، لە کاتێکدا لـەوەدا بووم کۆتـایی بە پیاسـەی ئەو شـەوەم بهێنم و بـەرەو ماڵـەوە بـڕۆم، پیادەڕەوێـک، کـە تاوێـک بـوو بەبێـدەنگی هاوشانی من ڕێگەی دەبڕی، دڵسـاردانە وتـی، 'دەزانیت شـەوێکی زۆر هیچە!'

بە باڵایدا هەڵم ڕوانی و بێ ئەوەی هیچ بڵێم، سـەرم بۆ ڕاوەشـاند، لاوێکی باڵابـەرزی لـەش و لار ڕێـک، قژێکی ڕەش، گلێنـەی چـاوی قاوەیی، پێستی گـەنم ڕەنـگ، تۆنی دەنگی گڕ بوو. سـاتێک لـەژێر ڕووناکیی دارگڵۆپێکدا هەڵوێستەیەکمان کرد، بـە سـەرنجەوە لێی ڕوانیم و پرسیی، 'بەرەو کوێ؟'

لە وەڵامدا وتم، 'بەرەو، نازانم، بەرەو هیچ!'

دایـە قاقـای پێکـەنین، 'کەواتـە مـن و تـۆ بـەرەو هـەمان وێسـتگە بەڕێوەین؟'

دەستی بۆ درێژ کردم، 'من، سمکۆ فەرهاد.'

بە دوودڵییەکەوە دەستم خستە ناو دەستی و پێم وت، 'من، مـارتن سەلەمۆم.'

پاشان سمکۆ دەنگی هەڵبڕی و بەردەوام بوو، 'من خەڵکی عێراقم!'

بە سەرسووڕمانەوە لێم ڕوانـی و وتـم، 'بەڕاست؟ منیش خـەڵکی هۆڵەندام!'

هەردوو دامانە قاقای پێکەنین. سمکۆ یەکێک بوو لەو کەسانەی لە شەوگەڕیمدا بەڕێکەوت ناسیم و زیاتر لە جارێک دیمەوە، بگرە بووین بە هاوڕێ و هاودەنگی یەکتریش.

ئەو شەو و ڕۆژانەی لەدوای شەوی ناسینی من و سمکۆوە گوزەریان کرد، زۆریان لەیەک دەچوون، سمکۆ بەردەوام دەربارەی کوشتن، گیران، ڕاونان، ڕووخان، هەروەها تۆقانەوە دەدوا.

ئەو ئەمانەی دەوت و منیش بەردەوام سەرم بۆ دەلەقاند. لە یەکێک لەو شەوانەدا، کە زیاتر لە کاتژمێرێک دەبوو، بێدەنگ لە شانی یەکترەوە دەڕۆیشتین، سمکۆ ئەو بێدەنگییەی شکاند و لێی پرسیم، 'دەزانی ئێمە کێین و پێویستە چ ناتۆرەیەک لە خۆمان بنێین؟'

بە سەرسووڕمانێکەوە لێم ڕوانی و پێم وت، 'نەخێر.'

'شەوگەڕەکان، ناتۆرەیەکی گونجاوە، وا نییە؟'

بە سەرسامییەکەوە سەیرێکم کرد و وتم، 'بۆ نا، گونجاوە.'

پاشان لە شوێنی خۆم هەڵوێستەیەکم کرد، بە چواردەوری خۆمدا چاوم گێڕا و بە دەنگی بەرز هاوارم کرد، 'دانیشتووانی شاری ئەمستردام، هەموو گوێتان لێم بێت، ئێمەین شەوگەڕەکانی شار، شەوگەڕەکان، شەوگەڕەکان...'

دوای ئەوەی چەند جارێک بە کۆرس پێکەوە هاوارمان کرد، بێدەنگیمان لەو کۆڵانە بەرتەسکەدا شکاند و هەموو چواردەوری خۆمان پڕ کرد لە دەنگی خۆمان، لە باڵاخانە بەرز و نزمەکانەوە، هەر پەنجەرە بوون و بە ڕەنگی گڵۆپی جیاواز ڕووناک دەبوونەوە، بە ڕاست و چەپماندا دەیان پەنجەرە خرانە سەر

پشت، بە دەنگی گڕ و ناسک، بەرز و نزم، بانگیان لێ دەکردین، 'بێدەنگ بن، هەی ڕیسوابووان!' یەکێکی تر بە تووڕەییەوە، 'بڕۆنەوە ماڵە وێرانەکەی خۆتان و سەرتان بخەنە ناوگەڵی دایکتانەوە ئەگەر هەتانە، ئەگەر نیشتانە، خۆتان بە عەرزدا بدەن و بمرن.'
بەدەم ڕاکردن و قاقالێدانەوە، چەند گەڕەکێکمان بڕی و دوور کەوتینەوە، لەپشتمانەوە دەنگی لورەی ئۆتومبێلی پۆلیسەکان دەهات.

ئەوسا بەگەرمی دەربارەی هونەری شێوەکاری، سەرقاڵی خوێندن و خوێندنەوە بووم، بەتایبەتی مێژووی ئەو هونەرە، هونەری سەدەی شازدە و سەرهەڵدانی شەپۆلی بیرۆکەی *بارۆک* لە ئەوروپا، کە ئەوسا لە مێژووی هونەردا، بە بیرۆکەیەکی گرنگم دەزانی. ئینجا *کلاسیزم* و *نیۆ کلاسیزم* و *ڕۆمانتیک*، تا کۆتایی سەدەی هەژدە و سەرەتای سەدەی نۆزدە و شەپۆلی بیری *ئیمپرشیۆنیزم* و *سریالیزم* و پاشان *کۆبرا* لە هۆڵەندا، کە دایکم یەکێک بوو لە ئەندامانی گروپی داهێنەری کۆبرا، هەروەها هونەری *پۆست مۆدێرنیزم* و هونەری *مۆدێرن*، بێگومان بەردەوام چاوێکیشم لەسەر هونەری ئێستا بوو، لە زانکۆ، مێژووی هونەرم خوێندبوو، لە مۆزەخانەی نیشتمانیی ئەمستردام کارمەند بووم.
سمکۆ چێژی لەو باسانە نەدەبینی و دیار بوو زۆر پێیان بێزار بوو، ئەو لە عێراق، هەتا چواری ئامادەیی خوێندبوو، بۆ بەردەوامبوونی لە خوێندن، جەنگ لە بەردەمیدا ڕێگر بوو، لە هەموو بوارێکدا زانیاریی هەبوو، لە هەمان کاتیشدا، لە هیچ

بواریکیشدا بەتەواوی قاڵ نەبوو، حەوسەڵەی خوێندنەوەی کتێبی نەبوو، ڕۆحی بەردەوام بە ڕووداوەکانی ڕابردوویەوە لکابوو، بە جۆرێک بەرپێی ئێستای خۆی نەدەبینی.

ئەوسا سمکۆ فەرهاد بەردەوام لە هاوڕێیەکی دەگەڕا، سامان خدر، چەند مانگێک بوو لە شاری ئەمستردام بێسەروشوێن بوو.

ئەوسا سمکۆ خۆی وای بۆ گێڕامەوە، "سامان کوڕێکی تەمەن بیست و هەشت ساڵ و دوو ساڵێک بوو لە هۆڵەندا دەژیا، لە عێراق و لە شاری کەرکوک، باوکم لەگەڵ باوکی ساماندا هاوڕێ و هاوبیر بوو، باوکمان پازدە ساڵێک پێش ئێستا، لە یەک ڕۆژدا، لەلایەن ڕژێمی ئەوسای عێراقەوە گیران و بێسەر و شوێن کران، بە چ تۆمەتێک تاوانبار کرابوون، باوەڕ بکە، تا ئەمڕۆیش کەس نازانێت، من و سامانیش هەر لەسەر ئەو ئەساسە بووینە هاوڕێ و برا.
کاتێک سامان هات بۆ هۆڵەندا، من دە ساڵێک دەبوو لە هۆڵەندا بووم. سامان دوای ساڵێک ژیان لە کەمپی پەنابەران، بە خۆی و کۆڵەپشتێکەوە هات بۆ ئەمستردام، تاوەکو لای من ژیان بەسەر بەرێت، ئەویش لە کاتێکدا بوو، سامان لە کەمپەکەی تەواو بێزار بووبوو، باری دەروونیی تەواو تێک چووبوو، سامان هات و ساڵێک زیاتر لای من ژیا، پیشەی تەنها خۆراک و خەو و نیگارکێشان بوو، هەرگیز لە ماڵ دەر نەدەچوو، بێجگە لەوەی حەفتەی جارێک، دەچوو بۆ کەمپەکەی بۆ ئیمزاکردن و وەرگرتنی خەرجی، کە ئەویش ڕێکەوتی ڕۆژی پێنج شەممانی دەکرد،

ئەویش دەبوایە من بچوومایە لەگەڵی، لە کەمپەکەی، هەفتانە سێ ئیرۆی وەر دەگرت، باوەڕ بکە، بەس بەشی جگەرەکەی دەکرد و ڕۆژی زیاد لە پاکەتێکی دەکێشا. وەکوو تر، هەموو خەرجییەکی لەسەر گیرفانی من بوو.

دەزانی مارتن، چەند مانگێک پێش ناسینی تۆ، سامان بەبێ ماڵئاوایی بەجێی هێشتم، تەنانەت کورتەنامەیەکیش چییە، لەپاش خۆی بەجێی نەهێشت و بێدەنگ لە ماڵ دەر چوو، هەتا ئێستایش، نازانم لەکوێیە و چیی لێ بەسەر هاتووە، تەنانەت تەلەفۆنێکیش چییە، بۆی نەکردم.

ڕاستییەکەی ئاوا بوو، کاتێک لە کار گەڕامەوە، کاتژمێر چواری پاش نیوەڕۆ بوو، ئەوسا لە چێشتخانەیەک کارم دەکرد، سڵاوم لێ کرد و چوومە حەمام خۆم بشۆم، پاش خۆشتنم، خاولییەکم لە ناوقەدم ئاڵاند و هاتمەوە ژووری دانیشتنەکە، جگەرەکەی سامان، هێشتا لەسەر لێوی تەپڵەکەکە دووکەڵی لێ هەڵدەستا، بەڵام سامان خۆی دیار نەبوو، پاش ئەوەی تەواوی ماڵەکە گەڕام، باوەڕ بکە، ئەو هیچی لەگەڵ خۆی نەبردبوو، نە کەرەستەی وێنەکێشان، نە جزدانی بەر گیرفان، تەنانەت جل و کۆڵەپشتەکەی، هەمووی لە ژووری خەوتنەکەی بوو، کەرەستەی نیگارکێشان و زیاتر لە سەد تابلۆ، باوەڕ بکە، تا ئەمڕۆیش هیچ شتێکی ئەوم لە ماڵەکەمدا لە جێگەی خۆیان نەبزواندوون."

کاتێک سەردانی ماڵی سمکۆم کرد و تابلۆکانی سامانم بینی، بە سمکۆم وت، 'پێدەچێت سامان بەڕووتی خۆی لەناو سروشتی ئەم تابلۆیانەی هاویشتبێت و بۆ نیشتمانی باوکی گەڕابێتەوە، بێگومان

ڕۆژێک دێت، ئەو غەریبیی تۆ و ئەم ماڵە و ئەمستردام دەکات و دەگەڕێتەوە.'

کارەکانی سامان، ئاوێنەی سروشت و ڕووداوەکانی کوردستان بوو، سمکۆ بە مەبەستی بڵاوکردنەوەیان لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا، دەربارەی سامان و کارەکانی کورتەباسێکی بە زمانی هۆڵەندی نووسیبوو، تا لەو ڕێگەیەوە سەرنجی خەڵکی ڕابکێشێت و بتوانێت تابلۆکانی سامان بفرۆشێت، بەڵام هیچکام لەو گۆڤار و ڕۆژنامانە وەڵامی ئەویان نەدابووەوە، کاتێک نووسینەکەیم خوێندەوە، وام بە سمکۆ وت، 'نووسینەکەت لە ئاستی توانای هونەریی کارەکانی ساماندا نییە، ناوەڕۆکی نووسینەکەت، لە وەفا و سۆزتەوە بۆ سامان و نیشتمانەکەت سەرچاوەی گرتووە.'

ئەوسا سمکۆ داوای لێ کردم، لە فرۆشتنی تابلۆکانی ساماندا هاوکاریی بکەم، لەگەڵی چووم بۆ چەند گەلەرییەک، کاتێک نموونەی کارەکانی سامانمان پیشانی خاوەن گەلەرییەکان دەدا، دەستبەجێ دەشڵەژان و خێرا و بەپەلەپرووزێ لە گەلەرییەکانیان دەریان دەکردین.

ئەوسا من چەند تابلۆیەکی سامانم برد و پیشانی دایکمم دان، بە پێچەوانەوە، دایکم زۆر پێیان سەرسام بوو، لەگەڵ دایکم پێکەوە دەربارەی کارەکانی سامان دەدوایین، هەوڵمان دەدا هەموو دیمەنێک بەجیا وەر بگرین و لە ڕێگەی ڕەنگ و هێڵکاری و فۆرمەکانەوە، لە مەبەستی خوڵقاندنی هەر کارێکی سامان تێبگەین، تابلۆ و سکێچەکانی سامان خدر، هەریەکەیان نمایشی کۆمەڵێک ڕووداویان دەکرد، هەر کارێکی، چیرۆکێکی تایبەت بە خۆی

دەویست، دەیان پۆرتریتی ڕوخسارشێوێندراو و دیمەنی گوند و شار و شارۆچکە و سروشتی بە سووتماک کراو، لەنێوان ڕەنگە ئاکریل و ڕەنگی ڕۆنییە هەرزانبەها وشکەوەبووەکاندا، بۆدڕن و دووکەڵێکی خنکێنەریان لێ هەڵدەستا، لەگەڵ دایکمدا، زۆر هەوڵمان دا ڕووداوەکان بکەین بە بەشێک لە خەیاڵی خۆمان و بە خەیاڵ تێکەڵیان ببین و لە کارەکانیدا هەست بە خەیاڵی سامان خۆی بکەین، بەڵام من و دایکم، هەرگیز ئەو پەیوەندییە ڕۆحییەمان لەگەڵ هیچ کارێکی سامان خدردا بۆ پێک نەهات.

کارەکانی سامان، ناکرێ پێیان بڵێین جوانن، لە ڕاستدا جوان نین و لە کاتی لێ ڕوانینیاندا، خێرا پەی بە هەستی مرۆڤ دەبەن و دەیشڵەژێنن، سەرجەمیان خۆ لە چەمکێکی پەیکەرسازییانە نزیک دەکەنەوە، بێگومان تابلۆکانی سامان خدر ئاوێنەیەکی ئەبستراکتن، سەرجەم دیمەنی مێژووی ژیانی میلەتێکیان لە خۆیاندا هەڵگرتووە. ئەو تابلۆیانە بۆ سمکۆ، نەک تەنها زیاتر غریبیی ئەوی بۆ سامان دەورووژاند، بەڵکوو سەرلەنوێ بەرکەوتنەوەی ڕۆحی سمکۆ بوو بە ڕووداوەکانی نیشتمانی باوکی.

٤

# خوانی شێرپەنجە

دوو ڕۆژێـک بەســەر ڕۆژی لـەدایکبوونی دایکمـدا تێپــەڕیبوو، بەیانییەکی خۆرەتاو، خۆم بە ژوورەکەی دایکمدا کرد، تاکوو پێی بڵێم بۆ حەفتەیەک بۆ وڵاتی میسر دەچم، پێش ئەوەی بگەمە ناو ژووری خەوتنەکەی لەناو داڵانەکەوە، بانگم لێ کرد، 'دایە، دایە، بۆ حەفتەیەک دەچم بۆ میسر.'

کــاتێ گەیشـــتمە نــاو ژوورەکــەی و لەتەنیشــت جێگەکەیــەوە ڕاوەستام، لێی ڕوانیم و هیچی تری نە وت، منیش بەردەوام بووم و پێم وت، 'مۆزەخانەی مێژوویی ئەمستردام لە پەیوەندیی لەگەڵ مۆزەخانـەی نەتـەوەیی میسـر لـە قـاهیرە، بـە مەبەسـتی زانیـاری گۆڕینـەوە لـە کاروبـاری مۆزەخانـەدا، کارمەنـدێکی ئـەوان ئـەم حەفتەیـە دەگاتـە ئەمستردام، بانگهێشـتەکە تـەنها بۆ یـەک کەسـە، خۆت دەزانیت کـە چەنـدە خـەونی منـە جارێـک بچـم بـۆ میسـر، دەزانی دایکە، بەڕێوەبـەری مۆزەخانـە، هێنری پراخ، لـەناو هـەموو

هاوكارانمدا پێی وتم، "مارتن، تۆ حەفتەیەک دەچیت بۆ میسر و دەبیتە نوێنەری مۆزەخانەکەمان، بۆ ئەم مەبەستە، من تۆ زۆر بە لێهاتوو دەزانم و دڵنیایشم لە تواناکانی تۆ." پێت چۆنە؟'

بە سەرنجەوە سەیرێکی کردم و وتی، 'سەفەرەکەت کەیە؟'

'حەفتەی داهاتوو، ڕۆژی دەی ئەم مانگە، یانی من لە نزیکەوە ئەهرامەکان دەبینم، کەلوپەل و پەیکەرەکانی فیرعەونەکان، دایکە دەزانیت، ئەو سەفەرە بۆ من چەند گرنگە!'

لە ناکاو ڕووی لێ وەر گێرام و بێدەنگ لە دیوارەکەی تەنیشتی دەڕوانی، لێم پرسی، 'چییە، بۆ وا بێدەنگ بوویت؟'

چەند جارێک بانگم کرد، بەڵام هیچ وەڵامێکی نەدامەوە، چووم لەسەر جێگەکەی، لەلایەوە دانیشتم و باڵێکم لەسەر شانیەوە برد و لە ملیەوە ئاڵاندم، ڕوویم وەر گێڕا بەلای خۆمدا و سەرم دانەواند، تاکوو بتوانم لە چاوی بڕوانم، بینیم چاوی تەڕ بوو، لەوەدا بوون فرمێسکیان لێ بڕژێت، لێم پرسی، 'ئەوە چییە؟ هیچ شتێک ڕووی داوە، کە من ئاگاداری نەبم؟ گوێت لێم بوو چیم وت، یان بۆت دووبارە بکەمەوە؟'

'گوێم لێت بوو، ئازیزم، من تۆزێک لە خۆم بێزارم، بمبوورە، کێ ڕێی لێ گرتوویت، تۆ ئازادیت.'

توند نووساندم بە خۆمەوە و پێم وت، 'مەبەستت چییە؟ تێناگەم!'

بە ساردییەکەوە لێی ڕوانیم، 'مەبەستم، تۆ خۆت ئازادیت بۆ کوێ دەچیت و چی دەکەیت.'

'بۆ حەفتەیەک دەچم بۆ میسر، بۆ قاهیرە، تەنها حەفتەیەکم پێدەچێت.'

'پێم وتیت، تۆ پێویستە خۆت بڕیار بدەیت.'

ماچێکی سەریم کرد و دوای تاوێک بێدەنگی، لێم پرسی، 'دەڵێم، هاوڕێکەت، کارڵ چۆنە؟'

'کارڵ، ئەم حەفتەیە لە ئەمستردام نییە و خەریکی ساخکردنەوە و فرۆشتنی ئەو میراتییەیە، کە باوکی، پاش مردنی، لە دوورگەی تێسل بۆی بەجێ هێشتووە.'

'ئاخ، چۆن، باوکی، بە داخەوە بۆ کارڵ!'

'تۆزێک لەمەوپێش قسەم لەگەڵ کرد، ئێوارە داوەتی ئەوین.'

'منیش؟'

'بەڵێ، تۆیش، خۆشحاڵم دەکەیت ئەگەر ئامادە ببیت!'

ئەو ڕۆژە، بۆ ئێوارەکەی، لە چێشتخانەیەکی یۆنانی، لە سەنتەری شاری ئەمستردام، داوەتی کارڵ بووین، بێجگە لە خواردنەوەی دوو پیاڵەی بچووک ئوزۆ، کە یەکەم جارم بوو تامی بکەم، دایکم و کارڵ داوایان لە خزمەتکارەکە کرد شەرابی سوورمان بۆ بێنێت. بەبیرم دێت، دایکم بە دەنگێکی بەرز بە خزمەتکارەکەی وت، 'تکایە شەرابی سوورمان بۆ بێنە، خەیاڵی من هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ ئەم مەشروبەدا نییە، دەڵێی میز دەکەیتە ڕۆحمەوە.'

تا خۆراکەکەمان بۆ هات، بە هەرسێکمان دوو شووشە شەرابمان خواردەوە، شەرابی یۆنانی، وشک، تامی تەڵاشی داری دەدا، ئەو شەرابە نەبوو، کە ئێمە لە ماڵەوە هەمانبوو، ئەو شەوە کارڵ زۆر دڵخۆش دیار بوو، دەم بە پێکەنین و چاوە زیتەکانی لە من و دایکم نە دەترووکاند.

لە کاتی نان خواردندا، دایکم فرسەتی هێنا و شووشەیەک شەرابی تری داوا کرد، هێشتا زیاتر لە نیوەی ماسییەکان لەسەر قاپەکانمان مابوو. دیسان شووشەی شەرابەکەی بەرز کردەوە و

وتی، 'کوڕینە، شەراب بۆ کێ تێبکەم؟'

لەگەڵ کارل بە کورس وتمان، 'بۆ من.'

پاش ئەوەی هەرسێکمان دەستمان کرد بە پێکەنین، دایکم وتی، 'مارتن، هاوڕێکانت چۆنن؟'

'هاوڕێکانم، ئەوە یەکەم جارتە ئەو پرسیارەم لێ دەکەیت، دەزانیت؟'

ڕاست لە چاویم ڕوانی و لێم پرسی، 'مەبەستم ئەوەیە، تۆ هەرگیز بەلاتەوە گرنگ نەبووە گوایا من چی دەکەم و بۆ کوێ دەچم، یان لەگەڵ کێ هەڵسوکەت دەکەم.'

لەمەوە، بێدەنگی کەوتە نێوانمان، لەژێرەوە سەیری چاوی یەکتریمان دەکرد، دەستم خستە سەر دەستی و پێم وت، 'بمبوورە، کام لە هاوڕێکانمت مەبەستە؟ هاوڕێکانی ئەوسای قوتابخانەم، ئەوانەی ساڵانێکی دووردرێژە هیچیانم نەدیوەتەوە، یان ئەو هاوڕێیانەم، کە ساڵانێک هەموو ڕۆژێ پێکەوە لە ژێرزەمینی کۆفیشۆپێکدا خۆمان بەند دەکرد و تاوێک خەیاڵمان لە هەموو شتێک دادەبڕی؟ ئەوانیش یەک یەک خۆیان لێ ون کردم، هەست دەکەم هەموو هەر لەم شارەدان و ڕۆژانە بەر یەکیش دەکەوین، بەڵام بە جۆرێک بە یەکتری غەریب کەوتووین، ئێستا یەک نەناسینەوە.'

'باشتر، ئەوسا زۆر خەمم بوو گیرۆدە ببیت و خۆت ون بکەیت، بەڵام من مەبەستم هاوڕێکانی شەوتن، وەکوو چۆن خۆت ناویان دەنێیت.'

'ئاوا، هاوڕێکانی شەوم، مرۆڤە غەریبەکانی ئەم شارە، ئەو بێدەرەتان و نابووتانەت مەبەستە، کە لە دەست زوڵم و زۆرداری،

لــه کولانــەی خۆیــان ڕاو نــراون و بەڕێکــەوت لــەم شــارە گیرساونەتەوە.'

'ئەوانەن هاوڕێکانت؟ من وام زانی...'

'کە، هەر ئەوانەی جارانن؟ نەخێر.'

'گرنگ ئەوەیە تۆ هەست بە تەنیایی نەکەیت!'

'نەخێر، چەند کەسێکم بەڕێکەوت ناسیون.'

'کاتیان هەیە بۆ تۆ؟ مەبەستم، کاتت لەگەڵدا بەسەر دەبەن؟'

'بەڵێ!'

'یانی، بێجگە لە ئێمە، پەیوەندیی ترت هەیە؟'

سەرم بۆ ڕاوەشاند و وتم، 'یانی.'

هەناسـەیەکی قـووڵی هەڵکێشـا و بەهێواشـی وتـی، 'پەیوەنـدیی بـۆ ئێمەی مرۆڤ زۆر گرنگە.'

پـاش ئـەوەی تاوێـک بێـدەنگ بـووین، دووبـارە دایکـم وتـی، 'مـن نامەوێت ئەمشەو پەرداخەکەم بەبەتاڵی ببینم.'

کاتێک پەرداخەکەمی نیوە کرد، بەرزم کردەوە و وتم، 'بۆ ئێمە.'

کـارڵ دەسـتی هـەڵبڕی و لێواری پەرداخەکـەی دا لـە پەرداخەکـەی مـن و هیچـی نـە وت، لـەم کاتـەدا دایکـم سـەری داخسـت و خـۆی بێدەنگ کرد، لەگـەڵ کـارڵ سـەرسـام لـە چـاوی یـەکترمان ڕوانـی، دوودڵی و نائاگایی خۆمان لەو بێدەنگییەی دایکم لە چاوی یـەکتردا خوێندەوە، دایکم هەردوو دەستی توند لە ملی بڵندی پەرداخەکـەی هـەڵپێکان، بـێ ئـەوەی سـەیرمان بکـات، بـە کزۆڵەییەکـەوە و بـە دەنگێکی زۆر نزم، کە زیاتر لە نووزە نـووز دەچوو، وتـی، 'دوێنـێ بۆ پشکنین لە نەخۆشخانە بووم!'

دەستبەجێ هەستم بە گەرمییەک کرد، گەرمییـەک، هـەموو لەشمی

داگرت و لە ماسولکەکانمەوە ئارەقێکی سارد ڕژایە سەر پێستم، وەکوو بزانم چ بەڕێوەیە و دایکم دەیەوێت چ هەواڵێکمان پێ بڵێت، بە هەڵەشەییەکەوە ڕووم لە دایکم کرد و پرسیم، 'ئێ، ئێ، وتیان چی، دیسان شێرپەنجەکەیە؟'

'دەبێت بەزووترین کات پەیوەندیی بە نەخۆشخانەوە بکەم بۆ چارەسەر.'

لەمەوە بێدەنگی دای گرتین، بێجگە لە ورتەورتی چواردەورمان و دەنگی کەوچک و قاپی نانخۆران و لێکدانی پەرداخی شەراب و ئوزۆ، هیچی ترت نەدەبیست، ئەو هەواڵە لەبیری بردینەوە بۆچی هاتبووین بۆ ئەو جێگەیە، پەرداخە نیوەپڕەکەی خۆمم لەسەر مێزەکە دانا و کورسییەکەم نیومەترێک کێشایە دواوە، پاڵم لێ دایەوە و بێوچان لە دایکمم دەڕوانی، هێمنتر لە تۆنی قسەکانی پێشترم لێم پرسی، 'کەواتە سەفەرەکەم نەکەم باشترە؟'

ماسولکەکانی دەموچاوی گرژ کرد و بە تووڕەییەکەوە، 'تۆ سەفەری خۆت دەکەیت، خەمی منت نەبێت، ئازیزم، بەتەمای مردن نیم، بەتایبەتی لە ئێستادا، کە بۆ یەکەمین جارمە چێژی خۆشەویستی دەکەم.'

چاوی پڕ بوو لە فرمێسک و دەموچاوی ڕەنگێکی زەردیان بەسەردا ڕژابوو، تاوێک بوو بێدەنگ دانیشتبووین، دایکم هەستا و بێ ئەوەی سەیرمان بکات، لەبەر خۆیەوە وتی، 'با بڕۆین.' دیار بوو زیاتر بۆ شکاندنی ئەو بێدەنگییەی نێوانمان بوو. لە چێشتاخانەکە هاتینە دەر و ملی ڕێمان گرتە بەر، تاریکیی شەو، سێبەرێکی ڕەشی کێشابوو بەسەر زۆرینەی پارچەکانی لەشی شاردا، ئێمەیش بێدەنگ، چەندین هەنگاو لە دەرەوەی ڕووناکیی

دارگڵۆپەکانـــدا و پاشـــان چەنـــد هـــەنگاوێک لـــەناو ســـنووری ڕووناکییاندا، بەردەوام دەڕۆیشتین، شۆستەی شـەقامەکان وەکوو پۆدیۆمێــک، گڵۆپــە ناوازەکــان لــەو دەوروبــەرە دیکۆرێکیــان خولقانـدبوو، پیادەڕەوەکـانی شـەویش، وەکـوو ئەکتـەرێک خۆیـان تێدا نمـایش دەکـرد و دیسـان لـە تـاریکیی دەرەوەی سـنووری ڕووناکیی گڵۆپەکاندا، یەک یەک ون دەبوون، ئەو خـانووە بـەرز و باریکانـەی چەنـدین سـەدەی دێرین دەبـوو لەسـەر ئـەو کـەناڵ و ڕاستەجۆگانەدا، لـە چڕیـدا شـانیان لەیـەک هـەڵپێکابوو، بـە ڕیـز لەســەر کــەناری ڕاستەشــەقامەکانی شــاردا قـنج ڕاوەسـتابوون، زۆربەیان لە بەرزیدا ڕووناکیی دارگڵۆپەکان بەئەستەم دەگەیشتە دامێنیـان و ڕووناکییـان لـە خۆیـان بڕیبـوو، هـەموو ڕەنـگ دێـز و مانــدووی جــەنجاڵیی ڕۆژی شــار بــوون. پێکــەوە دیمــەنێکیان خولقاندبوو، کە جێگە دەستی هونەریی مرۆڤ و سروشتیان پێوە دیار بوو، ئەو خانوو و شۆستە و دار و دارگڵۆپە دێرینانەی شـار، کە چەند سـەدەیەک بـوو هـەزاران مرۆڤی وەکوو ئێمـەیان بـەڕێ کردبـوو و خۆیـان گیانـدار و بێگیـان، بـەبێ ڕەزامەنـدیی خۆیـان بووبوون بە پارچەیەک لە جەستەی شار.

لەبـەینی دایکـم و کارڵـدا بـووم، نـازانم، نغرۆبـوونم بـوو لـەناو خەیاڵەکانمدا ئەو بێدەنگییەیان خولقاندبوو، یان ترسمان لە مردن و گرانیی وشەی شێرپەنجە بوو، دەنگی لێ بڕیبووین و ڕۆحمانی تاساندبوو. دایکم کوتوپڕ خۆی کێشایە نێوانمان و پێی وتین، 'بەم قـژەوە، هـەتا شـێرپەنجە کەچـەڵ و ناشـرینی نـەکردووم، بـا لەنێوانتاندا تاوێک ڕێ بکەم.'

توند باڵم لە باڵی هەڵپێکا و دەستم لەناو دەستی نا، 'فەرموو خانم.'

'مارتن، ئازیز، تۆ دەمت داخە بە یارمەتیت، هەتا ئەمشەومان لێ تێک نەدەیت بە قسە ڕەقەکانت.'

پێکەنیم و وتم، 'بەڵێ، بەڵێ باشە، گەورەم.'

دایکم لەبەر خۆیەوە بە هێواشی دەستی کرد بە گۆرانی چڕین، سەیرێکی من و کارڵی کرد و پێی وتین، 'کاتی گۆرانی چڕینە...'

*"کەنار کەناڵی ئاوەکان*
*ڕووی شۆستەکانی ئەم شارە*
*ئەو گڵۆپانەی لە کوڕەپانەکان دەگرێن*
*تەواوی دڵم پابەندە.*
*ئەم شارە هەست بە خەیاڵم دەکات*
*وەکوو جوانترین شار لە وڵاتەکەمدا*
*هەموو خەڵکی ئەم شارە*
*کەس نییە تەمەنای باشتری هەبێت*
*کە خەڵکی ئەم شارە بێت."*

هەرسێکمان پێکەوە بە گۆرانی چڕین، بە کەناری ڕاستە جۆگەکانی شاردا دەڕۆیشتین. کاتێک گەیشتینە ماڵەوە، دایکم هەرگیز نەیدەویست بێدەنگ بێت، بەردەوام هەمان گۆرانی دەچڕی، سەیرێکی من و کارڵی کرد، 'کوڕینە، بەردەوام بن، تکایە بێدەنگ مەبن و گۆرانی بچڕن، تاکوو تەواو ڕۆحمان سەرمەست بکەین، مەست بوونێک، کە لەبیرمان بچێتەوە لە چی ڕۆژێکداین،

له هەمان کاتدا خۆئامادەکردنتانە بۆ ڕۆژی من، کە لەوە دەچێت مانگی داهاتوو بێت، یان ساڵی داهاتوو، شەرمە بۆ ئێوە لەو ڕۆژەدا بۆم بگرین و پێکەوە ئەم گۆرانییەم بۆ نەچڕن.'

تا درەنگانی شەو گۆرانیمان چڕی و ئاهەنگمان گێڕا، بەڵکوو تاوێک وشەی شێرپەنجە لەبیری خۆمان بەرینەوە.

٥

# تاكسی

کاتژمێر هەشتی سەرلەبەیانیی ڕۆژی دەی حەوت، لەگەڵ دایکم و کارڵدا بەرەو فرۆکەخانەی سخیپۆل بەڕێ کەوتین، کە پازدە کیلۆمەترێک لە ماڵی ئێمەوەوە دوورە، هەستم پێ کرد، دایکم دەمی گەیاندبووە شووشەی شەرابەکەی و تەواو مەست دیار بوو، بەدرێژایی ئەو ڕێگەیە، لەژێر لێوەوە لەگەڵ خۆیدا دەدوا، کاتێک کارڵ ئۆتومبێلەکەی لە گەراجی فرۆکەخانەکە ڕاگرت، کۆڵەپشتەکەمی بە دەستەوە گرت و هەرسێکمان بەرەو ناو هۆڵی فرۆکەخانەکە بەڕێ کەوتین.

پێش ئەوەی بچمە بەردەمی پۆلیسەکان بۆ پشکنین، چەند جارێک دایکمم لە ئامێز گرت، ئەو هەر پێدەکەنی و لەبەر خۆیەوە ورتەورتی بوو، دیسان پێش هۆڵی ترانزێت، ڕووم کردە دایکم، 'دایە، تا حەفتەی داهاتوو.'

توند لە باوەشم گرت و چەند جارێک ڕوومەتیم ماچ کرد، هەستم کرد، ئەو هەرگیز ئەوەندە لەگەڵمدا ساردوسڕ نەبووە، پاش ئەوەی

ئەو بێدەنگ لێی دەڕوانیم، پێم وت، 'تا دەگەڕێمەوە، ئاگات لە خۆت بێت...'

چاوی پڕ بوو لە فرمێسک، بەردەوام لە بەری پێمەوە تا تەوقی سەرم لێی دەڕوانیم، کارڵ هاتە پێشەوە و باڵێکی خستە سەرشانی دایکم و توند بە خۆیەوە نووساندی، سەیرێکی منی کرد، وەکوو نەیەوێت دایکم گوێی لێی نەبێت، لەژێر لێوەوە، بەهێواشی وتی، 'بێخەم بە، مارتن!'

دەستم درێژ کرد و لەگەڵ کارڵ دەستمان لەنێو دەستی یەک نان، لەو دەمەدا، کارڵ منی بۆ لای خۆی ڕاکێشا و دەستی کردە ملم، بینیم چۆن من و دایکم کەوتبووینە ژێر باڵەکانی کارڵەوە، پاشان کارڵ وتی، 'مارتن، دوودڵ مەبە لە سەفەرەکەت، دایکت بە من بسپێرە و هیچ خەمیت نەبێت.'

ئینجا کارڵ کارتێکی لەناو دەستم نا، تەلەفۆن و ئیمایڵەکەی خۆی لەسەر بوو، وتی، 'هەرکاتێک پێویستیت بە من بوو...'

دەستێکم لەناو دەستی دایکم نا و دوامالئاواییم لێ کردن، تا لێیان دوور کەوتمەوە و لە چاوم ون بوون، هەردووکیان هەردوو دەستیان لە هەوادا بوون.

دوودڵ و بێزار، چوومە فرۆکەکەوە، لەلای پەنجەرەکەوە جێگەیەک بەتاڵ بوو، بێ تەماشاکردنی ژمارەی کورسییەکە و بەراوردکردنی لەگەڵ ئەو ژمارەیەی لەسەر بیتاقەکەم تۆمار کرابوو، کۆڵەپشتەکەم لە سەرەوە دانا و چووم لێی دانیشتم.

چاوم لە دەرەوە بڕیبوو، خەیاڵم هەر لای دایکم بوو، شێوەی لە پێشچاومدا ون نەدەبوو، تا دەهات، ڕوخساری تێکشکاوی و ئەو ساردوسڕییەی لەبەرامبەر مندا، قورسایی خۆیان دەخستە سەر

ڕۆحم، ڕاپەریم لە قورسیی جەستەی کەسێک، شانی توند بەر شانم کەوت، کابرایەکی گەنم ڕەنگی قژلوولی زۆر قەڵەو، هەوڵی دەدا جێگەی خۆی بکاتەوە، جەستەیەکی ناقۆڵا و بێئەندازە زل، هەناسەی لەبەر بڕابوو، ئارەقی بن باڵەکانی، لەگەڵ هەموو جووڵانەوەیەکیدا لووتمی پڕ دەکرد لە بۆنی جەستەیەکی نیوە مردوو، قورساییان لەسەر زەینم کرد و لە خەیاڵمیان دابڕیم، بە جۆرێک، دایکمی لەبیر بردمەوە.

یەکەم جارم بوو سواری فڕۆکە ببم، بێجگە لە بۆنی جەستەی ئەو پیاوەی لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو ئەوەندەی تر تووشی سام و دڵگوشینی کردم، بۆ ئەوەی لەبیری خۆمیان بەرمەوە، لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەم دەکرد و بەردەوام لەبەر خۆمەوە گۆرانیم بۆ خۆم دەچڕی، تاوەکو فڕۆکەکە لە زەوی بەرز دەبووەوە، زیاتر جەستەم دادەهێزرا و ئارەقم دەکردەوە، پێش نزیکبوونەوەی لە سنووری هەورەکان، چەند جارێک لەرزی و خۆی ڕاوەشاند، وەکوو بیەوێت لە هەوادا خۆی بتەکێنێ و تەپوتۆزی زەوی لە جەستەی پاک بکاتەوە، هێندەی تر سەرسنگم قورس بوو، لە گەدەمەوە پاشەڕۆی خۆراک هەتا ناو قوڕگم دەهات و بەردەوام هێڵنجم دەدا، جارجار شلەیەکی تاڵ دەڕژایە ناو دەمم و دیسان قووتم دەدایەوە، چەند جارێک لە شوێنی خۆم هەستام و دیسان لە جێگەکەی خۆم دانیشتمەوە، کچێک لە سەرپەرشتیارانی فڕۆکەکە هات و ئاگاداریی پێ دام؛ کە دەبێت لە جێگەی خۆم دابنیشم و خۆم ببەستمەوە.

گەرمییەکەی لەشم گۆڕا بە سارد و لە سەرمادا ددانەکانم چەقەچەق دەیاندا بەیەکدا، چاوم توند نووقاند و خۆم لەسەر

کورسییەکەم گرمۆڵە کرد. کاتێ فڕۆکەکە لە هەوادا هاوسەنگیی خۆی وەر گرت، خێرا فرسەتم هێنا و بەسەر ڕانە ئەستوورەکانی کابرای قەڵەودا، کە تاوێک بوو خەوتبوو، بازم دا و شپرزە خۆم گەیانـدە بـەردەمی تەوالێتەکـە، گڵۆپەکـەی سـوور دەگـڕا و نووسرابوو گیراوە، چەند جارێک لە بەر خۆمەوە، 'بێڕەوشتییە، بێڕەوشتییە.'

بە ڕاڕەوەکەدا بێ ئارام دەستم کرد بە گەڕان، چووم بۆ ئەوسەری فڕۆکەکە و دیسان زۆر بەخێرایی بە ڕاڕەوەکەدا گەڕامەوە بۆ لای جێگەکەی خۆم و بەسەر کۆش و ڕانی کابرای قەڵەودا هەنگاوم نان و لە جێگەکەمدا دانیشتمەوە. ڕۆحم ئۆقرەی لەبەر بڕابوو، بە جۆرێک، کە زۆربەی سەرنشینەکان سەرنجیان دەدام. چەند جارێک هەمان کچی سەرپەرشتیکار هات بۆ لام و پرسیاری لێ کردم، منیش بە لالووتێکەوە بە نەخێر بەڕێم دەکرد، هێندەی پێ نەچوو، بە پەرداخێک ئاوەوە گەڕایەوە، پەرداخەکەم لە دەست وەر گرت و بەبێ ئەوەی لێی بڕوانم و سوپاسی بکەم، ڕژانمە ناو قوڕگمەوە، کە کەمێک تاڵی ناو دەم و قوڕگمی ڕامالّی بۆ ناو گەدەم، پاشان خۆی نوشتانەوە و سەیرێکی چاومی کرد و وتی، 'بەڕێز، تۆ باشیت؟'

'هیچ کێشەم نییە.'

'دڵنیایت لە خۆت، بەڕێز، لەوە دەچێت تۆ ترسی فڕینت هەبێت!'

کاتێک ئەمەم لە سەرپەرشتیارەکە بیست، خوێنی لەشم بەورووژم هەڵکشان بەرە و سەرم و ڕۆحم ئەوەندەی تر وروووژا، ڕووی خۆم لێ وەر چەرخاند، دەمویست لە خۆم دەر نەچم، بێدەنگ لە پەنجەرەکەوە، لە شینیی ئاسمان و بۆری و دێزیی هەورەکانم

دەڕوانی، کە فڕۆکەکە لەو دەمەدا بەنێوانیاندا دەفڕی، نازانم چەندێک بوو دەستە ئارەقاوییەکانم لەیەک هەڵدەسوین، ئەژنۆم توند لە کورسییەکەی پێش خۆم گیر کردبوو، لەناو هالاو و گەرمیی ئارەقی لەشی خۆمدا، خەریک بوو هەناسەم لەبەر دەبڕا، زۆرم لە خۆم کرد و تاوێک چاوم لێک نا.

لە بانگەوازی بڵندگۆی ناو فڕۆکەکە بەئاگا هاتمەوە، داوای دەکرد ئامادە بین و لە کاتی نیشتنەوەدا خۆمان ببەستینەوە، کە پاش کەمێکی تر ڕوو دەدات، لە چاوکردنەوەمدا، ئەوەی یەکەم تیلەی چاوم پێکای، ئاوی نیل بوو، کە پێچ پێچ و شین ڕاکشابوو لە نێوان قەراغێکی باریکی سەوز و زەردی بێکۆتایی بیابانێکدا، لە ناکاو سێ ئەهرامەکەی خیزا لە دوور دەر کەوتن، پاشان ئەو خانووانەی تەنها هێندەی شقارتەیەک دەبوون، بێشومار بە ڕیزی یەکدا لەو بیابانەدا ڕاخرابوون. فڕۆکەکە نیشتەوە، دەنگە دەنگی سەرنشینەکان و داگرتنی کۆڵەپشت و خۆکۆکردنەوەیان، بێدەنگیی ناو فڕۆکەکەیان شکاند، سەرنشینەکان لەناو ڕاڕەوەکەدا ڕاوەستان، کابرای قەڵەو هێشتا لە پرخەی خەودا بوو، هەردوو دەستم بە قەراغی کورسییەکەوە گرت و توند خۆم بەسەر کابرای خەوتوودا هەڵبڕی و خۆم لێی دەرباز کرد، کۆڵەپشتەکەم داگرت و چووم لەتەنیشت دوو کچە سەرپەرشتیارە جل شینەکەوە ڕاوەستام، کە هەردووکیان بە سەرنجەوە تاوێک بوو لێیان دەڕوانیم، یەکێکیان وتی، 'بەخێر بێیت بۆ میسر.'

هەستم دەکرد دەمم گۆی نەدەکرد و هیچ هێزم تێدا نەبوو وەڵامی بدەمەوە، وەکوو ڕۆحم مانی گرتبێت لێم، ئەوەی کە لە خەیاڵمدا بوو، ئەوە بوو خێرا خۆم لەو تابووتە دەرباز بکەم و نەجاتم

ببێت، کاتێک دەرگای فڕۆکەکە کرایەوە، من لەپێش هەموو سەرنشینەکانی فڕۆکەکەوە بووم، دووبارە کچەکان، کە لەمبەر و ئەوبەری دەرگاکەوە ڕاوەستابوون، بە کۆرس وتیان، 'بەخێر بێیت بۆ میسر.'

سەرم بۆ ڕاوەشاندن و ملم بۆ دەرەوە نا، هاڵاو و گەرمییەک دای بە ڕوومدا، هەڵوێستەیەکم کرد و هەنگاوێ بەرە و دواوە گەڕامەوە، بەر کەسێک کەوتم و دەستێکی نا بە پشتمەوە و بە دەنگی بەرز وتی، 'میستەر، مستەر.'

بێ ئەوەی ئاوڕی لێ بدەمەوە، 'سۆری، سۆری.'

پاشان ملی ڕێم گرت و بە پلیکانەکاندا چوومە خوارێ، ئافرەتێکی شینپۆشی ئەسمەری باڵابەرزی قژڕەش پێشمان کەوت، هاڵاوی گەرمی و بۆنی قیر و تەپوتۆزێکی ورد لە هەوادا، هێندەی تر ڕۆحیان گوشیم، سەرم داخستبوو، ماسولکەی دەوری چاوم توند گرژ کردن، تاکوو تین و شەوقی بەهێزی خۆرەکە تۆزێک فەرامۆش بکەم. ئەوەند خۆم کوور کردبۆوە، لووتم نزیک کردبۆوە لەسەر پشت و نزیک سمتی ئەو خانمەی لەپێشمەوە ڕێی دەکرد، نزیکەی سەد مەترێک تا ناو هۆڵ و باڵاخانەی فڕۆکەخانەکە ڕێبەریی دەکردین.

کاتێک پێم نایە ناو هۆڵی فڕۆکەخانەکە، ئەوەندە سارد بوو، وەکوو چۆلەکەیەکی تەڕ لەناو ئارەقی خۆمدا هەڵدەلەرزیم، لە بەردەمی پەنجەرەیەکدا پاسپۆرتەکەم دایە دەستی یەکێک لەو چەندین پۆلیسانەی لەپشتی کابینە شووشەبەندەکانەوە بۆ ئەو مەبەستە دانیشتبوون، پاش سەیرکردنی پاسپۆرتەکەم، ئاماژەی بە لاپەڕەیەکی بەتاڵی ناو پەسپۆرتەکەم کرد، ڕووی تێ کردم و وتی،

'تۆ پێویستت بە ڤیزەیە، لەو لۆکێتەی بەرامبەرمان، لە لۆکێتی ئەو بانقە، دەتوانی بیکڕیت.'

چەند جارێک سەرم بۆ ڕاوەشاند و پاسپۆرتەکەم لە دەست وەر گرتەوە و بەرەو بانقەکە چووم. وەرگرتنی ڤیزەکە، تەنها پارچەیەک لەزگە بوو دایان لە پاسپۆرتەکەم، دوای چەندین جار تەماشاکردنەوەی پاسپۆرتەکەم و پشکنینی کۆڵەپشتەکەم، هەموو بەداوی یەکدا ڕیزمان بەست و چووین بۆ پۆستی جانتاکان، کوتوپڕ بیرم کەوتەوە، کە من تەنها کۆڵەپشتێکم پێیە و هیچی تر، کەواتە کارم بە هاوسەفەرەکانم نەماوە و بۆم هەیە بەتەنیا بڕۆم بە ڕێی خۆمەوە، لە خەیاڵمداماڵئاواییم لە یەک بە یەکیان کرد، بۆ ئەو سەفەرە چەند کاتژمێرییەی هەموومان پێکەوە لەناو ئەو تابووتە باڵدارەدا بەسەرمان برد.

لە دەرگایەکی شووشەتاریکەوە چوومە هۆڵێک، دوو پۆلیس جارێکی تر لە پاسپۆرتەکەمیان ڕوانی، ئەوانیش لە کۆتاییدا زەردەخەنەیەکی بێلەزەتیان بۆ دەکردم و هەمان ئەو دێڕەیان وتەوە، 'بەخێر بێیت بۆ میسر.'

کەوتمە ناو شەپۆلی جەنجاڵییەکی بێشومارەوە، کە زیاتر لە شارەمێروولە دەچوو، وەکو تۆپێک لە گۆڕەپانی قوتابخانەیەکدا بە پێی منداڵانەوە بم، هەموو لە یەکترمان دەڕوانی و کەسیش گوێی بە کەس نەدەدا، بەر هەرکەسێک دەکەوتم، وشەی ببوورەم تێ دەگرت و کەسیش وەڵامی نەدەدامەوە. زۆرێک لەوان ڕاست ڕووبەڕووم دەهاتن و لە چاوم ڕادەمان، لە چاویاندا پرسیارێکم دەبینی، لەبەر کەمی کات و جەنجاڵیی خۆم بۆم فۆرمەلە نەدەکران. هەموو پەلەیان بوو، لەبەر خۆیانەوە قسەیان دەکرد و

کۆڵەپشت و کەلوپەلی زۆریان پێ بوو. زووزوو بە چواردەوری خۆمدا دەمڕوانی، بە جۆرێک، کە لەبیرم چووبۆوە بۆچی من لەوێدام، جەنجاڵیی شوێنەکە و سەرسامبوونی من بە جۆرێکی تر لە مرۆڤ، نەمدەتوانی بیر بکەمەوە و لە دەرگای چوونەدەرەوە بگەڕێم، ئەوەی زیاتر لەناو گوێمدا هاوار و ژاوەژاوەکانی گران کردبوو، بانگی بڵندگۆکان بوو، بە چەندین زمان و تۆنی دەنگی جیاوازەوە دەیانزریکاند، بەبێ ئەوەی کەسێ گوێشیان لێ بگرێت، پاش چەندین جار ڕاست و چەپ پێکردنم، بێ خواستی خۆم لەگەڵ شەپۆلی ئەو خەڵکەدا، لە دەرگایەکەوە چوومە دەرەوەی هۆڵەکە و کەوتم بەسەر گۆڕەپانێکی گەورەدا.
شەپۆلی گەرمی هەتاوەکە بەرەو ڕووم بووەوە، بە هەمان شێوەی ناو دەرگای فڕۆکەکە، نەمتوانی پاشگەز ببمەوە و بە چەند پاڵێک خستمیانە بەر خۆرەکە، هەستم دەکرد دەزوولەی تیشکی خۆرەکە لەسەر ڕوومەتەکانم سەمایان دەکرد و بێڕەحمانە گەرمیی خۆیانیان دەچەقاندە پێستمەوە، گەرمی و هالاوێک بوو ڕۆحم پێی ئاشنا نەبوو، بۆ یەکەم جارم بوو بۆن و بەرامی لەو جۆرە بەسەرمدا بێت. گۆڕەپانەکەیش بە هەمان شێوەی هۆڵەکەی ژوورەوە جەنجاڵ بوو، لەناو گەرما، ملی سەکۆکەم گرتە بەر و تاوێک بە دەستی چەپمدا ڕۆیشتم، بنهەنگڵم لە ئارەقدا زڵچەی دەهات. ڕاستە شەقامی نێوان فڕۆکەخانەکە و گۆڕەپانەکە لە ئۆتومبێل و فرۆشیاری دەستگێڕ جمەی دەهات، خۆم گەیاندە ئەو کۆمەڵە تاکسییانەی بە ڕیزێک سنوورێکیان لەنێوان فرۆشیارە دەستگێڕەکان و پیادەڕەوەکاندا دروست کردبوو، تاکسییەکان بۆردەکانیان ڕەنگی نارنجی بوو، ژمارەکانیان بەگەورەیی و بە

ڕەنگی ڕەش لەسەر دەرگاکانیان نووسرابوو. یەکەم تاکسی کە لەپێشی ڕیزەکەوە وەستابوو، شۆفێرەکەی گەنجێکی قژلوولی ئەسمەر بوو، پێم وت، 'بۆ مۆزەخانەی نیشتمانی، لە گۆڕەپانی تەحریر.'

زەردەخەنەیەکی بۆ کردم و چەند جارێک لەسەر یەک وتی، 'ئۆکەی، ئۆکەی میستەر.'

لەگەڵی سەر کەوتم و سولفی لێدا و بەڕێ کەوتین، کاتژمێر سێی پاش نیوەڕۆ بوو، مۆزەخانە کاتژمێر پێنج دادەخرا، دوو کاتژمێرم کات لەپێش مابوو.

شۆفێری تاکسییەکە زۆر خێرا لێی دەخوڕی، بەردەوام هۆڕنی لێدەدا، دەستم بە دڵمەوە گرتبوو، بە ڕاست و چەپمدا لار دەبوومەوە.

کاتێک گەیشتینە ناوشار و ناچار بوو هێواش لێبخوڕێت، پاشان لە شەقامێکی جەنجاڵدا تەواو وەستا، شەقامێک، کە سەدان ئۆتومبێل پێکەوە دەستیان لەسەر هۆڕنەکانیان دانابوو، کاتێ شۆفێرەکە جامەکەی لای خۆی کردەوە، لەپڕێکدا هاڵاوی گەرمی و هۆڕن و ژاوەژاوی سەر شەقامەکە بەوروژم هاتنە ژوورێ، خەڵکێکی زۆرم بینی، بە ئاڵای ڕەنگاوڕەنگەوە بەسەر شۆستە و شەقامەکاندا دەڕۆیشتن، لە جێگەی خۆمەوە پرسیم، 'ئەوە چی ڕووی داوە؟'

'ئەمڕۆ زەمالیک و ئەهلی یاری دەکەن، ئاساییە بۆ ئێمە، چونکەساڵی چەند جارێک ڕوو دەدات. بە خوای گەورە ئەو ڕۆژەی ئەو دوو تیمە یاری لەگەڵ یەک بکەن، ژیانی ئاسایی لەم شارەدا ئیفلیج

دەبێت، دەترسم نەتوانم لە کاتی خۆیدا بتگەیەنمە مۆزەخانە.'
'ئاخ، فووتباڵ!'
بەردەوام چاوم لەسەر چرکەژمێری کاتژمێری ناو داشبۆردی تاکسییەکە بوو، شۆفێرەکە دەستێکی لە جامەکەوە دەرهێنابوو، بە دەستەکەی تری، زووزوو هۆڕنی لێدەدا. هەستم دەکرد پەنجە لە ڕۆحم دەژەنێت، بە ئینگلیزییە لاوازەکەی و بە دەنگێکی بەرز، دەستی کرد بە گێڕانەوەی مێژووی ڕووداوەکانی ئەو دوو تیمە، کە لە خولی میسردا بەر یەک کەوتوون، وەکوو شۆفێری تاکسییەکە باسی لێوە دەکرد، لە ساڵانی ڕابردوودا زیاد لە هەزار کەس لە هاندەرانی هەردوو لا گیانیان لەدەست داوە، زوو لام ئاشکرا بوو، کە ئەو هاندەری ئەهلی بوو، بە شێوەیەک، کە بە هۆڕن لێدان ئاهەنگی لەگەڵ هاندەرانی یانەی ئەهلیدا دەگێڕا. پاشان بەردەوام بوو لە دوان و کارتێکی بۆ ڕاگرتم، 'لەگەڵ برایەکم، لە نزیکی مۆزەخانە، دوکانی جلوبەرگمان هەیە، بۆ هەموو پێویستییەک، دەتوانیت سەردانمان بکەیت.'
دیسان بەردەوام بوو، 'میستەر، ئەگەر لە ڕۆژانی داهاتوودا پێویستیت بە تاکسی بوو، ئەوا ژمارەی تەلەفۆنەکەم لەپشتی کارتەکەم نووسراوە، بە خوای گەورە، تەنها بە هەشتا دۆلار، لە بەیانی هەتا ئێوارە، بە خۆم و تاکسییەکەمەوە لە خزمەتتدا دەبین. بە خوا بۆ کوێ تۆ بتەوێت، هەر جێگەیەک، بە پشتیوانیی خوای گەورە، بۆ هەرجێیەکی میسر تۆ بتەوێت، دەتگەیەنم، لەژێر فەرمانت دەبم.'
سەرم بۆ لەقاند، کارتەکەم لێ وەر گرت و تەماشایەکم کرد، پاشان لولم کرد و لە گیرفانی پانتۆڵەکەم ئاخنی.

هێواش لێی دەخوڕی و بەردەوام دەستی لەسەر هۆڕنەکە بوو، پاش زیاتر لە کاتژمێرێک هۆڕن لێدان و بە دەنگی بەرز دوان، لە سنووری گۆڕەپانێکی بەرفراواندا وەستا. خێرا دابەزیم و هەقی خۆیم لە دەستی نا، کابرا دەیویست زیاتر زانیاریم پێ بدات و هێشتا توند دەستی گرتبووم، بە بێزارییەکەوە خۆم لێ ڕاپسکاند و چەند هەنگاوێک لێی دوور کەوتمەوە، لە کەناری گۆڕەپانەکەوە ڕاوەستام.

هەستم کرد وردەوردە لە بەر گەرمیی خۆرەکەدا دەکولام، زۆرم لە خۆم کرد و چاوم بەزۆر هەڵبڕی، تیشکی خۆرەکە وەکوو وردە زیخ بەر گلێنەی چاوم کەوت، چاوم بە گۆڕەپانەکەدا گێرا، دەنگی هاشوهووش و هۆڕن لێدان، وەختەبوو پەردەی گوێمی دەدڕی، دیار بوو کەس نەبوو لەو ولاتەدا پێی بێزار ببێت، شەقامێکی چەندین ڕێچکە، کە بە دەوریی گۆڕەپانەکەدا دەسووڕایەوە، جەنجاڵی وای کردبوو، کە هیچ یاسایەکی پەڕینەوە و ڕێگاوبان بوونی نەمێنێت. بۆنی قیری تواوە و دووکەڵی بەنزین و گازی سووتاو خێرا بە مەلاشوومەوە نووسان و سییەکانمیان پڕ کرد لە بۆدڕنی خۆیان، بە جۆرێک، کە خۆم لە هالاو و بۆنی هەناسەی خۆم بێزار بووبووم. تیشکی خۆرەکە زۆری بۆ هێنام، ناچار پاشەوپاش گەڕامە دواوە و خۆم خستە ژێر سێبەری یەکێک لەو عارەبانە دەستییانەی بە بەرزیی مەترێک زیاتر، سەمووونی لاکێشەیی لەسەر هەڵچنرابوو، خاوەنەکەی لەگەڵ ئەوەدا کە سەرقاڵی بەڕێکردنی مشتەرییەکانی بوو، زووزوو بانگی دەکردم، 'میستەر، میستەر.'

ناچار بووم دوو هەنگاوێک سێبەری عارەبانەکەی بەجێ بێڵم، لە

دڵی خۆمدا، 'لەوانەیە لەم دۆزەخەدا، سێبەر هەر وا بەلاش نەبێت!'
ویستم بە شەقامەکەدا بپەڕمەوە، لەبەر زۆری و خێراڵیخوڕینی ئۆتومبێلەکان، نەموێرا لەسەر شۆستەکە ببزوێم، لە جێگەی خۆمەوە، بە سەرسامییەوە سەیری ئەو هەموو ئافرەت و منداڵ و پیر و گەنجانەم دەکرد، کە لەنێوان ئۆتومبێلەکانەوە بە ڕاکردن دەپەڕینەوە، بێ ئەوەی لەو وروژانەی ڕۆحم تێبگەم، لەو دەمەدا پەڕینەوە لەو شەقامە، پەڕینەوەم بوو بە باڵە مەلە لە دەریایەکی بێکۆتا. لە بیری ئەوەدا بووم، چۆن خۆم بگەیەنمە ئەوبەری گۆڕەپانەکە، چەندین دەستگێڕ دەورەیان لێ دام، جگەرە، بسکیت، ساردەمەنی و کەرەستەی وردەواڵەیان پێ بوو، هەموویان بە کۆرس و بە ناوازە، بە دەنگی بەرز بانگیان لێ دەکردم، 'میستەر، میستەر.'
چەند جارێک خۆم لێ تووڕە کردن و پاڵم نا بە سنگ و شانیانەوە، لە بێزاریمدا، هاوارم کرد بەسەریاندا، 'سێبەرتان پێیە، من پێویستیم بە سێبەرە؟'
ئەو دیمەنانەی لە پێشچاوم بوون، لە خەیاڵمدا بەردەوام خەریکی تاوتوێکردنیان بووم، تەنانەت بۆ ساتێکیش، نەیاندەتوانی ئەو وروژانەی ڕۆحم خاو بکەنەوە، یان گوشاری گەرمیی ئەو خۆرەم لەبیر بەرنەوە، هەستم دەکرد کەللەی سەرم دەکوڵا، ئینجا هالاو و بوخارەکەی لە لووت و قورگمەوە دەر دەچوون. لەلای چەپی گۆڕەپانەکەوە، کاتژمێرێک بە بەرزییەکەوە هەڵواسرابوو، کاتژمێر پێنجی دوانیوەڕۆی نیشان دەدا، لە خەیاڵی خۆمدا، 'فریای مۆزەخانە ناکەوم، باشترە لە ئوتێلێک بگەڕێم، بەڵکوو پشوویەکی تێدا بدەم و لەم جەنجاڵی و گەرمایە ڕزگارم بێت، سبەینێ

کاتژمێر هەشتی سەرلەبەیانی خۆم دەگەیەنمە مۆزەخانە، پێش بەرزبوونەوە و نزیکبوونەوەی تیشکی خۆر لە ڕێگەوبانەکان، خۆم دەگەیەنمە بەر سێبەری دیوارەکانی مۆزەخانە.'
تاوێک بوو کۆڵەپشتەکەم لەسەر سەرم ڕاگرتبوو، بە چواردەورمدا هاتوهاوار و هۆڕن لێدان بوون، چەندین دەستگێڕیش دەوریان لێ دابوومەوە و زووزوو بانگیان دەکرم و تێوەیان دەژەندم، بێجگە لە وشەی میستەر، هەموو قسەکانی تریان بە زمانی عەرەبی بوو یان بە دەست و سەریان ئاماژەیان دەکرد، لەناکاو کەسێک دەستگێڕەکانی لێ دوور خستمە و ڕاست لە بەردەممدا ڕاوەستا، بە هۆی زلی و بەرزیی بالآیەوە، بەری خۆرەکەی لێ گرتم و سێبەری بەسەردا کردم، کۆڵەپشتەکەم لەسەر سەرم داگرت و پێی دا هەڵم ڕوانی، زەلامێکی بۆری بالآبەرزی سەرتاشراو، بە ڕوویەکی خۆشەوە دەستی بۆ درێژ کردم، بە نابەدڵییەکەوە دەستم نایە ناو دەستی، توند دەستی گوشیم و بە چاوە ڕەش و گەورەکانی، زەق لێی ڕوانیم، چەند جارێک لەسەر یەک وتی، 'تاکسی، تاکسی، میستەر، تاکسی.'
زووزوو لەگەڵ گوشین و ڕاوەشاندنی دەستمدا، دووبارەی دەکردەوە، سەرم بۆ لەقاند و بە هەمان تۆنی دەنگی ئەو وتم، 'تاکسی، تاکسی، ئۆکەی، میستەر.'
کوتوپڕ دەستی بەر دام و پەری کرد بە کۆڵەپشتەکەمدا و لە دەستی دەرهێنام، پاش ئەوەی کۆڵەپشتەکەمی لە شان کرد، ڕووی لێ وەر گێرام و بەسەر شۆستەی دەستە ڕاستدا دەستی بە ڕۆیشتن کرد، منیش بەناچاری دوای کەوتم.
کاتێک کابرا لە شەقامەکە پەڕییەوە، من لە شانیەوە دەڕۆیشتم، بێ

ئەوەی بوێرم لەو ئوتومبێلانە بڕوانم، کە بە ڕاست و چەپماندا بە هۆڕن لێدان گیڤەیان دەکرد. چووینە لای ئەو ڕیزە تاکسییەی دەمێک بوو لەوبەری شەقامەکەوە لێم دەڕوانی، ویستم بە کابرا بڵێم، کە بۆ ئوتێلێکم بەرێت، بەڵام پێی ڕانەگەیشتم و خێرا بەلای تاکسیەکاندا تێپەڕی و چەند جارێک ئاوڕی لێ دامەوە و بە دەستێکی ئاماژەی پێ دام، کە دوای بکەوم. لەوەدا بوو، گۆرەپانەکەیش بەجێ بێڵێت و خۆی بکات بە یەکێک لەو چەندین کۆلانانەدا، کە دەکەوتنە سەر گۆرەپانەکە. چەند جارێک بانگم لێ کرد، 'تکایە بوەستە!'

کابرا ئاوڕی لێ نەدامەوە و بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن، گەیشتە ناو کۆلانێکی تەنگ، ئەمبەر و ئەوبەری ئەو کۆلانە، بە عارەبانە و مێز گیرابوو، بە جۆرێک، کۆلانەکەیان هێندەی تر تەنگ کردبووەوە، بازاڕێک بوو، هەموو شتێکی تێدا بەرچاو دەکەوت، جلوبەرگفرۆش، شێوازی جلەکانیان و ڕەنگ و ڕەواڵەتی کاڵەوەبوویان دڵیان تەنگ دەکرد، سەوزە و میوە فرۆش، بەردەوام بە ڕووی پیادەڕەواندا دەیاننەڕاند، سەبەتە دانراوەکان پڕ بوون لە سەوزە و میوە و خواردەمەنی، لەو دەوروبەرە، تاکوتەرا بە بارتەقا و بەرزیی مێزی میوەفرۆشەکان، خەشوخاڵ و پاشەڕۆم دەبینی، بۆگەنیان هەستی بۆنکردنمیان پەک خست، ئەو دوو ڕیزە باڵاخانەیەیی ئەملاولای کۆلانەکەیان گرتبوو، هەموو ڕەنگ زەرد و هاوشێوە بوون، زۆر دڵتەنگ دەهاتنە پێشچاوم، یەک یەک شانیان دابووە بەر شانی یەک و پیری و بێخزمەتی بە ڕەنگ و باڵایانەوە دیار بوو. هەوای ئەو کۆلانە ئەوەندە خنکێنەر و ناتەندروست بوو، هەستم دەکرد سییەکانم هەڵئاوسابوون،

منداڵی سواڵکەر بەو کۆڵانەدا بڵاو بووبوونەوە و بە بیانووی دەستگێڕییەوە، دەستیان لە هەموو پیادەڕەوێک پان دەکردەوە، کە بەویدا تێدەپەڕی، ئەو ئافرەت و منداڵانەی بە قوڵینەی پڕ لە نانی گەرمەوە پێشیان بە پیادەڕەوان دەگرت، لەبەر تیشکی خۆرەکەدا هەناوی خۆیان و نانەکانیان بەردەوام هالاوی لێ هەڵدەستا، هەراوزەنای ئەو هەموو فرۆشیارانە و دەنگی بەرزی مۆسیقای ئەو کاسێتفرۆشانەی بڵندگۆکانیان بە بەرزییەوە دانابوو، خەریک بوو پەردەی گوێم بدڕینن، دەنگی مۆسیقا و گۆرانیبێژەکان، جەنجاڵیی ئەو بازاڕەیان دەلاواندەوە، چەند جارێک لە بێزاریمدا توند گوێم گرت و دەنگی چواردەوری خۆمم لێ بڕین.

لە کاتێکدا سەرنجم لە چواردەورم دەدا، کابرا زیاتر لە دە مەترێک لێم دوور کەوتبۆوە، بەردەوام فرۆشیارێک یان دەستگێڕێک، کە ژمارەیان لە پیادەڕەوەکانی ئەو بازاڕە زیاتر بوو، کابرایان لە پێشچاوم ون دەکرد، قوڕگم وشک و لێوەکانم لە سوێراوی ئارەقی ڕوخسارمدا خوسابوو، ئەژنۆم دەلەرزین و بەئەستەم خۆم لەسەر پێیەکانم بۆ ڕاگیر دەکرا، چەند جارێک لە خەیاڵمدا تووڕە دەبووم و دەستم دەنایە بینەقاقایان و بێدەنگم دەکردن، پاڵم بەو پیاوە ناوشانپان و دشداشەلەبەرانەوە دەنا، کە لە چەقی ئەو کۆڵانە بەرتەسکەدا بە کۆمەڵ ڕاوەستابوون، بە دەنگی بەرز لەگەڵ یەکتردا دەدوان.

ئەوەی لەو جەنجاڵییەدا تۆزێک هێزی بەبەرەوە دەدام، بانگی لێ دەکردم و بەئاگای دەهێنامەوە، دەنگی ئەو موزیک و گۆرانیبێژانە بوون، کە لەناو ژاوەژاوی ئەو قەبرە پڕ مرۆڤەدا، بەردەوام زریکە و شین و واوەیلایان بوو.

کاتێک لە کابرا نزیک بوومەوە، توند دەستم لە قەراغی کۆڵەپشتەکەم لە شانی کابرا گیر کرد، کاتێک ئاوڕی لێ دامەوە، پێم وت، 'بوەستە، بوەستە، من نە پێویستیم بە تاکسییە و نە بە یارمەتیی تۆیش ڕازیم.'

کابرا بە سەرسامییەکەوە لێی ڕوانیم و بە هێمنی وتی، 'بۆ خاتری خوا، میستەر، سەبرت بێت، لە کۆتای ئەم کۆڵانە، تاکسیەکەم ڕاگرتووە.'

دیسان پێشم کەوت و دەستی کردەوە بە ڕۆیشتن، لە کۆتایی کۆڵانەکە، کەوتینە سەر ڕاستە شەقامێکی دووڕێچکەیی، شەقامەکە بە ڕیزێک دارخورما، کە لەسەر شۆستەیەکی باریک نێژرابوون، کرابوو بە دوو بەشەوە، تیشکی خۆر و تەپوتۆز، ڕەنگیان لە دارخورماکان بریبوو، هەردوو ڕێچکەی شەقامەکە پڕ بوون لە پاس و تاکسی و ماتۆڕ، لەبەر جەنجاڵی، بەردەوام هۆڕنیان لێدەدا، لەو دەمەدا بە خۆم وت، 'پێدەچێت لایەنگرانی زەمالیک و ئەهلی بن ئاهەنگ بگێڕن.'

کابرا بێ ئەوەی سەیری لای ڕاست یان چەپی بکات، بەناو جەنجاڵیی شەقامەکەدا پەڕییەوە، چەند جارێک هەنگاوم نا و ویستم دوای بکەوم، بێهێزی ئەژنۆم و زۆری و خێرالێخوڕینی ئۆتومبێلەکان، تاوێک لەسەر ئەو شۆستەیە و لەبەر تیشکی ئەو خۆرە گەرمەدا، دەستەونەزەر ڕایان گرتم، کاتێک کابرام بینی لەوبەری شەقامەکەوە بەلای ڕاستی شەقامەکەدا تێپەڕی، دیسان گوڕم دایە بەر خۆم و چەند هەنگاوێک چوومە سەر شەقامە قیرەکە، خێرا بنی پێڵاوەکانم لە نەرمیی قیرەکەدا نوقم بوون، دیسان بۆنی قیری تواوە و دووکەڵی ئەکزۆزی ئۆتومبێلەکان

لەگـەڵ هـاڵاوی لەشـی خۆمـدا سـێیەکانمیان قانـگ دا. تیشـکی خۆرەکـەیش، بـەردەوام دەیکوڵانـدم، ڕاپـەڕیم لـەو ئوتومبێلانـەی ڕاستەوڕاسـت بـە هـۆڕن لێـدان بـەرەو ڕووم دەهـاتن، ناچـار گەڕامـەوە سـەر ئـەو شۆسـتە کۆنکرێتـەی وەکوو مـن ڕۆحـی پڕ بووبوو لـە هـاڵاو و گـەرمیی خۆرەکە و داخ بووبـوو، بە ڕاسـت و چەپمـدا چـاوم بـۆ خـەتی پەڕینـەوە گێـرا، بینـیم بەدرێژایـی ئـەو شـەقامە هـەر خـەڵک بـوو بـە هەڵـەداون و پەلـەپروزکێ بەنێـوان ئوتومبێلەکانـدا ڕایـان دەکـرد و دەپەڕینـەوە، شۆسـتەکان گـەرمیی خۆیان لەسـەر پێڵاوەکانمـەوە گەیانـدە پێیەکـانم و لەتـاوا یەک یەک پێیەکانم بە نۆرە هەڵدەبڕین.

کابرام لە چاو ون بوو، هەتاوەکە یەکڕاست لـە ڕوخسـاری دەدام، ناچـار بـووم بـە چـواردەوری خۆمـدا بـۆ سـێبەرێک بگـەڕێم، لـەو کاتەدا بە خۆمم دەوت، 'کوڵەپشتەکەم تازە فەوتا و بەتـەمای نـەبم باشترە.'

سـەرم گێـژی دەخـوارد و بـێ وزە بـە چـواردەوری خۆمـدا دەخولامەوە، گەرماکە تەواو کاری لە ڕۆحم کردبوو، ئەژنۆم تێک دەئاڵان و لـەوە زیاتر جەسـتەمیان لەسـەر خۆیـان پێ ڕانـەدەگیرا، لەتـاو سەرئێشـە و تینـی گـەرمی تیشـکی خۆرەکـە، چـاوم بـۆ هەڵنەدەهات، بێجگە لـەو وروژانـەی ڕۆحـم، کە لـەناو فرۆکەکەوە تـاکوو ئـەو سـاتە دانەدەمرکایـەوە، لـە خەیاڵمـدا چەنـد جارێک لـە پۆلیسـخانە بـووم و شـکاتم لـە کـابرا دەکـرد و یەخـەیم گرتبوو و لەگەڵێدا کەوتبوومە شەڕ، لەو دەمەدا لەسەر شۆستەکە، لەتەنیشت سـتونێکی ئاسـنینەوە ڕاوەسـتابووم، وا داخ بووبـوو، نەمـدەتوانی شـانمی پێـوە بنـێم، چەنـد بـۆردێکی ڕووە و شـەقامەکەی پێـوە

هەڵواسرابوو، بۆردەکان سێبەرێکی لاکێشەی باریکیان کردبووە سەر شۆستەکە، تاوێک دەموچاوم خستە بەر سێبەری، چاوم لەوبەر شەقامەکە بڕی و هەستەکانی ترم لەنا و خۆمدا ڕاگرتن، لە قووڵای خەیاڵ و یادەوەرییەکاندا دەگەڕام، گوێم لە هۆڕن لێدان نەما و لووتم بۆنی قیر و دووکەڵی ئەکزۆزی ئۆتومبێلەکانی لێ بڕا، لەشم سارد بووەوە و ئیتر هەستم بە گەرمیی تیشکی خۆرەکە نەدەکرد، بەڵام هێشتا سییەکانم پڕ بوون لە هالاو و گەرمی و بۆگەن، کەنفت و پرزە لێبڕاو، لە خەیاڵمدا دەم وت، 'ئەمەیە، نهێنی و هێزی تیشکی خۆر، چۆن لێرەدا دوور لە دایکم و هاوڕێکانم، دەسووتێم، لەناو خۆمدا دەتوێمەوە و خۆم ڕادەستی تیشکی خۆرێک دەکەم، کە هەردەم بۆ مرۆڤایەتی سەرچاوەی ژیانە.'

لە بێزاریمدا، لەو ساتەدا بە خەیاڵ، وەکوو مارمێلکەیەکی بیابان خۆم بچووک دەکردەوە و لە شەڕ و بەرەنگاری لەگەڵ خۆردا دۆڕام و پاشەکشەم دەکرد و لەژێر لم و دار و پەردووی ئەو ناوەدا، خۆمم مەلاس دەدا، چاوم لێک نا و ڕۆحم لە سێبەر و تاریکیی ناو لەشی خۆمدا مات دەکرد، ترسی کۆتاییەکی کارەساتبار خزایە ناو دەروونمەوە، بێهوودە ڕۆحم لە جەستەی تواوەمدا، مان بگرێ و لەو وڵاتی خۆرەدا تەنیا و غەریب بکەوێت. هەستەکانم تەواو لە چواردەورم دابڕان، ئەوسا ئەوەندە بێئاگا بووم لە خۆم، نازانم، بۆ بە خەیاڵ گەڕامەوە بۆ ئەو ڕۆژەی لە کەناری دەریا بەتەنیا دەگەڕام.

ڕۆژێکی سارد و باراناوی بوو، باوبۆران، بۆن و هالاوی سوێریی ئاوی دەریاکەی دەدا بە ڕوومدا، کزەهەوایەکی سارد و بۆنێکی

شـێداری خوێیـاوی، یادەوەرییـەکانمی گەڕانـدەوە بـۆ ئـەو ڕۆژە، 'هەوایـەکی شێداری سـاردی بارانـاوی دای بـە ڕوومـدا، هەناسـەم لەسەر سنگمدا پەنگی خواردبوو، ئەو ڕۆژە بوو، کە دایکم دوای چەندین نەشـتەرگەری، لـە نەخۆشـخانەی دانهـاخ زەلیل کـەوتبوو، زیاتر لە شەش مانگی ئەو ساڵەی لە نەخۆشـخانە بـردە سـەر، ئـەو ئێوارەیە، پاش مشتومڕم لەگەڵ دایکمدا بەجێم هێشت و چووم بۆ سـەر کـەناری ئـەو دەریایـەی، کـە ئـەو نەخۆشـخانەیەی دەکەوتـە سـەر، دایکـم تـەواو لـە ژیـان بێـزار و بێهیـوا بووبـوو، ئەوسـا پزیشکەکان تەنها بەختی لە سەدا سیی ژیانیان پێ دابوو، بەبیرم دێـت، ئـەو ڕۆژە دایکـم پێـی وتـم، 'مـارتن، ئەگـەر تـۆ ڕازی بیـت، دەمـەوێت لـە مـاوەی بیسـت و چـوار سـەعاتی داهـاتوودا، بـە یارمەتیی پزیشک، کۆتایی بە ژیانی خۆم بهێنم.'

دایکم، ئەو ڕۆژە، داوای مردنی لێ دەکردم، دەمزانـی مـن ئـەوم بـە ژیانەوە گرێ داوە، ئەگینا ئەو دەمێک بوو ڕۆحی لـە جەسـتەی پڕ لە ژەهر و ئازاریدا دەفڕی.

ئەوسـا هـیچ وەڵامێکـی دایکـم نەدایـەوە، لـە باڵاخانـەی نەخۆشـخانەکە دەر چـووم و بڕیـارم دا بەدرێژایـی ئـەو کـەنارە پیاسە بکەم، بە خۆمم وت، 'کاتێک دەگەڕێمـەوە، کـە وەڵامێکم بۆ دایکم پێ بێت.'

ئـەو کـەنارە لـە مـن زیـاتر کەسـی تـری لـێ نـەبوو، بـاوبۆران و سەرماکەی بە شێوەیەک بوو، کە لەتاوان هەموو خەڵکی خۆیان لە ماڵەکانیان توند کردبوو، کۆشک و قاوەخانە و چێشتخانەکانی ئـەو کـەنارە هـەموو داخرابـوون، ڕەشـەبا ئـاڵا و تەختـەی ڕیکلامـی کۆشـکەکانی هێنـابووە هەلەکەسـەما، شـەپۆلی ئـاوی دەریاکـەیش،

کەف و زەرداوی خۆی بە ڕووی کەنارە لمینەکاندا دەدا.
بێ ئارام و دڵگەرم، تاوێک بەو کەنارەدا گەڕام، جارجار شەپۆلەکان فرسەتیان لێ دەهێنام و خۆیان بە قاچ و قولمدا هەڵدەزنا و تەڕیی خۆیان لەسەر پانتۆڵەکەمەوە دەگەیاندە سەر پێستم. گوێچکەماسی و بەردی ڕەنگاوڕەنگی شۆراوە، سەرنجیان ڕاکێشام و تاوێک لەسەر ئەژنۆ دەستم کرد بە کۆکردنەوەیان، هەردوو گیرفانی پانتۆڵەکەم لێ پڕ کردن، بەنیازی ئەوەی بۆ دایکمیان بەرمەوە، بەبیرم دێت، ئەو دەمەی لەسەر کەناری دەریا دەبووین، دایکم کۆی دەکردنەوە و لە ماڵەوە، لە کارە هونەرییەکانیدا بەکاری دەهێنان.
نازانم چەندێک بوو لەوێدا بێدەنگ لەبەر ئەو باران و سەر لمە تەڕەدا چۆکم دادابوون و دۆش دامابووم. بێوچان لە چەند وردەزیخێکی ڕەنگاڵەم دەڕوانی، پاشان چنگم لێ پڕ دەکرد و یەک یەک لە ئاوەکەم دەهاویشتن. شەپۆلەکان زووزوو بەسەر ڕانەکانمدا دەڕژان، ناوبەناو دایکم خۆی لە خەیاڵەکانمدا قوت دەکردەوە و بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە بانگی لێ دەکردم، 'ئیزنم بە، ئازیزەکەم، دەستم لێ بەر بدە و مردنم پێ ڕەوا ببینە، شێرپەنجە خواردوومی و زۆر ئەشکەنجەی ڕۆحم دەدات.'
هەستامەوە و پاشەوپاش گەڕامە دواوە و ویستم بۆ لای دایکم بگەڕێمەوە، پاش تاوێک، سەرسام و دڵسارد، دەستم توند لەیەک هەڵپێکابوون و لە دوورم دەڕوانی، لەناو خۆمدا شەپۆلی دوودڵی و نەزانین، پەنجەیان لە دیوارەکانی ڕۆحم دەژەنی، بە جۆرێک، سست لە جێگەی خۆم دەستەونەزەر ڕاوەستابووم، بێزاریم، سنووری پێڵووی چاومیان دەلەرزاند، بێ ئەوەی هیچ دەستەڵاتێکم

بەسەر خۆمدا هەبێت، خێرا پێیەکانم بەدوای یەکدا هەڵگرتن و بە قین و قەهرەوە، بەرە و قوولایی دەریاکە بە ڕاکردن چووم، بەسەر شەپۆلەکاندا بازم دەدا، لە کاتی ڕاکردنمدا، بەر چەندین شەپۆلی گەورە کەوتم، ئەو شەپۆلانەی تا دەگەیشتنە کەنارەکە، بێهێز و بچووک دەبوونەوە، خۆیان بەسەر سنگ و ڕوخسارمدا دەدا. هێز و ساردیی ئەو شەپۆلانە، هەناسەمیان توند کرد و سوێراوی خۆیان گەیاندە ناو خوێنم. ئەوەندە چوومە قوولاییەوە، کە پێیەکانم ئیتر ڕووی زەوییان نەدەگرت، جووڵەم لە خۆم بڕی و هێواش هێواش بۆ قوولایی و ژێر ئەو ئاوە سوێراو و ساردە داخزام، تاوێک لە بن ئاوەکەدا خۆم مات کرد، هەستم کرد سییەکانم پڕ بووبوون لە سوێراو، چاوەڕوانی بووم، ئاخۆ کەی بە ڕووی مردن خۆیدا دەتەقیم، تاوەکو هەستی پێ بکەم، بیچێژم، ئەگەر تەنها بۆ هەناسەیەکیش بێت، بەڵکوو لە نهێنیی مردن تێبگەم، مردنێک، کە دایکم بە پەرۆشەوە داوای دەکرد.
گەردیلەی ئاوە ساردەکە وەکوو دەرزی لە خۆیان دەئاژنییە جەستە و بەئاگایان دەهێنامەوە، نەیاندەهێشت ڕوو بدات. هەستێک لە قوولاییمەوە وزە و گەرمیی دەدایەوە بە جەستەم و پابەندیان دەکردمەوە بە ژیان، فەرمانی دەدا بە دەست و قاچەکانم تا بجووڵێن، چەند شەپۆلێکیش ڕووەو کەنارکە پاڵیان پێوە دەنام، تووڕەبوونێک، هەموو ماسولکەکانمیان گرژ کرد و هەنووکە گوڕیان دەدایەوە بەرم. هێزێک، کە ڕۆحم غەریب بوو پێی، نازانم، ج پابەندبوونێکم بە ژیانەوە گلیان دامەوە و ڕێگر بوون، هەنووکە ئیرەیی بەو ڕۆژە دەبەم، کاتێک گەیشتمەوە کەنارەکە، لە تەڕیی جلەکانی بەرم شڵپەم دەهات، بە کەنارەکەدا دەستم کرد بە

ڕاکردن، پڕ بووم لە وزە و هەستم بە ماندووبوون نەدەکرد، وەکوو جوانوویەکی چەند مانگە، بەو کەنارە چۆڵ و تەڕەدا ڕەوتم دەکرد و غارم دەدا، نازانم چەند و بەدرێژایی چەند کیلۆمەتر بەسەر ئەو لمە تەڕ و شێدارەدا ڕام کرد، پێیەکانم نەیاندەویست ڕابوەستم، هەنگاو لەدوای هەنگاو بەردەوام بوون، تاوەکوو کەنارەکە تاریک داهات و دەریا شەپۆلەکانی خۆی کۆ کردەوە و بێدەنگی ئەو ناوەی داگرت، ئیتر ئەوەی گوێم لێ بوو، تەنها لێدانی ترپەی دڵی خۆم بوو. لە تەڵخی و لەناو تەنیایی و سنووری زەوی و دەریادا، ئەژنۆم دادان و خۆم بەسەریاندا نوشتاندنەوە، لەناو ئارەقی جەستەم و تەڕی و شێی ئەو کەنارەدا، خۆم لێ گرمۆڵە کرد.

تەزوویەک بە لەشمدا هات، هەستم بەوە کرد، کە چۆن دوو دەست بنباڵیان گرتم و بە هێزێک توند هەڵیان بڕیم، چی ڕووی دابوو، من لەکوێ بووم و ئاخۆ کێ بەهانای منەوە هاتبێت، هەوڵم دا چاوم بکەمەوە، تا بزانم کێ لە چواردەورمە، سەرم قورس و ماسولکەی پێڵووی چاوم ئەوەندە بێهێز بوو، نەمتوانی هەڵیان ببڕم، جەستەی بێوزە و نیوە مردووم بۆ نەجوولا، ناچار خۆم ڕادەستی ئەو هێزە کرد، لە باوەشی گرتم و لەسەر دۆشەکێکی نەرم دای نام، گردەکانی سمتم دەکزانەوە و ئازاری سووتانیان هەبوو، گوێم لە دەنگی مەکینەی ئوتومبێلەکە بوو، پاشان تۆنی دەنگی ئەو گۆرانیبێژەی پێشتر لە بازاڕە جەنجاڵەکەدا گوێم لێ بووبوو، ئەو دەنگە غەریبەی ڕۆحم ئاشنا نەدەبوو پێی.
لە کاتی لێخوڕینی ئوتومبێلەکەدا، بەردەوام بە ڕاست و چەپمدا

دەکـەوتم، بـۆنی جگـەرە و شـینوواوەیلای گۆرانیبێژەکـە رایـان پەڕانـدم، دیسـان لەگـەڵ گـەرمادا کەوتمـەوە جـەنگ، بـەردەوام لـە قومێک هەوا دەگەڕام، ئەو هەوایەی لە لووتەکانمەوە بەناو قورگە وشک و ئازاراویەکەمدا بۆ ناو سییەکانم گوزەریان دەکرد، هەستم دەکرد کە تـەنها دووکـەڵی جگـەرە بـوو، زووزوو هێڵنجم دەدا و تالاوێک شـەپۆلی دەدا، تـا دەرگـای قـوڕگم و لـە گەدەمـەوە تـاڵیی خۆی دەگەیاندە ناو دەمم. جارجار لە هۆش خۆم دەچووم و ئاگام لـە چـواردەورم نـەدەما، دیسـان نەغمـەی دەنگی ئـەو گـۆرانیبێژە، گوێیان پڕ دەکردم و رایان دەپەڕاندم، نەمدەزانی چی دەڵێت، بەلام دەنگـی وەکـوو تـۆنی دەنگـی دایکـم، رۆحمیـان بـە ژیـانەوە دەبەستەوە.
ئوتومبێلەکە وەستا، پاش تاوێکی کەم، دەرگای لای دەستی چەپم کرایەوە، هـەر ئەوەندەم بەرگوێ کـەوت، 'میسـتەر، میسـتەر، ئـەوە گەیشتینە ئوتێل.'
چاوم بۆ هەڵنەدەهات، لە خەیاڵی خۆمدا لە وەلامێک دەگەڕام، فریا نەکەوتم و لەپڕێکدا دوو دەستی بەهێز کەوتنە بنباڵم و توند بۆ دەرەوەی ئوتومبێلەکـە رایکێشـام، دیسـان هەسـتم بـە گـەرمیی خۆرەکـە دەکـردەوە، تیشـکەکانیان دەچەقاندنـەوە سـەر پێسـتم، کەسێک وەژێر باڵم کەوتبوو، دەستێکیشی لـە کەمـەرم هـەڵپێکابوو و لە زەویی هەڵبڕیبووم، جارجار نووکی پێکانم لـە ئـەرزیان دەدا، گـــوێم لـــە دەرگایـــەک بـــوو، لەپێشـــماندا والا بـــوو، لـــە چوونەژوورەوەماندا راچڵەکیم، بەو هەوا ساردەی دای بە روومدا، گوێم لـە دەنگی ئێرکۆندێشنـەکان بـوو، کە بـە بەرزییـەوە، وەکوو ئـەوانیش لـەو گەرمایـە تـووڕە بـن، دەیاننەڕانـد، بـە سەرشـانی

کابراوە، پڕ بە سییەکانم هەوای فێنکم هەڵمژی، لەسەر لچ و لێوەکانمەوە تاکوو ناو دەمم کزانەوە، لە تینوواندا شەقار بووبوون، کاتێک لەسەر کورسییەکی نەرم دای نام، وردەوردە هەستەکانم هێزیان تێ دەهاتنەوە و دەمتوانی لە ڕێگەیانەوە چواردەورم هەست پێ بکەم، دەنگی پیاوێکم دەبیست، دیسان بەکزی گوێم لە دەنگی ئەو بوو، ئەو گۆرانیبێژەی لە زەلیلیمدا بەزۆر منی بە تۆنی دەنگی خۆی ئاشنا کرد، بەردەوام پرسیارم لە خۆم دەکرد و لە خۆسازداندا بووم، تاکوو هێز بدەمە بەر خۆم و پرسیارێک لەوانەی چواردەورم بکەم، لە کاتێکدا بە هەردوو دەستم چاوم هەڵگلۆفت و تۆزێک تروسکاییان تێ هاتەوە، هێشتا بەلێڵی چواردەوری خۆمم دەبینی، زەلامێک لەتەنیشتمەوە دانیشتبوو، هەستم بە ئەنیشکی کرد، توند لە قەبرغەمی چەقاندبوو، تۆنی دەنگی گڕی، کە بە زمانی عەرەبی و بە پەلە پەل قسەی دەکرد، لەو دەمەدا گوێم لە دەنگی تەقوهوڕی پێڵاوی کەسێک بوو، پێدەچوو ڕووەو لای ئێمە بێت، کاتێک چاوم لەسەر دوو چاوی ڕەشی بادەمی ڕوون بووەوە، ڕوخساری ئافرەتێکی دەنگ ناسکی ئەسمەری کورتەباڵا، هێندەی میکیاج کردبوو جوانی و گەنجێتیی خۆی پێ شاردبۆوە، کاتێ من لە چاویم دەڕوانی، ئەو دانەوییەوە و بە سینییە بچووکەکەی دەستی، کە دوو پەرداخی پڕ لە ئاوی لەسەر بوو، فەرمووی لێ کردم، خێرا پەرداخە ئاوەکەم توند لەناو دەستم گرت، فێنکیی پەرداخە ئاوەکە، تەزوویەکی ساردیان بە لەشمدا هێنا، خێرا و بەدوای یەک دا، لچ و لێو و ناودەم و قوڕگی وشکم پێ تەڕ کرد، ئاوەکە ئەوەندە سارد بوو، هەستم کرد پڕی کردمەوە لە ژیان و نەختێ هێزی بە بەردا

هێنامەوە، ئینجا ئازارێک لەسەر سنگمەوە بەرە و سەرم هەڵکشا و لەناو کاسەی سەرمدا پەنگی خوارد، هەردوو دەستم توند گرت بە سەرمەوە، تەماشایەکی لای شانی چەپی خۆمم کرد، بینیم شۆفێری تاکسییەکە لە شانمەوە دانیشتبوو، لەو دەمەدا لەگەڵ ئافرەتەکە دەستیان کرد بە قسەکردن، ویستم خۆم تووڕە بکەم و هاوار بکەم بەسەریدا و پەلاماری بدەم، تەنانەت گوڕی تووڕەبوونیشم تێدا نەمابوو، ئەوان بە دەنگێکی بەرز بەسەر یەکتریدا هاواریان دەکرد، تۆنی دەنگیان وەک وردەشووشەی تیژ دەکەوتنە ناو کونی گوێم و خۆیان دەخزانە ناو کاسەی سەرمەوە، هێزم لە خۆمدا کۆ کردەوە و ڕووم لە شۆفێری تاکسییەکە کرد، هاوارم لێ کرد، 'کوا کۆڵەپشتەکەم؟'

لە کاتێکدا ئاماژەی بۆ بەرپێی کرد، بەهێمنی وتی، 'میستەر، ئەوە کۆڵەپشتەکەتە.'

'منت بۆ کوێ هێناوە؟'

هاتە پێشەوە لێم و چاوی بە ڕوومدا دابچڕی و وتی، "الله أکبر، میستەر، تۆ لە ئوتێلیت.'

دەستێکی پان کردەوە و بەرامبەرم ڕای گرت و دووبارە وتی، 'میستەر، یاڵلا، یاڵلا، خێرا کرێکەم بدەرێ...'

گوڕم دایە بەر خۆم و ویستم ڕاست ببمەوە و جزدانەکەم لە گیرفانی دواوەی پانتۆڵەکەمدا دەر بێنم، هێندە بێهێز و پرزە لێبڕاو بووم، نەمتوانی جووڵە بکەم، بە یارمەتیی کابرا، جزدانەکەم دەر کرد و لەنێوان ئەو چەند پەڕەی ئێرۆیانەدا کە لە جزدانەکەم دەرم هێنابوون و بە دەسمەوە بوون، خۆی بیست ئێرۆییەکی دەر کرد، هەستا و دەستی لەنێو دەستم نا، توند دەستمی بە تووڕەییەوە

گوشی، باڵی ڕاوەشاندم، هەستم کرد هەموو ئازارەکانی ناو لەشمی بەئاگا هێنایەوە و لەتاوا چاوم نووقاند، بێ ئەوەی هیچ بڵێت، دەستی بەر دام و بە چەند هەنگاوێک، لە دەرگای ئوتێلەکە چووە دەر و لە چاوم ون بوو.

چاوم لەدوای کابرای شۆفێر بوو، هێشتا قەهر و تووڕەییم لێی نەڕەویبووەوە، ئافرەتی ئوتێلەکە لێم هاتە پێش و لەلامەوە دانیشت و بە ئینگلیزییەکی ڕەوان وتی، 'میستەر، لە ئێستادا ژووری بەتاڵمان نییە.'

لەو دەمەدا، لە چاوی یەکترمان دەڕوانی و پاشان ئەو پرسی، 'دیارە لە بیابانەوە گەڕاویتەوە و زۆر ماندوویت؟'

سەرم بۆ ڕاوەشاند و پێم وت، 'بەڵێ، زۆر ماندووم.'

'ئایا دەتوانیت لەگەڵ کەسانی تردا، لە ژوورێکدا تەنها شەوێک بگوزەرێنیت؟'

سەرئێشە و ئازاری گیانم، حەوسەڵەیان لێ بڕیبووم، لە ناخمەوە بە جۆرێک وورووژابووم، بەردەوام لەگەڵ وەیشومەدا لە کێبەرکێدا بووم، هەر بۆیە لە ناچاریمدا بە خۆمم وت، 'هەرچۆنێک بێت، جێگەیەکم دەست بکەوێت، سبەینێ لە ئوتێلێکی باشتر دەگەڕێم.'

سەرم بۆ لەقاند، 'باشە، باشە، کێشە نییە و ڕازیم.'

هەستا، ڕۆیشت و پاش کەمێک گەڕایەوە و داوای لێ کردم پاسپۆرتەکەمی بدەمێ و زیاتری وت، 'بمبوورە، دەتبینم چەند ماندوو دیاریت، بەڵام پێویستە ناو و ناونیشانی تەواو تۆمار بکەم، لە وڵاتی میسر، یاسا گرنگە و ناتوانین فەراهەمی بکەین!'

بێ ئەوەی هیچ بڵێم، پاسپۆرتەکەم دایە دەستی و سەرم بۆ لەقاند، دووبارە ئەو وتی، 'میسر خۆشە؟'

'بێوێنەیە لە گەرمادا.'

'مەبەستم بیابان نەبوو.'

بێ ئەوەی هیچ بڵێم، سەرم بۆ ڕاوەشاند.

لە کاتی تەماشاکردنی پاسپۆرتەکەمدا، هەڵوێستەیەکی کرد و سەری چەند جارێک با دا، هەستایەوە و چوو بۆ نووسینگەکەی، کە بەرامبەرم بوو هەر دە مەترێک دوور بوو لێمەوە، لەوێ لەگەڵ ئەو کابرا گرگنەی تاوێک بوو لەولامانەوە بێدەنگ دانیشتبوو، پێکەوە لە پاسپۆرتەکەمیان دەڕوانی، نائاگا و بێ ئارام، دووراو دوور لێم دەڕوانین، پاشان ئافرتەکە پێکەوە لەگەڵ کوڕێکی گەنجدا، کە نازانم لە کوێوە پەیدا بوو، گەڕایەوە، گەنجەکە قاتێکی شین و بۆینباخێکی زەردی پەپوولەیی لە ژێرچەنەی بەستبوو، کڵاوێکی لە ڕەنگی جلەکانی لەسەردا بوو، ئافرەتەکە پاسپۆرتەکەی دایەوە دەستم، 'میستەر، ئەم گەنجە ڕێنماییت دەکات بۆ ژوورەکەی خۆت.'

کۆڵەپشتەکەمی لە بەرپێمدا هەڵگرت و داوای لێ کردم، کە دوای کەوم، کاتێک ویستم هەڵسم و دوای گەنجەکە بکەوم، نەمتوانی لە جێگەی خۆم ببزوێم، لەو دەمەدا، کوڕە گەنجەکە گەڕایەوە و ڕووی تێ کردم، 'میستەر، دەتوانم یارمەتیت بدەم؟'

سەرم بۆ لەقاند و پێم وت، 'بەڵێ، بە سوپاسیشەوە.'

هاتە ژێر باڵم و ڕاست هەڵی ساندمە سەر پێیەکانم، ئەژنۆم دەلەرزین و پێیەکانم ئازاریان دەهات، وەک بڵێی لەنێو پێڵاوەکانمدا ئاوسابن، گەدەم دەکوڵا، لەوەدا بووم بڕشێمەوە، لەتاو ئێشی سەرم، توند خۆم نووساند بە کوڕە گەنجەکەوە و بە دەستێکم سەرشانیم گوشی، ئەویش بە تەوسێکەوە سەیرێکی

کردم و دیسان بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن. پاش ئەوەی بەسەر پلیکانەیەکدا سەرکەوتین بۆ نهۆمی دووەم، چووینە هۆڵێکی بەرتەسکەوە، ئەمبەرە و ئەوبەری هۆڵەکە، چەندین دەرگای ڕەشی هاوشێوە بوون، پاش ئەوەی لە بەردەرگایەک وەستا و کۆڵەپشتەکەم، کە بەدەستی چەپیەوە بوو، لە بەرپێماندا دای نا، بە لەپی دەستی، چەند جارێک لە دەرگاکەی دا، ئەوەندەی نەبرد دەرگاکە کرایەوە، دوو گەنجی پێست سپیی قژ ڕەشی گرگنە، لەناو دەرگاکەدا قوت بوونەوە، پاش ئەوەی تاوێک بە زمانی عەرەبی لەگەڵ یەکتردا قسەیان کرد، بە دوودڵی و تووڕەییەوە چوونە لاوە و ڕێگەیان پێ داین و چووینە ژوورەوە، کوڕە گەنجەکە منی گەیاندە سەر جێگەیەک، یەکێک لەو سێ جێگەیەی لە ژوورەکەدا بوون، ویستی قسەم بۆ بکات و لەسەر ژووری ئوتێلەکە زیاتر زانیاریم بداتێ، بەڵام دوو هاوژوورەکەم بواریان پێ نەدا و لێی هاتنە پێش، بە دەنگی بەرز بەسەریدا دەیاننەڕاند و زووزوو دەستیان بەرەو ڕووم ڕادەکێشا، تاوێک بوو هەرسێکیان بەسەرمەوە ڕاوەستابوون و لەگەڵ یەکتر قسەیان دەکرد، هەستم بە ئازارێکی گورچکبڕ دەکرد، سەیرێکی دەستوپلی خۆمم کرد، بینیم چۆن پێستم سوور هەڵگەڕابوو، هێزی ئەوەم تێدا نەمابوو، لەسەر قنگم دابنیشم، دەستم توند بەگوێمەوە گرت و لێی پاڵ کەوتم و چاوم لێک نا، کز، زۆر کز، گوێم لێ بوو ئەوان هێشتا هەر بەسەر یەکدا دەیاننەڕاند. پاش تاوێک، هەرسێکیان لە ژوورەکە چوونە دەرەر و دەرگاکەیان بەدوای خۆیاندا داخست، ژوورەکە بێدەنگ بوو، ئینجا لەتاو ماندوێتی و ئازاری ڕۆحم، چوومە خەوێکی قووڵەوە.

لەتاو ئازاری شانەکانم بەئاگا هاتمەوە، بەئەستەم چاوم هەڵبڕی و سەرنجم دا، ئەو دوو کوڕە گەنجەی لە ژوورەکەدا لەگەڵمدا بوون، لەسەر قەراغی جێگەکەم دانیشتبوون و ئەملاولایان لێ گرتبووم، زۆرم لە خۆم کرد و بەزەحمەت ڕاست بوومەوە و لەنیوانیاندا دانیشتم، بێوچان بە سەری پەنجەکانیان تێوەیان دەژەندم و پێدەکەنین، ئەوەندە قووڵ پێدەکەنین، زووزوو بە لەپی دەستیان، تەڕیی چاویان دەسڕی، پڕ بە ژوورەکە قاقایان لێدەدا، تاوێک بە سەرسوورمانەوە یەک یەک لێم دەڕوانین، ئەوی لای شانی ڕاستم، سەرنجم دا بەکراوەیی پاسپۆرتەکەمی لەناو دەستدا بوو، بە دەنگی بەرز دەستی کرد بە خوێندنەوەی، 'سەلەمۆ مارتن.'
بەردەوام بوو، 'بیستی هەشتی ساڵی ١٩٧٨، ئەمستردام.'
بەدەم پێکەنینەوە، بەردەوام بوو و وتی، 'ڕەگەز، پیاو، درێژی، مەتر و هەشتا، تەواون ئەمانە، وا نییە، وا نییە؟'
هەوڵم دەدا لە خۆمدا وەڵامێک ئامادە بکەم، لە ڕستەیەکی شیاو دەگەڕام، کاتێ ئەوان بەردەوام بە زمانی عەرەبی لەگەڵمدا دەدوان، زووزوو بە وشەی 'میستەر' هاواریان دەکرد بەسەرمدا و وەکوو دڕندە دەیاننەڕاند، قاقایان لێدەدا و بەردەوام تێوەیان دەژەندم، چەند جارێک ویستم خۆمیان لێ تووڕە بکەم، یان پێم وا بێت لەو ساتەدا ویستم داوای یارمەتییان لێ بکەم، بەڵام هەستم دەکرد گەرمی و تیشکی خۆر، هەموو هێز و وزەیەکیان تێدا سووتاندبووم. لە هەموو شتێک بەتاڵیان کردبوومەوە، بەتایبەتی، لە ڕەوشتی مرۆڤانەم، قەهرێک هێدی هێدی لە ناخمەوە دەکولا و دەبوو بە گڕ و هالاوی گەرمی لە دەم و لووت و گوێمەوە دەر

دەچوو، ئەوانیش، تا دەهات، زیاتر تەنگیان پێ هەڵدەچنیم و بێزاریان دەکردم، بە جووت بەدەم قاقالێدانەوە ئەوەندە لێم هاتبوونە پێش، بۆنی نیکۆتین و ئەلکحولی هەناسەیانم دەکرد، دەموچاوی پڕ لە ڕق و گاڵتەئامێزیان، دەستیان لە قوڕگی هەستەکانم دەنا، دەستم بە گوێمەوە گرت و چاوم توند داخست، خۆم بەسەر ڕانەکانمدا چەماندەوە.

تووشی سام و دڵگوشینێک بووبووم، هەتا دەهات، زیاتر پڕ دەبووم لە هەراوزەنای ئەوان و لە خۆم و لە چواردەرم بێئاگا دەبووم.

٦

# خنزير

کاتێک لە قووڵایی خەوێکی قورس ڕابووم، هەناسەم سوار و لە ناو ئارەقی خۆمدا خوسابووم.

لەناکاو ڕاپەڕیم و خۆم ڕاست کردەوە، چاوم بە تاریکیی چواردەورمدا گێڕا، زووزوو ئەو پرسیارەم لە خۆم دەکرد، 'ئەمە خەونە یان ڕاستییە، من لەکوێم؟'

ئەرزەکەی ژێرم تەڕ و شێدار بوو، لەناو ڕەشی و تاریکیی چواردەورمدا نوقم بووبووم، کاتێک بە چواردەوری خۆمدا چاوم گێڕا. بۆرییەک ڕووناکی لە بەرزییەوە بەخڕی داگەڕابوو بۆ سەر دیوارەکەی پشتم، بێدەنگییەکی سامناک دەستی نابووە بینی هەموو جووڵە و دەنگێک لە چواردەورمدا، ئەو بێدەنگی و تاریکییەی تێی کەوتبووم، پڕیان کردبووم لە بێهوودەیی.

بە سام و بێزارییەکەوە هەستامە سەر پێ، هەنگاوێکم نا بۆ لای چەپم و دەستم کوتا و سەری پەنجەکانم بەر دیوارێک کەوتن، بە نائارمییەکەوە خێرا دەستم کرد بە گەڕان، هەردوو لەپی دەستم

پـان کردنـــەوە و بەسـەر ڕووی دیـوارە ڕەق و ڕووگرژەکـەدا گێڕامن، هەنووکە پەنجەکانم بەر چاڵوچۆڵی دەکەوتن، گەیشتمە سەر دەرگایەکی ئاسن، کە نیوەی ئەو لادیوارەی پێک هێنابوو، پێم وابێت لەو کاتەدا خێرا بەدوای دەسکێک یان کێلونێکدا گەڕام، تاکوو بزانم لە دەرەوەی ئەو جێگە بەرتەسک و تاریکە چ باسە، بەڵام لە چەند قوبەی برغویەک زیاتر، هیچی کەم بەردەست نەکەوت، ژوورێک، هەر دوومەترێک پانی و درێژییەکەی بوو، بەرزییەکەی لەو تاریکییەدا، بە هەزاران کیلۆمەتر دەبوو.

پێشتر خەونی وا گران و ناخۆشم نەدیبوو، بەبیرم نەدەهات ئاخۆ کەی ڕۆحم ئەوەندەی ئەو کاتە بێ ئارام بووبێت، تاوەکوو لەدەست مردن هەڵبێت، هاوشێوەی گیاندارێکی بریندار، کە بێوچان بەدەوری خۆیدا بخولێتەوە، پڕ بە قرڕگم بانگم دەکرد و توند بە لەپی دەستم بە ڕووی دیوار و ئاسنی دەرگا ساردەکەمدا دەکێشا. ئینجا بەبێ هیوا پاڵم بە دیوارەکەوە دا و پێی دا شۆڕ بوومەوە، لەسەر ئەو ئەرزە کۆنکرێتە سارد و شێدارە لێی دانیشتم، هەوڵم دەدا بگەڕێمەوە ناو خۆم و تاوێک بیر بکەمەوە، لە ڕێگەی خەیاڵەکانمەوە بگەڕێمەوە بۆ ناو یادەوەرییەکانی ڕابردووم. بێدەنگ باڵم توند لەبەر ئەژنۆم هەڵپێکان و سەرم لەنێوانیان ڕاگرت و چاوم داخست، نەمدەتوانی پەیوەندی لەگەڵ خەیاڵمدا دروست بکەمەوە و بەتەواوەتی لێی دابڕابووم، لەنێو خۆمدا، بۆ تەنها وێنەیەک لە سۆراغدا بووم، بەتاڵ بووم، بەتاڵ لە هەموو شتێک، بەتاڵ لە هەموو یادەوەرییەک.

لە بێدەنگیی چواردەورمدا، گوێم لە دەنگی دڵی خۆم بوو، لە قەفەسەی سنگمدا پەلی دەکوتا و خێراتر لە هەموو کاتێکی تر لێی

دەدا، زۆری پێ نەچوو، لە خۆمدا گیرم خوارد و بێهۆش کەوتم، یان پێدەچێت ئەوسا خەوم لێ کەوتبێت.

نازانم چەندێک لە خۆم و چواردەورم بێئاگا بووم، کاتێک دووبارە لە تاریکیدا بەئاگا هاتمەوە. بە پەلەپڕوزکێ گورپم دایە بەر خۆم و چووم ڕوخسارم خستە بەر ئەو ڕووناکییەی لە دیوارەکەی دەدا، ئەو ڕوناکییەی فۆرمی پەنجەرە خڕەکەی وەر گرتبوو، هاوشێوەی بۆرییەکی شووشە، کە تەنها ڕووناکیی خۆی دەدا بە دوو بست لە دیوارەکە، هەستی بینینم بەدرێژایی باڵای ئەو ڕووناکییەدا هەڵزنی و تا هێزی چاوم بڕی کرد، تا ئاستی دوورترین ئەستێرەم نارد، تاوێک بوو بە خەیاڵ بەناو ئەستێرەکاندا دەفڕیم، ئەوەی گەڕاندمیەوە ناو ئەو بەندی و تاریکییە، ڕژانی لەناکاوی فرمێسکی چاوم بوو، کە سوێراوی خۆیان ڕژاندە سەر لێوە وشکەکانم.

هێزم لە خۆمدا کۆ کردەوە و دیسان، ڕووبەڕووی ئەو دەللاقە بچووکە ڕوانیم، لە ڕێگەی خەیاڵمەوە دەمویست پەیوەندی لەگەڵ ئەستێرەکاندا بگرم، هەتا دواتنۆکی وزەم، بانگم کرد، تاوێک توانیم ئەو بێدەنگییەی چواردەوری خۆم بشکێنم و هیچی تر. ئینجا لەتاو ئازاری ملم، تاوێک خۆم نوشتانەوە، کاتێک لە ڕووناکییەکەدا لە جلەکانی بەرمم ڕوانی، ڕاچڵەکیم و زیاتر خۆم هەڵبڕییە بەر ڕووناکییەکە، بینیم قوماشێکی ئەستووری ڕەنگ شین، لای ڕاستی سەر سنگم ژمارە سەد و یازدە نووسرابوو، ئەوسا نەمدەوێرا بیر لەوە بکەمەوە، کە پێدەچێت پۆشاکی بەندینخانە بێت، هەموو هەستەکانم وایان پێ دەوتم، بەڵام نەمویست باوەڕیان پێ بێنم.

دەستێکم لە سەر بۆ خوار بە ئازای خۆمدا گێرا، لام ئاشکرا بوو، پانتۆڵەکەیشم هەمان قوماشی چاکەتەکەم بوو، کوتوپڕ ڕووناکیی

مانگ و ئەستێرەکانم وەلاوە نا و بە دیوارەکەی پشتمدا خۆم داخزاندە خوار، لەناو تاریکیی چواردەورمدا، خۆم مات دا و بێدەنگ لە فرسەتێک دەگەڕام، مەبەستم ئەوەیە، لە قووڵایی خەیاڵمدا دەگەڕام، بەڵکوو لە ڕێگەی وێنەی دیمەنێکی ئەوسامەوە، لە ئێستام تێبگەم. ئەوەندە بێدەنگ، هەموو هەستەکانم لە خامۆشی و تاریکیی چواردەورمدا ڕاگرتبوون، دیسان ماندوو و پرزە لێبڕاو خەوم لێ کەوت.

کاتێک بەئاگا هاتمەوە و بەئەستەم چاوم هەڵبڕی، چواردەورم ڕووناک بووبووەوە، ژوورەکە ئەوەندەی ڕووناکی تێ کەوتبوو، بەس بوو تاوەکوو چواردەوری خۆم ببینم، خۆم بینییەوە لە نێوان چوار دیواری بەرزدا، کە بە بەرزیی بالآیان، بە نووسین ڕەش کرابوونەوە، بەتانییەکی سەوز لە سووچێکی ژوورەکەوە گرمۆڵە کرابوو، ئەرزێکی تەڕ و شێدار، پەنجەرەیەکی خڕی بەرز بە بنمیچی ژوورەکەوە نووسابوو، دەرگایەکی ئاسنی ڕەنگ سەوز و ژەنگاوی، جلەکانم شینێکی تۆخ، ژمارە سەد و یازدە لەسەر چاکەت و پانتۆڵەکەم نووسرابوو، بۆنێکی مردووی خنکێنەر بەسەر سنگ و مەلاشومەوە نووسابوو، کاتێک بەتانییەکەم هەڵگرت، وەکوو قومبەلەیەکی تەوقیتکراو تەقییەوە و بە تەپوتۆزی خۆی، ژوورەکەی قانگ دا، ناچار بەهێواشی لە جێگەکەی خۆی دام نایەوە، سەرنجم لە دەرگاکە دا، دەللاقەیەکی بچووک دەکەوتە ناوەڕاستی دەرگاکەوە.

پاش ئەوەی تەواو دڵنیا بووم لە بەندینخانەم، بە ژوورەکەدا دەستم بە گەڕان کرد، ژوورێک، کە بە دوو هەنگاو لەوسەری بووم، ئینجا لە پەنجەرەکەوە لە دەرەوەم دەڕوانی، لە پارچەیەک

ئاسمانی شین و دوورەدەست زیاتر، هیچی تری پیشان نەدەدام. نازانم چەنێک بوو لەوێدا چەقیبووم، تەنانەت باڵندەیەکیش چییە، بەوێدا تێنەپەڕی، لە گەرما و بۆگەندا، لەسەر ئەرزە تەڕ و شیدارەکە دانیشتم و لە دیوارە پڕ لە نووسین و هێڵکارییەکانم دەڕوانی، بە چەند ڕەنگێک، سەرتاپای دیوارەکان نووسرابوون، نووسروای کۆن و نوێ، بە چەندین زمان، سەرنجیان ڕاکێشام و چاوم لێ نەدەترووکاندن، لە ڕاستەوە بۆ چەپ بەناویاندا چاوم دەگێڕاو لاپەڕەبەلاپەڕە هەڵم دەدانەوە. هەرچەندە نووسراو و هێڵکارییە نوێکان، کۆنەکانیان داپۆشیبوون. تاکوتەرا نیگار و پۆرترێتیش کێشرابوو، کە زۆریان بووبوون بەژێر نووسینی نوێوە، یان پێدەچوو کات ڕەنگی پەڕاندبن، چەند بوو سەرنجی نووسین و نیگارەکانی سەر دیوارەکانم دەدان، بەتەواوی نایەتەوە بیرم.

لە ناکاو گوێم لە خرەخڕ و دەنگی پێ بوو، کە لەودیو دەرگا ئاسنەکەوە دەهات، بە سەرسامی و دڵ پڕ لە گومانەوە، هەستامەوە و چووم لەپشت دەرگاکەوە ڕاست ڕاوەستام و چاوەڕوان بووم، پاش تاوێک، دەنگی زرەی کلیل و خرەخڕی تاقیکردنەوەیان، لە بێ ئارامیمدا لە دەرگاکە چوومە پێشەوە و بەر بوومە لێدانی، بە دەست و جارجاریش بەبێ ئەوەی گوێ بە ئازاری پێکانم بدەم، خێرا خێرا شەقم لە دەرگاکە هەڵدەدا و بەردەوام بانگم دەکرد، زۆری پێ چوو، دەرگاکە هەر نەکرایەوە، بێدەنگی و چاوەڕوانی ڕۆحی دەکرۆشتم، بیرم لەوە کردەوە، کە دەبێت لە قەبر نرابم و ئەمە دوانزرگەم بێت، دەبێت لە کام قەبرستانی ئەمستردام نێژرابم، بڵێیت ئەو هاتوهاوارە ئەو

پیرێژنانە بن، کە ڕۆژانە لەسەر قەبرستانەکان خەریکی گوڵ ڕواندنن، کاتی خۆی چەندین جار بەدیاریانەوەوە بووم، کاتێک ئەو پیرانە تاکوتەرا لەسەر گۆڕەکان تۆوی گوڵیان دەپرژاند و بە دەنگی بەرز نیازی دڵی خۆیان دەوت، 'تەمەنا دەکەم، تا دەمرم، دەرگای خەیاڵ و یادەوەرییەکانم لێ دانەخرێن.'

لەو کاتەدا چەند جارێک لەبەر خۆمەوە وتم، 'من مردووم، تۆ بڵێیت ئەم جێگەیە قەبرەکەم بێت؟'

بێهیوا و بە دوودڵییەکەوە خۆم بە دەرگا ئاسنەکەوە هەڵپەسارد. کاتێک دەرگاکە لەناکاو کرایەوە، ڕاچڵەکیم و لەنیوان خەیاڵ و ڕاستیدا، پەشۆکابووم، خۆم پێ ڕانەگیرا و بەسەر نووکی پێکانمدا هاتم و بەپێشدا کەوتم، بەسەر ئەو پۆلیسەدا، کە دەرگاکەی کردەوە، ناچار خۆمم بەسەر شانەکانی ئەوەوە گرتەوە، ئینجا ئەویش بە پاڵێک لە خۆی دوور خستمەوە و فڕێی دامە سەر زەوییە سارد و تەڕەکە، کاتێک تەماشام کرد، کابرایەکی سمێڵ ڕەشی کورتە باڵای گرگنە، دەستێک جلی سپیی دەڵبی لەبەردا بوو، تەپلەیەکی ڕەشی لەسەردا و بە پێشی تەپلەکەیەوە، سەرە داڵێکی چەرمی وشککراوی پێوە بوو، تووڕە و هەڵەشە، بێ چەندوچوون پەلاماری دام، دەستی کرد بە شەق تێهەڵدانم، لە بەرئەژنۆم و جارجاریش نووکی پێڵاوە ڕەق و ڕەشە ناقۆلاکانی، بەر سک و سمتم دەکەوت، لەگەڵ هەموو جووڵەیەکیدا، بەتۆپەڵ تف لە دەمی دەر دەپەڕین و دەیاندا بە ڕوومدا، یەک وشە، تەنها یەک وشە، بەردەوام دووبارەی دەکردەوە، 'یا خنزیر، یا خنزیر.'

لە بنباڵیدا دارحەیزەرانێکی ڕەشی توند گرتبوو، بە دەستێکی، کۆمەڵێک کلیل و بە دەستەکەی تری، جامێکی قووڵی فافۆن.

کەوتمە سەر قنگ و ویستم هەستمە سەر پێ و پرسیاری لێ بکەم، لەناکاو بە حەیزەرانەکەی توند لە ناوچەوانمی سرەواند، ئینجا جامە فافۆنەکەی فڕێ دایە بەردەمم، جامەکە چەند جارێک خولایەوە و وەکوو من، لەسەر قنگی خۆی ڕاوەستا، لە خەیاڵمدا پرسیارێکم ئامادە کرد، دیسان گوڕم دایە بەر خۆم و ڕووم تێ کرد، ئەو خێرا هەنگاوێکی نایە ئەودی و دەرگاکە و بە توورەییەوە دەرگاکەی لەسەر داخستم.

لەوپەڕی بێزاری و بێ ئاگاییمدا بووم، چەندین جار هاوارم کرد، 'دەمەوێت بزانم بۆ چی لێرەم؟'

ئەوەندە زۆرم لە خۆم کرد، گوێم لە خێرایی لێدانی دڵم بوو، لەوە دەچوو بیەوێت قەفەسەی سنگم بشکێنێت و بۆخۆی بفڕێت.

لام ئاشکرابوو لەکوێم، بەڵام پێشتر چی ڕووی دابوو و بۆچی لە بەندینخانە بووم، ئەودەم نەمدەزانی، هەناسەم لە خۆم دەبڕی، لەناو بێدەنگیی چواردەورمدا خۆم مەلاس دەدا و دەمویست وێنەیەکی ڕابردووم بێنمەوە پێشچاوم، بەڵکوو تێبگەم چی ڕووی داوە و بۆچی بەندم، گەرما و بۆگەنی ژوورەکە و برسێتی و ئازاری جێگەی نووکەشەقەکانی پۆلیسەکە، هەستەکانمیان تەواو شێواندبوو و نەیاندەهێشت تاوێک لە خۆم بگەڕێم و سۆراغێک لە ڕابردووم بکەم. چاوێکم هەر لەسەر جامە فافۆنەکە بوو، ناچار خۆم بۆ درێژ کرد و لە باوەشمدا دام نا، نیوە بوو لە برنجێکی بۆری خوساوی ساردەوەبوو، لەو دەمەدا بە خۆمم وت، 'تۆ بڵێیت هەموو جارێک ئەو تۆزە برنجە، ئەوەندە گران لەسەرم بکەوێت.'

جامە فافۆنەکەم لەتەنیشت خۆمەوە دانا و پاڵم دا بە دەرگا

ئاسنەکەوە، نازانم چەندێک بوو لە هەوڵی بیرکردنەوەدا بووم، دیسان بێدەنگیی ناو خۆمماندووی کردم و بۆ جاری سێهەم، خەوم لێ کەوت.

بەیانی زوو بوو، لەگەڵ کەوتنی یەکەمین تیشکی خۆر بۆ ناو ژوورەکەم، تاکوتەرا لەنێوان درزی پەردەکانەوە هاتبوونە ژوورەوە، هێندەی تر ترس و نیگەرانییان خستە دڵمەوە، وەکوو بڵێی خەونێکی بەد خەوی زڕاندبێتم، دەنگێکی غەریب لە بەرگوێمدا دەزرینگایەوە، بەخێرایی گورم دایە بەر خۆم و چووم بۆ ژوورەکەی دایکم، دەرگای ژوورەکەی لەسەر پشت بوو، بەڵام خۆی لەوێ نەبوو، بە پلیکانەکاندا چوومە خوارێ بۆ هۆڵی دانیشتنەکە، بۆن و دووکەڵی جگەرە، سنگیان پڕ کردم، لەناو هۆڵەکەدا دووکەڵ و هاتنە ژوورەوەی تیشکی خۆرەکە تێکەڵ بووبوون و شین دەیاننواند. دایکمم بینی، لەسەر تاکێک قەنەفە دانیشتبوو، لەناو چڕیی دووکەڵی جگەرەکەی خۆیدا، بەئەستەم دیار بوو، زووزوو هەنسکی هەڵدەکێشا و بەکوڵ دەگریا، کاتێک بینیمی، خێرا باوەشی بۆ گرتمەوە، باش بەبیرم دێت، خێرا خۆم خستە باوەشی و ئینجا ئەو توند هەردوو باڵی تێوە ئاڵاندم و هێواش هێواش دەستی بەسەر دەستمدا دەهێنا، هێشتا بەیانی زوو بوو، بەڵام دایکم بۆنی شەراب و جگەرەی لێ دەهات، بەردەوام دەگریا، لێم پرسی، 'دایە، چی بووە؟'

سەرێکی بۆ ڕاوەشاندم و بە دەنگێکی کز وتی، 'هیچ.'

پاش ئەوەی تاوێک بوو لە چاوە ماندووەکانیم دەڕوانی، لێم پرسی، 'دایە، کوانێ ئێدی؟'

'ڕۆیشت.'

پاش تاوێک بێدەنگبوون، دیسان، بێ ئەوەی سەیری بکەم، پێم وت، 'دوێنێ گوێم لە ئێوە بوو.'

'گوێت لە چی بوو؟'

سەرم داخست و پێم وت، 'ئێوە شەڕتان بوو، تووڕە بوون لە یەکتری و جنێوتان بە یەکتری دەدا.'

لەپڕێکدا خۆی ڕاست کردەوە، دەستی برد بۆ پاکەتی جگەرەکەی و جگەرەیەکی داگیرساند، خۆی بێدەنگ کرد و وەڵامی نەدامەوە.

پەیوەندیی دایکم لەگەڵ ئێدی، دوو ساڵی تەواوی خایاند، ئەو دوو ساڵە، هەستم بە تەنیایی نەکرد، تەنها یەک ڕۆژ چی بوو، هەستم بە تەنیایی نەکرد، ئێدی بووبووە هاوڕێ و هاودەنگم، ئەوکات تەمەنم تەنها نۆ ساڵان بوو.

پاش بێدەنگییەکی زۆر، وەکوو دایکم بیری لێ کردبێتەوە، لەپڕێکدا بە دەنگێکی تێکشکاوەوە وتی، 'نەخێر، ئێدی بۆی نییە بێتەوە بەم ماڵەدا.'

'بەڵام، ئێدی...!'

دایکم نەیهێشت قسەکەم تەواو بکەم، گوڕی دایە بەر خۆی و منی وەلاوە نا و هەستایە سەر پێ، جگەرەکەی لەناو تەپڵەکە پڕ لە فلتەرەکەدا کوژاندەوە، پڕی کرد بە دەستمدا و توند مەچەکی گرتم، ڕایکێشام بەدوای خۆیدا، ڕووەو هەیوانەکە و پاشان بە پلیکانەکاندا بۆ سەرەوە، بەدەم ڕۆیشتن و بە تووڕەییەوە وتی، 'تۆ ئەوەندە زوو هۆگری ئەو پیاوە بێڕەوشت و مودمین و ڕیسوایانە دەبیت.'

بەڕێوە نەمدەتوانی خێرایی پێکانی ئەو هەڵگرم، قاچم لەیەک ئاڵان

و کەوتم، ئینجا بەدوای خۆیدا ڕایکێشـام، لـە دەرگـای ژوورەکەمدا ڕاوەسـتا و فرێـی دامـە سـەر ئـەرزی ژوورەکـە، بـێ ئـەوەی هـیچ بڵێت، دەرگای ژوورەکەمی بەدوای خۆیدا ڕاکێشا.

ئـەو قسـانە لەسـەر دیوارەکـانی ڕۆحـم هەڵکـەنراون و ناسـڕێنەوە، 'مـن ئەوەنـدە زوو هـۆگری ئـەو پیـاوە بێڕەوشـت و مـودمین و ڕیسوایانە دەبم.'

هــەرگیز ئــەو هەڵەیــەم دووبــارە نــەکردەوە و جــارێکی تــر ئــەو پرسیارەم لە دایکم نەکردەوە.

## ٧

# دادگا

لەوپەڕی قووڵایی سەرنجمەوە، چاوم بەسەر دیوارەکاندا دەگێڕا، ئەو هەموو نووسینە سەرنجڕاکێشانە، هێڵکارییەکی کۆن و نوێی بێشومار، زۆربەی نووسینەکان بە خەتی عەرەبی نووسرابوون، تاکوتەرایش بە هیرۆگلیفی و لاتینی، هیرۆگلیف، مەبەستم لە نووسینی فیرعەونەکانە، ڕێنووسی ئەو دوو زمانەی لەبارەیانەوە شارەزا بووم و فۆرمیان لەلام غەریب نەبوو، چەندین ساڵ خەریکی فێربوون و ناسینیان بووم.

سەری پەنجەکانم بە شێی ئەرزی ژوورەکە تەڕ دەکرد، پاشان ڕەشی و نووسینە تەواونەکراوەکانی سەر دیوارەکانم پێ پاک کردەوە، هەڵبەتە دوایی لام ئاشکرا بوو، ئەو تەڕییەی ناو زیندانەکەم میزی جرج بوو، ئەو جرجانەی لەژێر باڵاخانەی ئەو بەندینخانەدا دەژیان.

بەناو پۆرترێت و نووسینەکاندا بەدوای چیرۆکی کۆن یان نوێدا دەگەڕام، بە سەری پەنجە تەڕەکانم، ڕەنگە بۆر و ڕەشەکانم

تێکهەڵکێش دەکرد، لە ڕێگەی تۆنی ڕەنگەکانەوە، بەبێدەنگی گوێم لە دەنگی تێکەڵاوبوون و بەریەککەوتنی ڕووداوی ناو نووسینەکان دەگرت، سەرسام، بە ڕاست و چەپمدا لێم دەڕوانین و دەستم بە ڕووی ڕووتیی هێڵە کاڵ و تۆخەکانیاندا دەهێنا.

هەموو هەستەکانم خستبوونە دۆخی ئامادەباشییەوە، بەڵکوو بزانم پێش هاتنم بۆ ئەو جێگەیە، چی ڕووی داوە، گوێم لە هەناسە و دەنگ و ژاوەژاویان بوو، بۆنی پۆرترێتە کۆنەکانم دەکرد، چاوم فریای ژماردنی جووڵەیان نەدەکەوت، هەناسەم لە خۆم بڕیبوو. بەئەستەم بە سەری پەنجەکانم خەریکی نوێکردنەوەی هێڵی پۆرترێتەکان بووم، شەو و ڕۆژ لە بیرکردنەوەدا بووم، بەدەوری خۆمدا دەخولامەوە و چاوم لێ نەدەترووکاند، تاکوو ئاگاداری هەموو جووڵە و بەریەککەوتنێکیان بم، پەنجەکانم وەکو قڵچە و نینۆکەکانم شەفرە، خەریکی ڕاستکردنەوە و بەیەکگەیاندنەوەی هێڵەکان بوون. دیواری بەندینخانەکە تەواوی غەریبی و گومانێکمیان ڕەواندبۆوە، بەردەوام سەرنجم لەسەر نووسینە تەواو نەکراوەکان و پۆرترێتە تێکشکاو و داپۆشراوەکان بوو.

چەندین مانگ تێپەڕین، هەموو ڕۆژێک چوار جار لە کاتێکی دیاریکراودا، ڕۆژانە پۆلیسێک تەنها بە یەک وشە دەیدواندم، ئەو وشەیەی ئێستایش لەناو گوێمدا دەزرنگێتەوە، وشەی، 'خنزیر.'

پۆلیسەکە، ڕۆژی دوو جار بۆ سەر تەوالێت و دوو جاریش، بەیانی و ئێوارە، نانی بۆ دەهێنام، ژەمی بەیانییان، شۆربا و پارچەیەک نانی بۆر، ئێوارانیش، برنجێکی خوساو بوو، پێدەچوو

بە میزی ئەو پۆلیسە تەڕ کرابێت، کە بە تەوسەوە هەموو ڕۆژێک بۆی دەهێنام.

ڕۆژانە بایەک لە پەنجەرە بەرزەکەوە، ژووری زیندانەکەمی پڕ لە تەپوتۆز و بۆنی خۆش و ناخۆشی خۆی دەکرد، زۆر جاریش لە دوور، بەکزی دەنگی مۆسیقام دەبیست. زۆربەی کات دەنگی ئەو گۆرانیبێژەم دەبیست، کە پێش هەموو کەسێک، بێ خواستی خۆم، بە تۆنی دەنگی خۆی ئاشنای کردم.

لەسەر دیوارەکان زۆر ڕستەی تەواونەکراو نووسرابوو، زۆربەیان کورت، کەمێکیشیان درێژ و بێکۆتا، لەناویاندا چەندین وشەی تەنیا و غەریب، لەو دەوروبەرە، لەژێر سێبەری چیرۆک و هۆنراوەکاندا بۆخۆیان دەگەڕان، زۆربەیان بێ دەنگ و ڕەنگ بوون، لەناو هەموویاندا، تاکوتەرا تەنیایی و غەریبی خۆیان لەبیر چووبووەوە، هەندێک وشە خۆیان بە ڕستەی ئەم چیرۆک و ئەو هۆنراوەدا هەڵدەزنی، چەندین ڕوخسار، بێدەنگ لە کەنارەوە، تەنها بینەر بوون، پەیکەرئاسا بێدەنگ چاویان بە هەمواندا دەگێڕا، چاویان پڕ بوو لە شەرم و گومان. یەک یەک بەسەریاندا گەڕام، لەژێر تۆزی چەندین ساڵەی ئەو چوار دیوارە دەرم دەهێنان، تۆخم دەکردنەوە و دەستی شەرم و بێدەنگییانم دەگرت. ئەو پۆرترێتە ناوازانەی لەژێر تەڵخیی ڕەنگ و پەچەی سەر ڕوخساری خۆیاندا، تەنها چاویان زیتەی دەهات، پێدەچوو خۆشیان بەگومان بووبێتن لە ڕەگەزی خۆیان، ڕێگەم بۆ دەکردنەوە و دووبارە هێڵکاریی ڕوخسار و جەستەیانم دەکێشایەوە، شەوان بەڕووتی لە ئامێزم دەگرتن و لەگەڵیاندا سەمام دەکرد، ژوورە ئەنگوستەچاوەکەم پڕ بووبوو لە ڕووناکیی

لەشی ڕووتی ئەوان، بە ڕۆژیش، بەئەستەم لێیان دەڕوانیم، هەرگیز شەرمی ئەوانم پێ نەدەشکێنرا، یەک یەک لە سنووری دیوارەکانەوە لە دەستم هەڵدەهاتن و خۆیان دەهاویشتەوە ژێر بەرگە ڕەش و لیخنەکانیان.

ڕۆژێک، ئەوەندە لە قووڵایی خەیاڵمدا بەدوای هەڵاتووەکاندا چووبووم، بێئاگا مابووم لە چواردەورم و پۆلیسەکە بێدەنگ هاتبووە ناو ژوورەکەم، لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا ڕاوەستابوو، بە دەنگی ئەو ڕاچەڵەکیم، لەناکاو نەڕاندی، 'خنزیر.'

پۆلیسەکە، هاوشێوەی ڕۆژانی پێشوو، تووڕە و هەڵەشە دیار بوو، چەندین جار لەسەر یەک، 'خنزیر، خنزیر...'

شەش مانگ ئەو تەنها کەس بوو بێدەنگیی ژوورەکەی دەشکاندم، لەناو گرێ و ونبوونمدا دەری دەهێنام. بە یەک وشە دەیدواندم و هەموو ڕۆژێک، یەک شەق و یەک زللەی لێ دەدام، هەموو ڕۆژێک، پەنجەی نامرۆڤانەی خۆی دەژەنییە ڕۆحم و خەیاڵی دەشێواندم. هەر ڕۆژە بە شێوەیەک پێشوازیم لێ دەکرد، بەڵام ئەو، یەک ڕوو، یەک شێوازی جلوبەرگ، یەک وشە و لە یەک کاتی دیاریکراودا دەهات، هەموو جارێک خۆی هەڵدەبڕییە سەر نووکی پێیەکانی و پشتەملی توند دەگرتم و پێش خۆی دەدام، وەکوو یاسایەکی نەگۆڕی ئەو بەندینخانەیە بێت، هەموو جارێک دەموچاوم لێ دەشاردەوە، لەتاو زللە و کوڵەمستە لەناکاوەکانی، ناچار خێرا سەرم بۆ دادەنەواند و پشتم تێ دەکرد، ئەویش پاش وەشاندنی زللە و شەقێک، پشتەملی دەگرتم، ئەوە هەموو پەیوەندیی نێوان من و ئەو پۆلیسە بوو، بەدرێژایی شەش مانگ، هەموو ڕۆژێک چوار جار سەردانی دەکردم.

ئەو بەیانییە، لە ژوورەکەمدا ماڵئاواییم لە هیچ شتێک نەکرد، لە خەیاڵی خۆمدا، 'پاشان دەگەڕێمەوە ناوبەینی ئەو دیمەنانەی لەسەر دیواری ژوورەکەم بوون، دیارە دیسان بۆ ئاودەستە بۆگەن و قێزەونەکانم دەبات!'

کاتێک بە تووڕەییەوە کەلەبچەی کردم و پێش خۆی دام، ئەو جارەیان ڕووبەڕووی ئاودەستخانەکان نەیبردم، بەلایاندا گوزەرمان کرد، لە دەرگایەکی ئاسنەوە، کە بۆیەیەکی ڕەشی تۆخ کرابوو، چووینە ژوورەوە، چووینە ڕاڕەوێک، دوو مەترێک پانییەکەی و لە دوو سەد مەترێکیش درێژتر دەبوو، ئەمبەر و ئەوبەری ئەو ڕاڕەوە، قەفەسی ئاسن بوون، لە هاوشێوەی باخی ئاژەڵان، هەموو قەفەسەکان، پڕ بوون لە بەندکراو، هەزاران بەندکراو، کاتێک چاویان بە ئێمە کەوت، لەپڕێکدا و لە یەک کاتدا لە نێوان شیشە ئەستوورەکانەوە باڵیان دەرهێنا، زۆربەیان دەستیان ڕووبەڕووی ئێمە درێژ دەکرد، چاویان سامناک و دەهری و ماندوو دیار بوو، پێستیان داکەوتبوو و سەر و ڕیشیان درێژ، وەک ئاژەڵێکی دڕندە، نینۆکە درێژەکانیان ڕووبەڕوومان دەهاوی و ددانیان لێ جیڕ دەکردینەوە، بەردەوام پڕ بە دەمیان بەڵغەم و تفیان تێ دەگرتین، ئەو ڕاڕەوەیان پڕ کربوو لە هاتوهاواری خۆیان، هەموو پێکەوە، بە کۆرس و بە ناوازە هاواریان دەکرد، "الله أكبر، الله أكبر."

مانای ئەو ڕستەیەم دەزانی، لەو چەند ساڵەی دواییدا، لە شاری ئەمستردام، لەسەر چەندین دیوار و بە چەندین زمان نووسرابوو، خوا گەورەیە، خوا گەورەیە، وەکوو دایکم دەی وت، 'ئێمە گومانمان لە گەورەیی خوا نییە، هەر وەکوو چۆن ئەو خوایە

سکێچی گەورەیی خۆی لە کتێبە پیرۆزەکاندا کردووە!'
دواتر بۆم دەر کەوت، کە ئەوانە کێ بوون و مەبەستیان لەو هاتوهاوارە چی بوو. پۆلیسەکە بە ڕاست و چەپماندا، بە دارەکەی دەستی پێیدا دەکێشان، لە تاوان پێیەکانم خێرا خێرا بەدوای خۆمدا هەڵدەگرت و پۆلیسەکەیش ناچار بوو دوام بکەوێت.
لە دەرگایەکی هەمان شێوەی ئەوەی پێشوودا، چووینە هۆڵێک، پڕ بوو لە مێز و کورسی، دوو پۆلیس، لەوە دەچوو چاوەڕوانی ئێمەیان کردبێت، دوای کەمێک قسەکردن لەگەڵ ئەو پۆلیسەی هێشتا پشتەملمی توند گرتبوو، ڕادەستی ئەو دووانەی کردم و خۆی لە هەمان دەرگاوە، کە لێوەی هاتین، بێدەنگ و بێ ماڵئاوایی بەجێی هێشتم، ئەوکات خەیاڵی ئەوەم دەکرد، 'ئەی دوای ئێرە بۆ کوێم دەبەن؟'
دوو پۆلیسەکە، هەردووکیان جلی ڕەشیان لەبەردا بوو، بالایان لە من بەرزتر بوو، یەکێکیان زنجیری کەلەبچەکەی گرتم و بەدوای خۆیدا ڕایکێشام و ئەوی تریان، دوو مەترێک لەدوایەوە دەڕۆیشت، پاش کردنەوەی چەند دەرگایەکی ئاسن و بڕینی چەندین ڕاڕەو و ژێرخان و سەرخان. ئینجا کەوتینە نێو هۆڵێک، کە پێدەچوو گەراج بێت، تەنها جیپێکی لێ وەستابوو، دوو پۆلیسی تر لە پێشەوەی جیپەکەدا بوون، شۆفێرەکەی و پۆلیسێکی تر، یەکێکی تر لە پۆلیسەکان، دەرگای پشتەوەی جیپەکەی کردەوە، ئینجا ئەو پۆلیسەی هێشتا دەستی بە زنجیری کەلەبچەکەی دەستمەوە بوو، بەدوای خۆیدا ڕایکێشام بۆ ناو پشتی جیپەکە و لە بەری لای شۆفێرەکەوە، لەسەر ڕاستە تەختەیەک دانیشتم، پۆلیسەکان یەکێکیان بەرامبەرم و ئەوی دییان لەتەنیشتمەوە

دانیشت، ئینجا لە دەرگایەکی کارەبایی بەرزەوە چووینە سەر ڕاستەشەقامێکی جەنجاڵ، من لە جامی نیوان ئێمە و شۆفێرەکەوە، بە لاچاوێک لە دەرەوەم دەڕوانی.

خەیاڵم ئەوەندە پەرت بوو، نەمدەوێرا بیر لە ئازادبوونم بکەمەوە، پۆلیسەکان هەرچواریان بێوچان لەگەڵ یەک قسەیان دەکرد، بە دەنگێکی زۆر بەرز، نەمدەزانی ئاخۆ کێ قسەکەرە و کامیان گوێگرە، زۆر کات، لە یەک کاتدا، هەرچواریان پێکەوە قسەیان دەکرد و پڕ بە کابینەی جیپەکە دەیاننەڕاند بەسەر یەکتریدا. پاش چارەکە کاتژمێرێک، گەیشتینە ناو باڵاخانەیەک، بەخێرایی دایان گرتم و بەنێو دەرگایەکی کراوەیاندا بردم، چەندین پۆلیس و ئەفسەری تر، لەو دەوروبەرە تاکوتەرا ڕاوەسابوون، گەیشتینە بەردەمی پرسگەیەک و یەکێک لە پۆلیسەکان فایلێکی بۆری دایە دەستی کابرایەکی ڕەشتاڵەی چاویلکە لەچاو، کە لەپشت مێزی پرسگەکەوە تا پشتێنەی لە ئێمەوە دیار بوو، یەکێک لە پۆلیسەکان خەریکی لێدوان و پڕکردنەوە و ئیمزاکردنی چەند کاغەزێک بوو، پۆلیسەکەی تر منی برد و لەسەر کورسییەک لەپێش پرسگەکە دای نام، نائاگاییم لە ڕووداوەکان وردەوردە تەنگیان بە ڕۆحم هەڵدەچنی.

ئەو ڕووداوانە هەرگیز لە چاوەڕوانیی مندا نەبوون، زیاتر لە یەک کاتژمێر لەوێدا دانیشتین و چاوەڕوان بووین، هەوایەکی گەرم و پەنگ خواردوو، خەیاڵم تەنها لای قومێک ئاو بوو. دوای ئەوە، لە یەکێک لەو چەند دەرگایەوە کە دەکەوتنە سەر ئەو هۆڵە، چووینە ژوورێکی بچووک، مێزێکی درێژکۆلە و چەندین کورسی چواردەریان لێ دابوو، بە چواردەوری ژوورەکەدا، چەندین

دۆلابی سەوز پشتیان نابوو بە هەرچوار لای دیواری ژوورەکەوە، ژوورەکــە بێپەنجــەرە بــوو، بــەڵام چەنــدین گلــۆپی ســپی بــە بنمیچەکەیـــەوە دەگـــڕان، دەستشـــۆرێک لـــە ســـووچێکییەوە و ئاوێنەیەکی بە سەرەوە بوو، کورسییەک بەرامبەری دەستشۆرەکە دانرابــوو، تەنــەکە خۆڵێــک قــنج لەبنیــدا دانرابــوو، یــەکێک لــە پۆلیســەکان، کەلەبچەکــەی لــە دەســتم کــردەوە و بــە ئامــاژە و بــە نیـوەئینگلیزی، داوای لـێ کـردم لەسـەر کورسـییەکە دابنیشـم، ئـەو کورسـییەی لەپێش دەستشـۆرەکە بـوو، کاتێـک چوومـە بـەردەمی دەستشـۆرەکە و لـە ئاوێنەکـەدا سـەرنجم دا، شـێوازێک، کـە خـۆم زۆر غـەریب بـووم پێـی، شـەپۆلێک لـە گومـان و دوودڵـی دای بـە کەناری ڕۆحمدا، خێرا هەموو لەشم ئارەقێکی ساردی دەر دا، هیچ لێکچـوونێکم نـەدی لەنێـوان خـۆم و ئـەو وێنەیـەی لـە ئاوێنەکـەی بەرامبەرمـــدا لـــێم دەڕوانـــی، خێـــرا ســـەرم داخســـت و لەســـەر کورسییەکە دانیشتم.

یـەکێک لـە پۆلیسـەکان، بـە مەکینەیـەکی کارەبـایی دەسـتی کـرد بـە هەڵپاچینی سەر و ڕیشم، بە تۆپەڵ تاڵەمووەکانم زەرد زەرد، بەر دەبوونـەوە سـەر کۆشـم. ڕیشـم بـە وێنـەی قـژم درێـژ بـوو، لـە چلکنیدا، تۆپەڵ تۆپەڵ پێکەوە لکابوون، ئەو ورووژانـەی ڕۆحـم، کاریشیان لـە مووەکانم کردبوو، هـەموو ڕەپ دیـار بـوون و تونـد خۆیان لەیەک ئاڵاندبوو. سـەر و ڕیشـمی بـە یـەک ئەندازە کـورت کــردەوە، پاشــان ئــەو پۆلیســـەی قــەیرێک بــوو لە پشــتمانەوە ڕاوەستابوو، بەردەوام لەگەڵ دەلاکەکەمدا دەدوا، لێم هاتە پێشـەوە و دەستێک جلی قەدکراوی لەسەر دەستی بۆ ڕاگرتم و داوای لێ کــردم لەبــەریان بکــەم، جلــەکانی لەســـەر مێزەکــەی ناوەڕاســتی

ژوورەکە دانا، خەریکی گۆڕینی جلەکانم بووم، دەستێک چاکەت و پانتۆڵی ڕەساسی بوون و هێشتا بۆنی ئارەقێکی نوێ و تەڕیان لێ دەهات، دوای چەندین مانگ، ڕەنگێکی ترم پۆشی، هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا، هیوایەک خەریکی کردنەوەی گرێکانی سەر دڵم بوو، چەند جارێک ویستم پرسیارێک، کە لە خەیاڵمدا ئامادەم کردبوو، لە دوو پۆلیسەکەی بکەم، بەڵام ئەوان لە لێدوانێکی نەبڕاوەی گەرموگوڕدا بوون، نەمویست لێیان تێک بدەم.

کاتێ لە دەرگایەکی ترەوە کابرایەکی درێژی ڕەقەڵەی ئەفەندیی سەر سپی لەگەڵ دوو پۆلیس خۆیان کرد بەژووردا، بەهەڵەداوان، خێرا خێرا، وەکوو بڵێیت لە گەڕانەوەمدا بۆ هۆڵەندا فڕۆکەکەم بەجێم بهێڵێت، بێ ئەوەی تەنها وشەیەک چییە لەگەڵ دوو پاسەوانەکەمدا بیگۆڕنەوە، بە جووت دەستیان دایە بنباڵم و لە هەمان دەرگاوە بردمیانە ناو قەفەسێکی گەورە، کە بەسەر هۆڵێکی سەرنجڕاکێش و تەختەڕێژکراودا دەکەوت، لە ناوەڕاستی قەفەسە ئاسنینەکەدا، لەسەر کورسییەک دایان نام و ئەفەندییەکە لەلای ڕاستم و دوو پۆلیسەکەیش لەپشتمەوە ڕاوەستابوون، لە قەفەسی ناو سێرک دەچوو، کە شێر و پڵنگەکان یاریی تێدا دەکەن و تەماشاکەرانیش بە چواردەوردا لێیان دەڕوانن، لەگەڵ یەکەم نیگامدا، زانیم کە هۆڵی دادگایە. گوایا بۆ منیان هێنابوو بۆ ئەو دادگایە، ئەوەدەم نائاگا بووم، لە هۆڵەکەدا بێجگە لە کارمەندانی ئەو دادگایە، شەش کەس بوون و هەموو عەبای ڕەشی قەراغ سەوزیان لەبەردا بوو، دوو نووسەر و سێ فۆتۆگرافەریش دەبینران، فۆتۆگرافەرەکان، کە بە ڕاست و چەپیاندا وێنەیان دەگرت و فلاشیان لێدەدا، کامێرایەکیش لە کەنارەوە ڕووداوەکانی

تۆمار دەکرد. وەکوو تر، ئامادەبووانی ناو هۆڵی دادگاکە، بیست کەسێک دەبوون، خێرا بۆ ناسراوێک چاوم بەناویاندا گێڕا، ئامادەبووەکان هەموو تووڕە و بێزار دیار بوون. لەگەڵ هاوارێکی لەناکاودا، هەموو هەستانە سەر پێ. بە سەرسامییەوە لە هەموویانم ڕوانی، لەناکاو یەکێک لە پۆلیسەکان توند هەردوو بنباڵی گوشیم و ڕاست هەڵی ساندمە سەر پێ، ئەوەی لەو هۆڵەدا ئامادە بوو، لە منی دەڕوانی، لە یەک ساتەوەختی کورتدا، فۆتۆگرافەرەکان لێم هاتنە پێش و لەسەر یەک شەوقی فلاشەکانیان دەگرتە ناو چاوم، ناچار، توند چاوم داخست.

کاتی دەستپێکردنی دادگاییەکەم، یەکێک لەو چەند دادوەرانە هەستایە سەر پێ و دەستی کرد بە خوێندنەوە بە زمانی عەرەبی، بە دەنگێکی گڕ دەینەڕاند، جارجار گوێم لە ناوی خۆم و وشەی هۆڵەندا دەبوو، دادوەری خوێنەر، بێ ئەوەی لە خوێندنەوە ڕابوەستێت، جارجار بە دەستەسڕێک ئارەقی ناوچەوانی دەسڕی، زیاتر لە کاتژمێرێکی پێچوو، ئینجا ئەو دادوەرەی نیوەترێک جێگەکەی لەوانی تر بەرزتر بوو، دەستی کرد بە لێدوان. بەردەوام بە پێوە ڕاوەستابووم و لەو خەڵکەم دەڕوانی و ئەوانیش زۆربەیان سەرنجیان لەسەر من بوو. چاوم بەسەر ئەو هەموو دەموچاوە ماندوو و ڕەنگ زەردانەدا دەگێڕا، یەک یەک بۆ چەند هەناسەیەک سەرنجم لەسەریان ڕادەگرت و بێوچان لێم دەڕوانین، یەک یەک وێنەیانم لە خەیاڵمدا هەڵدەگرت، هەموو مۆرەیان لێ دەکرم و دانیان لێ جیڕ دەکردمەوە، منیش بە ڕوویەکی خۆشەوە، یەک یەک زەردەخەنەم بۆ دەکردن.

لەو ساتەدا ئەو پرسیارەم لە خۆم دەکرد، 'بۆچی من دەستبەسەر

کراوم و بە چ تاوانێک تۆمەتبارم و دادگایی دەکرێم؟'

لە خەیاڵمدا، لەو ساتەوەی ماڵئاواییم لە دایکم و کارل کردبوو، تاوەکوو ئەو ساتە، کە هێشتا لە دادگاکە بووم، دەیان و سەدان جار بە خەیاڵ پێیدا گەڕامەوە، لە چەند کات و شوێنێکدا، دەزووی خەیاڵەکانم دەبچڕان، بە خۆمم دەوت، 'پێدەچێت شتێک ڕووی دابێت و من ئاگا بم لێی، یان بە هەڵە منیان تاوانبار کردبێت.'

لە قووڵایی خەیاڵمدا بووم، لە دەنگی چەکوشەکەی دادوەر بەئاگا هاتمەوە، لەناو هۆڵەکەدا بوو بە ژاوەژاو، دەیان کەس لە دانیشتووانی هۆڵەکە هەستانە سەر پێ و دەستیان لە هەوادا ڕادەوەشاند و پڕ بە قوڕگیان هاواریان دەکرد، 'الله أكبر، الله أكبر.'

دادوەر کۆتایی بە دانیشتنەکە هێنا، دوو پۆلیسەکەی زیاتر لە چەند کاتژمێرێک دەبوو، وشک لەپشتمەوە بە پێوە ڕاوەستابوون، خێرا دەستیان دایە باڵەکانم، چۆن هێنابوومیانە ناو هۆڵی دادگاکە، ئاواش بەخێرایی بۆ ژوورەکەی پێشوو بردمیان، پۆلیسەکان بەدەم لێدوان و پێکەنینەوە، توند نینۆکەکانیان لە نەرمایی باڵەکانم چەقاندبوون، هەستم دەکرد خوێنیان لێ دەچۆڕا، خۆم تێک نەدا، لێم نەڕوانین، دیاربوو ئەو دوو پۆلیسە بەستەزمانە، یاسای ئەو وڵاتەیان جێبەجێ دەکرد، من وەک مرۆڤێکی غەریب و دەستبەسەر، ملکەچیان بووم.

یەکێک لە پۆلیسەکان جلە شینەکانی بۆ فڕێ دامە سەر مێزەکە و داوای لێ کردم لەبەریان بکەم، لەو دەمەدا ئەمەم لە خەیاڵدا بوو، 'وا دادگایی کرام، مافی ئەوەم هەیە شتێک بزانم لەبارەیەوە، بەڵام چۆن بوێرم ئەو پرسیارە لە پۆلیسەکان بکەم.'

بە بێزاری و تووڕەییەوە جلە شینەکانم لەبەر کردن، یەکێک لە پۆلیسەکان کورسییەکی بۆ ڕاکێشام و داوای لێ کردم دابنیشم، زیاتر لە کاتژمێرێک لەگەڵ ئەو دوو پۆلیسە، لەو ژوورەدا بووین.

بێدەنگ، لە دوورەوە لە ئاوێنەکەم دەڕوانی، ڕەنگی بۆری دیوارەکەی پشتمی تێدا دووبارە دەبووەوە، پۆلیسەکانیش بەردەوام لەگەڵ یەکدا قسەیان دەکرد.

لەپڕێکدا، کابرایەک خۆی کرد بە ژووردا، پۆشتە و باڵابەرز، قژنێکی قەڵەوی سمێڵ ڕەش، تەمەنی لە سەرووی پەنجاوە دەبوو، جانتایەکی چەرمی ڕەشی بە دەستەوە، لەسەر مێزەکە و لەبەرامبەرم جانتاکەی دانا و بە دەنگێکی بەرز وتی، 'السلام عليكم.'

لێم ڕوانی و هیچم نە وت، دوو پۆلیسەکەی لە ژوورەکەدا بوون، بە کۆرس وەڵامیان دایەوە، 'وعليكم السلام ورحمة الله وبركاته.'

پاشان پۆلیسەکان یەکیەک ژوورەکەیان بەجێ هێشت و تەنها من و کابرای قژن ماینەوە، پاش هێنانی دوو پەرداخی پلاستیک ئاو و لەسەر قەراغی مێزەکە دای نان، بێ ئەوەی لە کابرا بڕوانم، خێرا و بە نائارامییەکەوە، خۆم درێژ کرد بەسەر مێزەکەدا و هەردوو پەرداخەکەم لەناو دەستم گرت و یەک یەک ڕژاندمنە ناو گەروومەوە، بە شەرمێکەوە لە کابرام ڕوانی و هەردوو پەرداخەکەم بەبەتاڵی لەسەر مێزەکە دانانەوە، لەبەرامبەرم دانیشت و دەستی بۆ درێژ کردم و وتی، 'من ناوم سەعید حاتەمە، پارێزەرم.'

بە سەرسامییەکەوە لێم ڕوانی، سەرم بۆ ڕاوەشاند و هیچم نە وت، لە خەیاڵمدا دەم وت، 'پارێزەر...! بۆچی دەبێت پێویستم بە

پارێزەر بێت؟ یان، بەڵکوو لە ڕێگەی ئەم پیاوەوە شتێک لە ڕووداوەکان تێبگەم!'

کاتێ دەستم لەناو دەستی نا، ئەو پێی وتم، 'ئەگەر تۆ دەتەوێت من وەکوو پارێزەرت دەستبەکار بم؟'

پاش ئەوەی لە جانتاکەی چەند کاغەزێکی دەرهێنا و لە بەردەممدا دای نان، دیسان دووبارەی کردەوە، 'من پارێزەرم.'

دیار بوو کابرا بەگومان بوو لە پیشەکەی خۆی، یان دڵنیا نەبوو لەوەی من گرنگیم بەو دابێت، پاش ئەوەی چەند کاغەزێکی خستە بەردەمم و قەڵەمێکی لەسەر دانان، دەستی نەگێڕایەوە و لەسەر دەستم دای نا، بە چاوێکی بەزەییەوە لێی ڕوانیم، 'ئەمڕۆ بیستی مانگی یەکە، تۆ شەش مانگی تەواوە دەستبەسەریت، خۆت دەزانیت، بە تۆمەتی کوشتن و جاسووسی تۆمەتبار کراویت، دادگای تاوانی المنیای باشووری قاهرة، بڕیاری خۆی بەسەردا داویت، کەواتە تۆ پێویستیت بە پارێزەرە. دەبێت باش ئەوە بزانیت، کە تەنها چەند ڕۆژێکت بوار ماوە. پێویستە تۆ ناڕازیبوونی خۆت پێشکەش بە دادوەری باڵا بکەیت، ئەگەر تۆ بتەوێت، کەواتە...'

نەمهێشت قسەکەی تەواو بکات، 'بەڕێز، تکایە پێش هەموو شتێک، من دەمەوێت بزانم بۆچی دەستبەسەرم و بە چ تاوانێک دادگایی کراوم؟'

قاقایەکی لێدا و وتی، 'هێندەی من بزانم، هەڵە نەکراوە لە کەیسەکەی تۆدا، تۆ جەنابت، مارتن سەلەمۆ نیت؟'

'بەڵێ.'

'تۆ بەسەر تاوانەکەوە دەستبەسەر کراویت و چەندین کەس

شایەتی ئەو ڕووداوەن، یانی چی، دەڵێیت نازانم لەسەر چی دەستبەسەرم!'

'نەخێر، نازانم!'

'باش گوێم لێ بگرە، من پارێزەرم.'

هەستایە سەر پێ و هات دەستێکی خستە سەر شانم، وەکوو بیەوێت زیاتر لە خۆیم دڵنیا بکات، هەتا متمانەم پێی هەبێت و قسەی بۆ بکەم، بەردەوام بوو، وتی، 'پێویستە ئەم چەند دۆکومێنتە ئیمزا بکەیت، هەتا من، پارێزەر سەعید حاتەم، بۆ زانیاریت، من ناودارترین پارێزەری وڵاتی میسرم، بەوپەڕی باوەڕبەخۆبوونمەوە دەتوانم بڵێم، ناودار لە هەموو وڵاتە عەرەبییەکانیشدا، ئەوکات تۆ، من، پارێزەر سەعید حاتەم، قبوڵ دەکەیت بە پارێزەری خۆت.'

دەستی برد کاغەزەکانی لە بەردەممدا بڵاو کردەوە، یەک یەک دەستی بۆ خواری نووسراوەکان درێژ دەکرد و داوای لێ کردم ئیمزای بکەم.

نووسینەکان بە زمانی عەرەبی نووسرابوون، بەڵام شێوە ئیستیمارە دیار بوون و پڕ کرابوونەوە، پاش ئەوەی پارێزەرەکە لەسەر هەرسێکیان ئیمزای خۆی کرد، بە بێزارییەکەوە هەردوو دەستم لەیەک هەڵپێکان و بە سەرنجەوە لە چاوی پارێزەرەکەم ڕوانی و پێم وت، 'من ڕازیم بەوەی تۆ ببیتە پارێزەرم، بەڵام تکات لێ دەکەم یارمەتیم بدە، تەنها ئەوەندەم پێ بڵێ، تاوانی من چییە و بە چ تاوانێک تۆمەتبار کراوم؟'

وەکوو ماخۆلانی بێت، بە ژوورەکەدا دەستی کرد بە گەڕان، تاوێک بێجگە لە لێکخشانی بنی پێڵاوەکانی لە کومباری ژوورەکە،

هیچی دیکەت نە دەبیست، ئینجا لە ناکاوێک، هەردوو کوڵەمستی بە مێزەکەدا کێشا، سنووری چاوی گەورە کرد و خۆی توورە کرد، لە کاتی قسەکردندا، تف لەنێوان لچ و لێوەکانییەوە دەکەوتنە سەر مێزەکەی بەردەمی و سەر ئەو چەند پارچە کاغەزەی بە ئیمزاکردنیان، بە گوێرەی یاسای میسر، من و ئەوی لەیەک مارە دەکرد، نوشتایەوە بەسەر مێزەکەدا و لێم نزیک بووەوە و لەژێر لێوەوە چپاندی، 'ئوتێل، سەماء!'

سەرم لێ ڕاوەشاند و لێم پرسی، 'ئێ، ئێ، زیاتر!'

'تۆ لە ئوتێلی ناوبراو، لە ژووری ژمارە پەنجاوحەوت، لەگەڵ خالید ئەحمەد عەبدولسەلیم و سەمیر عەلی مەنسوور، دوو کەسێتیی چالاکەوانی فەلەستینی و ئەندامی بزووتنەوەی حەماس، جەنابت لە خەودا هێرشت کردۆتە سەریان، یەکێکیانت کوشتووە و ئەوی تریانت بریندار کردووە. هێندەی من بزانم، برینەدارەکە تا ئەمڕۆیش هەر لە نەخۆشخانەیە، ئێستا حاڵی بوویت، دەزانیت چ تاوانێکت کردووە؟'

بە سەرسامییەکەوە لێم ڕوانی. لە خەیاڵی خۆمدا ئەو پرسیارانەم لە خۆم دەکرد، 'ئەو کابرایە باسی چی دەکات؟ ئوتێل سماء؟ دوو فەلەستینی؟ حەماس؟ کوشتن؟ نەخۆشخانە...؟'

پاش تاوێک بیر کردنەوە، وتم، 'لە ڕاستیدا، ئەوەندەی بەبیرم بێتەوە، یەکەم ڕۆژم گەیشتمە میسر، شۆفێری تاکسییەک، بێ خواستی خۆم، بۆ ئوتێلێکی بردم، بەڵام نازانم کام ئوتێل بوو، بەڵێ، دووان لە ژوورەکە لەگەڵمدا بوون، یان، ئا، ئا، با باش بیر بکەمەوە، خەڵکی کوێ و چ کارە بوون و ناویان چی بوو، دڵنیا بە پارێزەری بەڕێز، نازانم، بەڵام...'

پارێزەرەکە بە تووڕەییەوە دەنگی هەڵبڕی و قسەکانی پێ بڕیم، 'الله أكبر! برام، برای بەڕێز، مۆساد، لە سیازدەی دوازدەی ساڵی ١٩٤٩دا، لە ئیسرائیل دامەزراوە، بە کورتییەکەی، تۆ، تۆ ئەندامی نهێنیی ئەو دەزگایەیت، پێویستە تۆ لێم تێبگەیت، تکایە ئەوەندە پێچوپەنا مەخەرە بەر باسەکان، من دەبمە پارێزەرت و متمانەم پێ بکە.'

سەرم ڕاوەشاند و دەنگم لێ هەڵبڕی، 'جەنابی پارێزەر، من پێش شەش، مانگ بۆ حەفتەیەک هاتم بۆ میسر، بە بانگهێشتی مۆزەخانەی نێودەوڵەتیی قاهیرە، ڕۆژی دەی حەوت، کاتژمێر یەکی دوای نیوەڕۆ، لە فڕۆکەخانەی قاهیرە دابەزیم، پاشان ئەوەی لەبیرم بێت، بە تاکسییەک لە فڕۆکەخانەوە بۆ گۆڕەپانی تەحریر بەڕێ کەوتم، لەوێشەوە، بێ خواستی خۆم، شۆفێری تاکسییەک بردمی بۆ ئوتێلی ناوبراو، بەڵام، گەرما، جەنابی پارێزەر، هێزی تیشکی خۆر و بیزاری و بێهوودەیی ڕۆحم، ئەوەندە کاریان تێ کردم و وروووژاندمیان و ئازاریان دام، سەرنجم نەدا بزانم ناوی ئوتێلەکە چی بوو، هێندەی بزانم، ژمارەی ژوورەکە پەنجاوحەوت بوو، یان، پێم وا بێت، بەڵێ، تۆ ڕاست دەکەیت، دوو گەنجیش لەو ژوورەدا لەگەڵمدا بوون، بەڵام بێئاگا بووم لەوەی خەڵکی کوێن و چ کارە بوون، گەرمیی ئەو تیشکی خۆرە، وای کرد کە...'

نەیهێشت قسەکەم تەواو بکەم، 'خوای گەورە، خوای گەورە، باشتر وایە تۆ گوێڕایەڵی من بیت، من لێرە تەنها بەختێکم بۆ تۆ، ئێستا تۆ زیندانی هەتاهەتاییت بەسەردا براوە، بەڵام من گەرەنتیت دەدەمێ، کە بۆت بکەم بە بیست ساڵێک یان کەمتر!'

بێ ئارامی و تووڕەبوونێک لە ناخمدا دەیکوڵاندم و ئارەقە

سـەرتاپای جەسـتەمی خوسـاندبوو، بەحەپەسـاوی لـە خـەتی کاڵەوەبووی سەر کاغەزەکانم دەڕوانی، لە خەیاڵمدا بەردەوام ئەو ڕستەیە دووبارە دەبووەوە، 'تۆ زیندانی هەتاهەتاییت بەسەردا براوە.'

دیسان پارێزەکە لە خەیاڵمی دابڕیم، بە پەنجەی ئاماژەی بە یەکێک لە کاغەزەکانی بەردەمم کرد، 'ئەگەر تۆ لێرە ئیمزا بکەیت، ئەوا تۆ، من سەرپشک دەکەیت لە کێشەکەتدا.'

دەستی گواستەوە بۆ سەر کاغەزی دووەم و بە هەمان تۆنی دەنگ وتی، 'ئەمەیان، تۆ هەموو مافی دادگا و خەرجییەکی من دەگریتە ئەستۆی خۆت.'

کاتێک دەستی خستە سەر کاغەزی سێهەم، بە سەرنجەوە لێی ڕوانیم و وتی، 'بەڵێ، ئەمەیان گرنگە، بێجگە لەوەی تۆ ئیمزای دەکەیت، پێویستە کەسێک لێرە، لە میسر، گەرەنیت بکات، کە هەموو خەرجی و مافێکی من پارێزراو دەبێت، مەبەستم، تۆ دەبێت ناو و ناوونیشانی ئەو کەسە تۆمار بکەیت، پاشان ئەو کەسەش دەبێت خۆی ئیمزام بۆ بکات، ئەوکات من دەستبەکار دەبم، وەکوو تر، من ئامادە نیم بەبێ بەرامبەر کارت بۆ بکەم.'

کاغەزەکانم لەناو دەستم گرتن، پاش تاوێک بێدەنگی، ڕووم تێ کرد و پێم وت، 'بەڵکوو هاوکاریم بکەیت، هەتا تەنها تەلەفۆنێک بۆ قونسوڵی هۆڵەندا بکەم، ئەوسا کاری هەردووکمان ئاسان دەبێت، من هاوولاتییەکی هۆڵەندیم و باڵیۆزخانەی وڵاتەکەم ئامادەن هەموو هاوکارییەکم بکەن.'

ڕاپەڕی و بە سەرسامییەکەوە لێی ڕوانیم، 'بۆ قونسوڵی وڵاتەکەت ئاگادار نییە، کە تۆ دەستبەسەریت؟'

'نەخێر، باوەڕ ناکەم، ئەگین کەسوکاریشم ئاگادار دەبوون، یان چەند وەختە کەسێک سەردانی دەکردم.'
'تۆ ئیمزای ئەو دۆکۆمێنتانەم بۆ بکە، ئەوکات دڵنیا بە، بە خوای گەورە قەستەم، پەیوەندی دەکەم بە قونسوڵی هۆڵەنداوە.'
کاغەزێکی لە جانتاکەی دەرهێنا و لەسەر مێزەکە دای نا، 'تۆ، ئیمەیڵ و ژمارەی تەلەفۆن و ئەدرەسی کەسوکارتم بۆ بنووسە، هەر ئەمڕۆ ئاگاداریان دەکەمەوە، با خوای گەورە لەنێوانماندا ئاگادار بێت، پەیوەندییان پێوە دەکەم، لەمڕۆ زوو تر نییە.'
'تکایە، هەر ئێستا با بە تەلەفۆنە دەستییەکەی تۆ پەیوەندی بگرم لەگەڵ قونسوڵی وڵاتەکەم، یان هەر ئەوەندە بە کەسوکارم بڵێم، کە من لەکوێم، زیاتر نا، ئەوکات تۆ دەتوانیت لەگەڵ ئەوان ئەم لێدوانە تەواو بکەیت، دڵنیا بە هەموو مافێکی بەڕێزیشت بە زیادەوە دابین دەکەن، بە یارمەتیت، بە یارمەتیت...'
هەردوو دەستی لەسەر مێزەکە دانا و باڵەکانی بڵاو کردەوە و بە ساردییەکەوە وتی، 'الله أكبر، الله أكبر! کوڕی خۆم، پێش هەموو شتێک، پێویستە تۆ متمانە بە من بکەیت، ئینجا منیش ئامادەم داواکارییەکانت جێبەجێ بکەم.'
سەرم بەسەر دۆکۆمێنتەکاندا شۆڕ کردەوە، بێ ئەوەی وشەیەک چییە لێیان تێبگەم، لەو دەمەدا ئەفسەرێک خۆی کرد بە ژووردا، ڕووی تێ کردین و بە زمانی عەرەبی چەند ڕستەیەکی وت و ئاماژەی بۆ کاتژمێرەکەی دەستی کرد، ئەوکات، پارێزەرەکە سەرێکی بۆ ئەفسەرەکە ڕاوەشاند و بە نائارامییەوە ڕووی تێ کردم، 'بەڕێز مارتن سەلەمۆ، کاتمان نەماوە، تۆ پێویستە بڕیاری خۆت بدەیت!'

مرۆڤ کاتێک دەبێتە گاڵتەجاڕ، هەست دەکات لەوپەڕی لاوازی و بێدەسەلاتیدایەتی، کە دەکەوێتە غەریبی و لە شتەکان تێناگات.
ئیتر بەناچاری ئیمزام بۆ کرد، بەلام پێش ئیمزاکردنی دۆکۆمێنتەکان، ئیمەیڵ و تەلەفۆن و ئەدرەسی ماڵەوەم بۆ نووسی، لەگەڵ ژمارەی تەلەفۆن و ئیمەیلی کارمن.
پاش ئیمزاکردنی هەرسێ کاغەزەکە، تاوێک دەستم بەسەریاندا ڕاگرت، پڕ بووم لە گومان، هێزێک ڕێگەی پێ نەدەدام دەستبەرداریان ببم، ئەو چەند پارچە کاغەزەی بێ ئەوەی بزانم چییان لەسەر نووسرابوو، ئیمزام کردن، لەو دەمەدا هەموو گیانم دەلەرزی، پێچ بە سکمدا دەهات، چاوم پڕ بووبوو لە فرمێسک و لە قەراخی پێڵووی چاومدا مەنگیان خواردبوو، لەوەدا بوون بڕژێنە سەر ڕوومەتەکانم، لە کاتێکدا پارێزەرەکە پەڕی کرد بە کاغەزەکاندا و بە لوولکراوی خستنیە ناو جانتاکەی، ویستم پێی بڵێم، 'من هیچ بەرپرسیار نیم لەو ئیمزایانە.'
بەلام شتەکان ئەوەندە خێرا ڕوویان دا، دەرفەتی ئەوەم نەما. دوو پۆلیسەکە خۆیان کرد بە ژووردا و بێ ڕاوەستان، کەلەبچەکەیان کردەوە دەستم. لەو دەمەدا خێرا پارێزەرەکە بێ ماڵئاوایی لە ژوورەکە دەر چوو، منیش بە دەنگی بەرز بانگم لێ کرد، 'بەڕێز پارێزەر، من کوڕی خێزانێکی ناودار و دەوڵەمەندی هۆڵەندام!'
پۆلیسەکان لە دەرەوە سواری هەمان جێبی ڕەشیان کردمەوە، لەگەڵ هەمان ئەو چوار پۆلیسەدا کە هێنامیان بۆ ئەو دادگایە، ترنجاینە ناو کابینەی جێبەکە، پڕ بوو لە دووکەڵی جگەرە، جێبەکە لە شێوەی سندوقێکی چوارگۆشەدا بوو، کە تایەی لەژێردا بێت.
هەر لەگەڵ ڕێکردنماندا، گەرما ناو کابینەکەی پڕ کرد لە ڕق و

هالاوی خۆی، ئەم جارەیان بە پێچەوانەی هاتنمانەوە بۆ دادگا، هەردوو دستمیان بە زنجیری کەلەبچەکەم بە قولاپێکدا، کە بە بنمیچی جێبەکەوە بوو، هەڵواسی، ئەوسا لە خەیاڵی خۆمدا وتم، 'لەوانەیە ئەمانیش، لە ترسی تاوانبارێکی وەکوو من، زەندەقیان چووبێت.'

زۆری پێ نەچوو، شانەکانم و پاشان هەردوو باڵەکانم سڕ بوون و ئیتر بەدرێژایی ئەو ڕێگەیە، هەستم بە ئازاریان نەکرد.

چوار پۆلیسەکە، هەر لە سەرەتای سەفەرەکەماندا بۆ گەیاندنی من بە دۆزەخ، دەستیان کرد بە لێدوان، بە دەنگی بەرز وەکوو ناکۆک بن و شەڕیان بێت، چاوەڕوان بووم ئاخۆ کەی پەلاماری یەک دەدەن، بە جۆرێک لەگەڵ یەکتریدا دەدوان و چاویان لە یەکتر بز دەکردەوە، بواریان بەیەک نەدەدا و بەردەوام هەرچواریان پڕ بە کابینەی جێبەکە دەیاننەڕاند، چاوەڕوان بووم ئاخۆ کەی یەکتری دەدەنە بەر دەسترێژی گولله و لەو نێوەندەدا ڕزگارم دەبێت.

تەواو هەستی مرۆڤانەی خۆمم لەدەست دابوو، ئەوەی تەنها بیرم لێ دەکردەوە، قومێک ئاو بوو. جێبەکە کاتژمێرێک زیاتر دەبوو بەسەر ڕێگەیەکی پڕ لە چاڵوچۆڵدا دەڕۆیشت، وەکو مەڕێکی مردارەوەبووی هەڵواسراو، بەردەوام بە ڕاست و چەپمدا دەکەوتم، چووینە سەر شەقامێکی سێ ڕێچکەیی، نازانم چەند بوو بەڕێوە بووین، چونکە لەبەر بێهەوایی و لە هیلاکیمدا تاوێک بوو خەوم لێ کەوتبوو.

لە بۆنی ئارەقی بنباڵی پۆلیسێک بەئاگا هاتمەوە، خۆی توند پێوە نووساندبووم و خەریک بوو کەلەبچەکەمی لە قولاپەکە دەکردەوە، هەستم بە بوونی باڵەکانم نەدەکرد، وەکو دوو پارچە پەڕۆی تەڕ

پێمدا شۆڕ بوونەوە. لە حەوشەیەکی گەورە، کە چواردەوری بە دیواری بەرز و بە تەلی دڕکاوی تەنرابو لە جێبەکە دایان بەزاندم، چەندین پۆلیسی چەکدار تاکوتەرا لەو ناوە پیاسەیان دەکرد، پێش چوونە ژوورەوەمان، لە بەردەرگەیەکدا، ڕادەستی چەند پۆلیسێکی تریان کردم و پۆلیسەکانی هاوسەفەرم بێماڵئاوایی بەجێیان هێشتم، لە یەکێک لە پەنجەرەکانەوە چاوم لێیان بوو، سواری جێبەکە بوون و لە دەرگا بەرز و ئاسنەکەوە دەرباز بوون و لە چاوم ون بوون، بەدرێژایی ئەو ڕێگەیە، ویستم لێیان بپرسم، 'بۆ کوێم دەبەن؟'

پاش ئەوەی لەگەڵ دوو پۆلیس چووینە هۆڵێکی گەورە، کە پێدەچوو پرسگە بێت، لەوێ چەندین دەستبەسەری ترم بینی، هەریەکە بە یاوەریی پۆلیسێک و دووان بە پێوە یان لەسەر ئەو کورسییانە دانیشتبوون، کە بە ڕیز بە دیوارەکانەوە لکابوون، پاش ئەوەی دوو پۆلیسەکە لەسەر کورسییەک دایان نام، ئەملاولایان لێ گرتم و بەسەر مندا بانگیان لەیەک دەکرد و بە دەنگی نزم یەکیان دەدواند، بۆ ئەوەی گوێیان لە دەنگی یەکتری بێت، زیاتر خۆیان بەسەر مندا دەدا، هەردووکیان بۆنی هەمان سابوونی ڕیش تاشینیان لێ دەهات، زیاتر لە کاتژمێرێک لەنێوانیاندا بووم، هەستم دەکرد ئەوان بە گوێکانی مندا دەیانچپاند، ئەودەم خەیاڵم لای پارێزەرەکە بوو، بەردەوام ئەو پرسیارەم لە خۆم دەکرد، 'تۆ بڵێیت پارێزەرەکە هەواڵی من بە دایکم بگەیەنێت، یان باڵیۆزخانەم بۆ ئاگادار بکاتەوە؟'

پۆلیسێکی ڕەشتاڵەی بالابەرزی قەڵەو، هەمان جلی پۆلیسەکانی تری لەبەردا بوو، ڕەنگی جلەکانی، سەوزێکی کاڵتری دەنواند،

فایلێکی لوولکراوی لەنێو دەستدا بوو، تۆپەڵێک کلیلی جۆراوجۆری بە بەرورگیەوە بەر دابوونەوە و بەردەوام زرەیان دەهات، بێ ئەوەی هیچ بڵێت و تەنانەت مۆڵەت لە دوو پۆلیسەکەی تەنیشتم وەر بگرێت، کە زیاتر لە کاتژمێرێک دەبوو پاسەوانی و چاودێریی منیان دەکرد، دەستی دایە زنجیری کەلەبچەکەم و هەڵی ساندمە سەر پێ، پاشان بەدوای خۆیدا کێشی کردم.
دوای ئەوەی تاوێک بە چەندین ڕاڕەوی چۆڵ و شێداردا ڕۆیشتین، گەیشتینە ناو ژوورێک، پێدەچوو حەمام بێت، پۆلیسەکە هاتە بەردەمم و کەلەبچەکەی لە دەستم کردەوە، بە چەند ڕستەیەکی عەرەبی و بە ئاماژە، داوای لێ کردم جلەکانم دابکەنم، لەو دەمەدا پۆلیسێکی تر، کە کیسەیەکی گەورەی ڕەشی پێ بوو، پەیدا بوو، بە لێدوان و پێکەنینەوە هات و لەتەنیشت پۆلیسی یەکەمەوە ڕاوەستا، ئەویش لە پۆلیسی یەکەم باڵابەرزتر و زلتر بوو، بەڕووتی لەنێوانیاندا ڕاوەستا بووم، لەوپەڕی گومان و بێزاریمدا سەرسام لێم دەڕوانین. تاوێک وەکو منیان لە بیر چوبێتەوە، وەستابوون و لەگەڵ یەک دەدوان و منیش بەڕووتی چاوەڕوانی فەرمانی ئەوانم دەکرد، ئینجا یەکێکیان بە دارەکەی دەستی ئاماژەی بە یەکێک لە دووشەکان کرد، بە چواردەوری ژوورەکەدا هەموو جێگەی خۆشۆرین و خۆگۆڕین بوون، بە دوو مەترێک بەرزییەوە دەیان ئاو پرژێنی دووشکردن، کە دوودڵ بووم ئاخۆ بچمە بەر کامیان، تاکوو یەکێک لە پۆلیسەکان نووکی دارەکەی دەستی لە پشتم توند کرد و بۆ بەر دوشێک پاڵی پێوە نام، کاتێک چاوەڕوان لەبەریدا ڕاوەستابووم، بە تیلەی چاوم سەرنجم لەسەر سەرم دەدا، بەگومان بووم لەوەی ئاخۆ چی

بەسەرما دەبارێت، ئاوی سارد یان گەرم، تاوێکی پێ چوو، چونکە پۆلیسەکان لە گەرمەی لێدوانەدا بوون و زووزوو منیان لەبیر دەچووەوە.
دەستم لەتەنیشتمەوە شۆڕ کردەوە و سەرم داخست و چاوم نووقاند، ئەوکات نەمدەزانی چاوەڕوانی چیم دەکرد.
نەمزانی کامیان ئاوەکەیان بەسەرمدا بەر دایەوە، ڕاچڵەکیم و هاوارێکم کرد. ئاوەکە زۆر سارد بوو، دوای شەش مانگ، ئەوە دووەم جارم بوو ئاو بەر گیانم بکەوێت، پۆلیسەکان لێم نزیک بووبوونەوە و بە دارەکانیان، ئاماژەیان پێ دەدام و پێدەکەنین، ئەوەندە چڵک و چەوری لەسەر پێستم کەڵەکە بووبوو، پێستم وەکو گیاندارێکی ئاوی دڵۆپی ئاوەکانی لەسەر دەخلیسکان، یەکێک لە پۆلیسەکان پەلی گرتم و بەدوای خۆیدا ڕایکێشامە ناوەڕاستی هۆڵەکە، بەردەوام بە دارەکانیان دەیانکێشا بە قنگی ڕووتمدا، نەمدەزانی ڕوو لە کامیان بکەم و ئاخۆ لە کامیان دڵنیا بم، ڕووم لە هەرکامێکیان دەکرد، ئەوی تریان لەپشتمەوە زرمەی لێ هەڵدەستانم، یان دارەکانیان لە گەڵوگونم دەئاژنی، لە کاتێکدا ڕووم لە یەکێکیان کردبوو، بە تووڕەییەوە لێی ڕوانیم و لەناکاو پەلاماری دام، باوەشی پیا کرم و توند بە خۆیەوە نووساندمی، لەدوامەوە ئەوی تریان هەوڵی دەدا دارەکەی دەستی لەنێوان گوپی قنگمەوە بکەیەنێتە ناو لەشم، هەموو ماسولکەکانی لەشم توند گرژ کردن و هێزم دایە بەر خۆم، بەڵکوو بتوانم قنگم توند دابخەم. هاوارم نەدەکرد لێیان و تەواو بێدەنگیم هەڵبژارد، هەستم پێ کرد ڕۆحم تاوێک لە لاشەم دەر چوو، فڕی بە ژوورەکەدا، لاشەی خۆمم بینی، چۆن دوو دڕندە نا مرۆڤانە نینۆکیان لە پێستم

دەچەقاند و گازیان لێ دەگرت، دوای ئەوەی هەردووکیان تەواو ماندوو بوون لە ئازاردان و گاڵتە پێکردنم، یەک یەک جلی ناو کیسە ڕەشەکەیان بۆ ڕاگرتم و لەبەرم کردن، هەمان ڕەنگی جلی بەندینخانەکەی پێشووم بوون، جیاوازییان تەنها ژمارەکانیان بوو، ئەمەیان بە خەتی عەرەبی لەسەری نووسرابوو، بە سەرو گوێلاکی تەڕەوە، جلەکانم لەبەر کردن، دیسانەوە کەلەبچەکەیان لە بازووم توند کرد، یەکێک لە پۆلیسەکان، بەدوای خۆیدا ڕایکێشام، چاوەڕوان بووم ئاخۆ چ وێستگەیەک و چ ڕووداوێکی تر چاوەڕوانمە، کاتێ لەنێوان پۆلیسەکاندا بە ڕاڕەوێکی دوورو درێژدا دەڕۆیشتین، سەرنجم دا، بە زەحمەت سەرم دەگەیشتە شانیان و وەکو تۆپی تێنس، لەبەینی باڵە ئەستوورەکانی ئەواندا ئەمبەر و ئەوبەری دەکرد، لەگەڵ هەموو بەرکەوتنێکمدا، پێکەوە قاقایان لێدەدا، خۆم بۆ شل کردبوون و لەگەڵیاندا لەو یاریکردنەی ئەواندا بەشدار بووم.

گەیشتینە هۆڵێک، کە لە قاوەخانە و چێشتخانە دەچوو، لەسەر یەکێک لەو هەموو کورسی و مێزانەی لەو هۆڵەدا بوون دایان نام، هۆڵەکە پڕ بوو لە ڕووناکی، بێجگە لەوەی دەیان گڵۆپی سپی بە بەرزییەوە دەگڕان، ئەملاولای هۆڵەکە بە پەنجەرەی گەورە تەنرابوو. دیسان کەلەبچەکەیان لە دەستم کردەوە، دەستم ساردوسڕ و کەمخوێن، مێروولەیان دەکرد، تاوێک خەریکی تێڕوانین و هەڵگلۆفتنیان بووم، تاوەکوو تۆزێک هێز و ڕەنگیان هاتەوە بەر. یەکێک لە پۆلیسەکان ڕۆیشت و ئەوی تریان بێدەنگ لەپشتمەوە ڕاست لێی ڕاوەستا، تاوێک بوو تیشکی خۆرەکە ڕێک لە دەموچاوی دەدام. گەرم بوو، بەڵام بێزاری نەدەکردم، چاوم

لێک نا و بە خەیاڵ گەڕامەوە بۆ ئەو ڕۆژەی یەکەم ڕۆژم بوو لەم سەفەرە دووروردرێژەمدا، دەمێک بوو دەمویست سەفەرێک بکەم و چەندین ساڵ بخایەنێت و هەموو وڵاتانی دونیا بەسەر بکەمەوە، دیارە لە ژیانمدا ئەمە دوایین سەفەر و دوایین جێگەمە، ئەوەی ئەوکات نەمدەوێرا بیری لێ بکەمەوە، دایکم بوو، نەمدەویست لە خەیاڵمدا، دایکم بە نەخۆشی و جەستەیەکی پڕ لە برین و شێوازێکی شێواو و داڕزاوەوە ببینم، بەو هەموو ئەشکەنجە و بێزارییەم ڕازی بووم، چونکە لە بیرکردنەوەم لە دایکم دایان دەبڕیم.

بەئاگا هاتمەوە، کاتێک پۆلیسێک سینییەکی زەردباوی پلاستیکی لە بەردەممدا دانا، قاپێکی قووڵی پلاستیک و کەوچکێک و سێوێک و پارچەیەک نانی لاکێشەیی هەڵئاوساوی لەسەر بوو، نانەکە لە خڕکەبەرد دەچوو، سێوەکە لە سووچێکی سینییەکەدا، هێشتا دەخولایەوە، دیار بوو هێزی دەست و مەچەکی پۆلیسەکە کاری لەسەر ئەویش مابوو، پۆلیسەکە لەپە دەستێکی بە سەرمدا کێشا، وەک باوکێک، چۆن فەرمان بەسەر منداڵیدا دەکات، بە پەنجە ئاماژەی بە سەر سینییەکە دا و هیچی نە وت، بێ ئەوەی بیری لێ بکەمەوە چی دەخۆم و چ جۆرە خۆراکێکە، نان و شۆرباکەم تەواو کرد، لە کاتێکدا سێوەکەم لەناو دەستم توند گرتبوو، دوای چەندین مانگ، بۆ یەکەم جارم بوو میوە ببینم، لە خەیاڵمدا بە خۆمم وت، 'پێدەچێت ئەم وڵاتە میوەی کەم بێت!'

لەگەڵ سێوەکەی ناو دەستمدا، لە گفتوگۆدا بووم و لە خۆ ئامادە کردندا بووم، ئاخۆ چۆن دەست بکەم بە خواردنی و ددانەکانم لەکوێی بچەقێنم. یەکێک لە پۆلیسەکان دەستی دایە باڵم و هەڵی

ساندمه سەر پێ و ئەوی تریان کەلەبچەکەی کردەوە بازووم، بە هێزێک، کە نەمتوانی بەرەنگاری ببمەوە، سێوەکەی لە دەست دەرهێنام، کاتێ لە شانمەوە ڕێی دەکرد، دەستی کرد بە داکرمانی سێوەکەم، لە عەزرەتدا بەو تام و چێژەی لە خەیاڵمدا هەڵم گرتبوون، ناو دەمم پڕ بوو لە شەربەتی سێو.

ئەو ڕۆژە، دوای ئەو هەموو ڕووداو و دەردی سەرییانە. بردمیان بۆ زیندانێک، قەرەوێڵەیەکی ئاسنی دووقات و ئاودەستێکی ڕۆژهەڵاتیی تێدا بوو، ئاودەستەکە کونێکی خڕی بچووک بوو، کە لە کۆنکریتی زیندانەکە کرابوو، بەلوعەیەکی ئاویش لە شانیەوە بوو، دیوارەکانی بە نووسین و هێڵکاری ناتەبا داپۆشرابوو. چاوم گێڕا بە سەر و خواری جێگەکاندا بۆ هاوزیندانییەکەم، پۆلیسەکان کەلەبچەکەیان لە بازووەکانم داماڵین، فرسەتم هێنا و ڕووم تێ کردن و لێم پرسین، 'دەتوانم پرسیارێکتان لێ بکەم؟'
پۆلیسەکان دایانە قاقای پێکەنین و شانەکانیان بەرز کردەوە و یەکێکیان سەرێکی بۆ ڕاوەشاندم و ئەویدیان وتی، 'یەس.'
لە خۆئامادەکردندا بووم و ویستم دەمم بکەمەوە و بدوێم، هەر هەمان پۆلیس وتی، 'نەو.'
هێندەی لەبیرم مابێت، ئەوکات ویستم لە پۆلیسەکان بپرسم، 'ئایا لەکوێم و لە چی زیندانێکدام و کەوتومەتە چی جێگەیەکی دونیاوە.'
هەردووکیان بە پێکەنین و دووبارەکردنەوەی هەمان دوو وشەوە، 'یەس، نەو' لێم هاتنە پێشەوە و لە دیوارەکەیان توند کردم، زیاتر لە دەیان جار بە لەپی دەستە پان و پڕ هێزەکانیان، دەیانکێشا بە

سەروگوێلاکمدا، بێ ئەوەی هیچ بەرگری لە خۆم بکەم، یان هەر هیچ نەبێت، بازوو و دەستم بکەم بە قەڵغان بۆ دەموچاوم، ڕاست پشتم لە دیوارەکە توند کرد و تووڕە چاوم لە چاوە بێشەرم و زیتەکانیان بڕی.

تاوەکو هێزم لێبڕاو کەوتمە سەر زەوی زیندانەکە، نازانم چەندێک بوو لەسەر شانی ڕاستم خۆم گرمۆڵە کردبوو. لەسەر ئەو کۆنکریتە شێدارە، ڕۆحم لە قووڵایی جەستەی تێکشکاومدا مات کرد، چاوم لێک نا، گوێم لێ بوو، دەرگای ئاسنی زیندانەکە داخرا، بە ئەستەم دەنگی پۆلیسەکانم لە دەرەوە دەهاتە وێ، هێشتا قاقایان لێ دەدا و زووزوو بۆ یەکترییان دەسەندەوە و دەیان وت،

'یەس.'

'نەو.'

'یەس.'

'نەو.'

# ٨

# حمار

چاک دەمزانی بەندکردنم، بە هەموو مانایەک نەهامەتییەکی گەورەیە و ئەگەر وا بڕوات، دەروونم هەڵدەقرچێنێت و لە ماوەیەکی کورتدا هێزم لێ دەبڕێت و لە تەواوی خەیاڵەکانم و ڕابردووم دام دەبڕێت.

شەوی یەکەمم لە زیندانە نوێیەکەمدا، زیاتر لە کاتژمێرێک بەدوای پلاکی کوژانەوەی ئەو گڵۆپە زەردەڵەیەدا گەڕام، کە بە بنمیچی ژوورەکەوە شەو و ڕۆژ دەگڕا، ڕووناکییەکەی بێزاری کردبووم، شەوقی لە قووڵایی ئەو دیوارە ڕەشکراوە جەنجاڵەدا دووبارە دەگڕایەوە، پاش ئەوەی کۆڵم دا و نەمدۆزییەوە، نائومێد لێی دانیشتم، لە خەیاڵی خۆمدا وتم، 'لەوانەیە شێوە خوویەکی شانۆ ئامێز بێت. چەندین سەدەیە لە وڵاتی بەریتانیا، لەناو شانۆکاراندا بووە بە باو، شەوان هۆڵی شانۆکانیان بەتاریکی بەجێ ناهێڵن و هەمیشە گڵۆپێک لەسەر تەختەی شانۆکان دەگرێت، بە مەزەندەی

ئەوان، بۆ ڕۆحیانەتەکانە و بەردەوامیدانە بە جووڵە لەسەر تەختەی شانۆ.'

بەڵام تۆ بڵێیت من، لە ڕاستیدا، ئەوکات نەمدەوێرا بیر لەوە بکەمەوە، ئاخۆ من ئەکتەری ڕۆژم یان شەو، تاوێک لە چاوەڕوانیی بینەر و ئەکتەری تردا بووم، لە چاوەڕوانیی ئەو خێوانەدا بووم، کە پێدەچوو هاوشێوەی من بوونایە. بە قەرەوێڵە ئاسنەکەدا هەڵگەڕام و لە پەنجەرەکەوە بانگم دەکرد، پاشان بە کوڵەمستم چەند جارێک لە دەرگاکەم دا، لەناکاو، لە ژوورەکانی ترەوە دەست کران بە هاوار و بانگ، بەندکراوەکان بۆیان دەسەندمەوە و بە هەمان شێوەی من لە دەرگاکانیان دەدا، لە نادیارەوە هاتوهاواری ناو تەواوی بەندینخانەکەم دەبیست.

پێدەچێت ئەوکات، لەژێر ڕووناکیی ئەو گڵۆپە زەردەدا، لەناو هاتوهاواری خۆمدا ماندوو بووبێتم و لەسەر قاتی خوارەوەی قەرەوێڵەکە، تەخت لەسەر پشت خەوم لێ کەوتبێت.

کاتێک لە ئازاری ناوسکم و تۆنی دەنگی خۆم لە خەو ڕاپەڕیم، خێرا هەستام و لەسەر جێگەکەم دانیشتم، چاوم هەڵگڵۆفت، پاشان لەتاو ئازار، دەستم خستە نێوان ڕانەکانمەوە، تەماشام کرد دوو پۆلیس بەسەرمەوە ڕاوەستابوون و قاقایان لێدەدا، جارجار بە دارەکانی دەستیان، ئاماژەیان پێ دەکردم، چەندین ڕۆژ دوای ئەو ڕۆژە، لەگەڵ میزکردنمدا خوێنم دادەنا. لەدوای ئەو ڕۆژەوە تێگەیشتم، کە دەبێت بەیانییان زوو، لە کاتی دیاریکراودا، بەخەبەر بم، لە کاتێکدا بەیانییان پۆلیسەکان دێن بۆ سەرژمێریی زیندانییەکان و پشکنینی ژوورەکان.

ڕۆژی دوایی، هێشتا تاریک و ڕوون بوو، پۆلیسێک دەللاقەی ناو دەرگا ئاسنەکەی کردەوە و چاوێکی بە ژوورەکەدا گێرا، ئەوکات لەپێش دەلاقەکە ڕاست ڕاوەستابووم، دیار بوو هەر ئەوەندە بەس بوو، هەموو بەیانییەک، بۆ ئەوەی دڵنیا بن لەوەی من نەبووم بە مارمێلکە یان قالۆنچە و لە درز و بەینی شیشەکانەوە هەڵنەهاتووم، چەند پۆلیسێک سەردانییان دەکردم.

لە دەمەونیوەڕۆی ئەو ڕۆژەدا، پۆلیسێک لە دەللاقەکەوە قاپێک برنجی دایە دەستم، تاوێک ڕاوەستام و وام زانی پۆلیسەکە کەوچکی لەبیر چووە، دوای زیاتر لە کاتژمێرێک چاوەڕوانیم، برسێتی زۆری بۆ هێنام و بە سەری پەنجەکانم کەوتمە ڕاوکردنی دەنکە برنجەکانی ناو ئەو زەرداوەی بۆنی میزی لێ دەهات.

لەسەر قەراغی جێگەکە دانیشتم، هێشتا قاپی خۆراکەکەم لەناو دەستدا بوو، دەللاقەکە کرایەوە و هەمان ئەو پۆلیسەی خۆراکەکەی بۆ هێنام، بە عەرەبی چەند وشەیەکی پێ وتم، زوو حاڵی بووم کە قاپی خۆراکەکەی دەویست، خەریک بوو پێی بڵێم، کە هێشتا تەواو نەبووم، بەڵام پرسیارەکەم گۆڕی و لێم پرسی، 'ئایا پلاکی کوژاندنەوەی ئەو گڵۆپە لەکوێی ژووری زیندانەکەمدایە؟'

سەرێکی لێ با دام و دیسان داوای قاپەکەی لێ کردم، وەکوو لێم تێنەگەیشتبێت، قاپی خۆراکەکە، کە تەنها زەرداوەکەی تێدا مابوو، خێرا بە نابەدڵییەکەوە نام بە سەرمەوە و هەڵم قوڕاند، ئینجا قاپەکەم بەبەتاڵی دایەوە دەستی، پۆلیسەکە تاوێک سەرسام لە چاومی ڕوانی و بێدەنگ دەللاقەکەی بە ڕوومدا داخست.

بیرم لێ دەکردەوە، کە پێدەچێت ئەم ژوورە ببێتە شوێنی

هەمیشەیی ژیانم، یانی تاکوو مردن لێرەدا بمێنمەوە، لەو دەمەدا بە خۆمم وت، 'یان تۆ بڵێیت ئەو پارێزەرە باڵیۆزخانەی هۆڵەندای ئاگادار کردبێتەوە، ئیمەیڵێک یان تەلەفۆنێک، بەڵام بۆ کێ؟ دەبێت دایکم لە ژیاندا مابێت؟ یان کارمن مەیلی بۆ من مابێت و لە خۆی ببووریت و بێت بۆ ئەم دوورەوڵاتە و رزگارم بکات، لەو زیاتر، دەبێت کێ هەبێت هەوڵێکم بۆ بدات، یان کارڵ، ئەو هاوڕێ نوێیەی دایکم، نازانم، نامەوێت بە خەیاڵیش هۆگری هیچ یەکێک لە هاوڕێکانی دایکم ببم.'

کەمتر بیرم لە جەستەم دەکردەوە و زیاتر لەناو خەیاڵمدا دەژیام، بەردەوام چاوم بە ژووری زیندانەکەدا دەگێڕا، هەموو شتێک ڕەنگی تەپوتۆزی ئەو بیابانەی گرتبوو. دیوارەکان، هەتا دەست پێیان گەیشتبوو، هێڵکاری و نووسینیان لەسەر بوو، بنمیچ و ئەرزەکە شێدار و کەڕوویەکی سەوزبا و ڕەنگ و ڕوخساری ڕاستی داپۆشیبوون، لە پەنجەرە چوارگۆشەکەوە، بە ڕۆژدا خۆر ژوورەکەی پڕ دەکرد لە ڕووناکی و وزەی خۆی.

قاتی سەرەوەی قەرەوێڵەکە، بەرزییەکەی دەگەیشتە ئاستی لێواری پەنجەرەکە، پەنجەرەکە بە شیشی ئەستووری ژەنگ گرتوو تەیمان کرابوو، دیار بوو لە ئەزەلەوە بیر لەوە نەکرابووەوە، شووشەی تێ بگیرێت، پەنجەرەکە بەسەر بیابانەکەدا دەیڕوانی، دەیڕوانی بەسەر یەک پارچە چۆڵەوانیدا، نازانم چەندێک بوو دەستم لە شیشی پەنجەرەکە هەڵپێکابوو، لە بەرفراوانی و بەتاڵی و ساف و بێگەردیی ئەو بیابانەم دەڕوانی.

چەندین شەو و ڕۆژ بەو شێوەیە تێپەڕین، زۆربەی کاتەکانم لە بەردەمی پەنجەرەکەدا بەسەر دەبرد، تەنها ئەو ڕەنگە زەردباوە

بوو، لەگەڵ ڕەنێگی شینی کاڵی بێگەرددا، کە ڕۆژێک نەبوو هەورێک بەری بگرێت، زۆر جار شنەی بام لە کاتی جووڵەیاندا دەگرت، کاتێک چنگێک پڕ لمیان لەو دەوروبەرە هەڵدەگرت و دەیانپرژاند، تاکوتەرا گردی بەرز و نزمیان لێ دروست دەکردن، لەبەر خۆمەوە وتم، 'دەبێت کێ و ڕۆحی کێ، لەو بیابانەدا بژی و دەستی ڕەنگینی خۆی بە ڕووی تەخت و بێڕەنگی ئەو چۆڵەوانییەدا بێنێت و بەردەوام یاری لەگەڵ سروشت بکات.'

لە سەرەتاوە، زۆربەی کات لەبەر پەنجەرەکەدا ڕادەوەستام و بە سەرنجەوە لە بیابانەکەم دەڕوانی، چاوەڕوان بووم ئاخۆ کەی، مرۆڤێک، گیاندارێک بەو بیابانەدا تێدەپەڕێت، شەوانە باڵاخانەی ئەو بەندینخانەیە پڕ دەبوو لە دەنگی گریان و چرینی گۆرانیی دڵتەنگ و هاتوهاوار لە یەکتری، بێجگە لەوەی بەردەوام دەرگا و دیوارەکانیان دەکوتا. گەرمای ڕۆژ و ئەو تەپوتۆزەی هیچ ڕێگرییەک نەبوو لە هاتنەژوورەوەیاندا، لەگەڵ ڕەشەبا ژوورەکەیان پڕ دەکرد لە خۆڵ و لمی بیابانەکە، لە سەرەتاوە سەرمای شەو ماسولکەکانی لەشمیان گرژ دەکرد و بەردەوام ئازاریان دەهات، لە یەکێک لەو ڕۆژانەدا، لە خۆئامادەکردندا بووم بۆ بەرەنگاربوونەوەی سەرمای شەو، لەبەر پەنجەرەکە، دەستم کرد بە تەکاندنی ئەو دوو پێخەفەی لەسەر هەردوو جێگەکە بوون، تەپوتۆز و بۆگەنیان لە ژوورەکەم دەر نەدەچوون و بە دیوار و سەروگوێلاکمدا دەهاتنەوە، وەک ئەوەی بۆیان نەبێت لە ژووری زیندانەکە دەر بچنە دەرەوە. پێخەفەکان تا هەناویان پڕ بووبوو لە تۆز و لمی بیابانەکە، بۆنی ساردی و کەڕووی ژوورەکەیان گرتبوو، لە کاتی هەڵدانەوەی پێخەفەکاندا، چەندین پارچە جلم

لەژێریانـدا دۆزییـەوە، ئـەوکات لەبـەر خۆمـەوە وتـم، 'پـێش مـن، زیندانییەک لێرە بووە، کاتێک ئازاد کراوە، لەبیری چووە.'

یەک یەک تەکاندمن و تاوێک بە ڕووی شیشی پەنجەرەکەدا، لەبەر خۆرەکـە ڕام گـرتن، بـەو نیـازەی، گـەرمی خۆرەکـە ئـەو بۆدڕنـە مردووەیان لێ دابماڵێت، تا شـەوان لەبەریان بکـەم و لـە سـەرمای شەوی ئەو بیابانە بمپارێزن.

لەسەر یەکێک لە جێگەکان، لەسەر لا کەوتبووم، تاوێک بـوو دەنگم لـە خـۆم بڕیبـوو، گـوێم بـۆ هـەموو دەنگێـک هەڵخسـتبوو، کـە لـە پەنجـەرە و دەرگـا و دیوارەکانـەوە دەهـات، چـاوم بڕیبـووە ئـەو هێڵکاری و نووسینانەی لەسـەر دیواری بەرامبـەر جێگەکەمدا بـە ناوازە لێمـەوە دیـار بوون، ئـەوەی لـە منـەوە دیـار بـوو، چەنـدین چـاوی زرت و ڕەش بـوو، خـەیاڵیان ورووژانـدم و لـە قـووڵایی بیرەوەرییەکانمدا بۆ ئەو ڕۆژەیـان گێڕامـەوە، 'ڕۆژێکی خۆرەتـاوی مـانگی حەتـەوت بـوو، لەگـەڵ دایکمـدا، قۆڵمـان لـە قـۆڵی یـەک هــەڵپێکابوو، لــە بــەردەم *زانکـۆی سەربەسـتی ئەمسـتردام* دا ڕاوەسـتابووین، چواردەورمـان بـە هـاوڕێ و کەسـوکاری قوتابییـەکان گیرابـوو، هـەموو بـۆ وەرگرتنـەوەی بڕوانامـەکانمان ئامادە بووین.

دایکم چاوی بـە چواردەورماندا گێڕا و توند باڵی گوشـیم و پێـی وتـم، 'ئەمـە ئـەو ڕۆژەیـە، پـاش چەنـدین سـاڵ هـەوڵ و کۆشـش، هونـەر و مێـژووی هونـەر، بڕوانامـە لـەو بـوارەدا... دەمـێ سـاڵە خەونت بوو.'

بـەبێ ئـەوەی لێـی بـڕوانم، بە پێکەنینێکـەوە لەبـەر خۆمـەوە وتـم، 'دەترسم شانازیم پێوە بکەیت!'

هێواش و بە مەکرێکەوە وتی، 'کەمێک.'
تایبەت بۆ ئەو ڕۆژە، قاتێکی چاکەت و پانتۆڵی ڕەشم لەبەر کردبوو، بۆینباخێکی جەرگی، بۆ جاری یەکەمم بوو بۆینباخ ببەستم و بەردەوام دەستم پێوەی بوو، ئەویش بیرۆکەی دایکم بوو. بەبیرم دێت، دایکم چەند جارێک داوای لە چەند قوتابییەک کرد، کە بە کامێراکەی خۆی وێنەمان بگرن، ئەو ڕۆژە دایکم بە جۆرێک خۆی گۆڕیبوو، کە سەرنجی هەموو ئامادەبووانی ڕاکێشابوو، قژە لوول و ڕەشەکەی بەسەر شانیدا بەر دابۆوە، عەزییەکی ڕەشی تا سەر سمتی تەسک و لە پێش و پاشەوە، وەک خۆی بەئەنقەست دڕاندبێتی، فش دیار بوو، بە جۆرێک تایبەتمەندییەکی دابوو بەو باڵا و لەشولارە ڕێکەی، لەگەڵ هەموو بەریەککەوتنێکماندا، هەستم بە گەرمیی لەشی دەکرد، زۆر دڵشاد و بەختەوەر دیار بوو، منیش زۆر بە شانازییەوە لە شانیەوە ڕاوەستابووم، دەمویست ڕووم لەو خەڵکە بکەم و هاواریان لێ بکەم و بڵێم، 'خەڵکینە، ئەو ئافرەتە جوانە دایکی منە.'
لەو کاتەدا دایکم شانێکی تێوە ژەندم و پرسیی، 'کەی، ئەوان دێن؟'
'ئەوان، کێ... ئەوان؟'
'کارمن.'
کاتێ ویستم وەڵامی دایکم بدەمەوە، لەو دەمەدا کارمن لە دوورەوە پەیدا بوو، دەم بە پێکەنین و ڕووخۆش، لەگەڵ کوڕێکدا بوو، کە ئەویش قوتابی بوو لەگەڵماندا، هەروەها کچێکی باڵابەرزی قژ زەردی سپیکەلانەی چاو شینی لەگەڵ بوو، من و کارمن دواساڵی خوێندنمان بوو، ئەو ڕۆژە بڕوانامەی کۆتاییمان

وەر دەگرتەوە. کارمن دووراو دوور، هەردوو باڵی ڕووبەڕووی من و دایکم والآ کردن و بە دەنگی بەرز بانگی لێ کردین، 'ئازیزان، ڕۆژتان باش.'

دایکم پێش من کەوت و باوەشێکی بە کارمندا کرد، لە کاتی ماچکردنیدا پێی وت، 'بەختەوەرم کە دیسان دەتبینمەوە، ئازیزم کارمن.'

کارمن دایکمی توند بە خۆیەوە نووساند، ئینجا لەسەر شانی دایکمەوە لە منی ڕوانی و وتی، 'منیش هەروەها، ئەیفا خان.'

کاتێ لەگەڵ دایکمدا دەستیان لە یەک بەردا، کارمن لە من هاتە پێش و زمانێکی تەڕی بە لچ و لێوی خۆیدا هێنا و دەمی نایە ناو دەمم.

نازانم لەو ساتەدا ئێمە چەندمان پێ چوو، دوو جار دایکم قەراغی چاکەتەکەمی ڕاکێشا و وتی، 'تەواو، تەواو، دەی ئەوەندە بەسە، پێم بڵێن، ئەم دوو بەرێزەی تر کێن؟'

پاش ئەوەی کارمن خۆی لە نێوان باڵەکانم دەرهێنان، بەڵام هێشتا دەستێکی هەر لەناو دەستمدا بوو، ڕووی لە کچەکە کرد و وتی، 'ئەوە ئانایە، ئامۆزامە، ئەمڕۆ لەبری دایکم لەگەڵم هاتووە، هەروەها بۆ جاری یەکەمیەتی شاری ئەمستردام ببینێت.'

پاشان دەستی بۆ فیکتۆر ڕاکێشا و وتی، 'ئەوەیش فیکتۆر لاورینت، هاوڕێ و هاوپۆلی من و مارتن.'

کاتێ بێدەنگ سەرنجم لە ڕوخسار و بالآی ناسک و ئاڵتوونیی ئانا دابوو، کارمن ڕای وەشاندم و دەمی نایە پەناگوێم و لەبن لێوەوە چپاندی، 'ئەگەر بە ئانا سەرسامی، ئەوا بۆت هەیە ئەمشەو سواری ببیت.'

دەستم لە کەمەری هەڵپێکا و بە گوێیدا چپاندم، 'سوپاس بۆ ماریفەتت، پێویست ناکات، ئەمشەو لەگەڵ تەیرەکەی خۆمدا دەچمە ناو جێگەوە، خۆی دەزانێت چەندێک تامەزرۆیم.'

پاش ئەوەی لەگەڵ ئانا دەستی یەکترمان ڕاوەشاند و ئەملاولایم ماچ کرد. تەوقەیەکی هاکەزایشم لەگەڵ فیکتۆردا کرد، فیکتۆر کوڕێکی باڵاکورت، دەموچاوێکی قوپاوی لاوازی هەبوو، لەوانە بوو کە پێش بیست ساڵییان، سەریان دەست دەکات بە ڕووتانەوە، بە ڕواڵەت لە پیاوێکی پەنجاساڵە دەچوو، وەکوو کارمن، خەڵکی بەلجیکا و دانیشتووی شاری برۆکسڵ بوو، ماوەی چوار ساڵی خوێندنیان پێکەوە، فیکتۆر هاودەنگ و هاوسەفەری کارمن بوو، ئەوسا کارمن بە منی دەوت، 'فیکتۆر تەنها هاوڕێی سەفەرمە.'

ئاهەنگی دەرچوونمان بۆ ئێمە، تایبەتمەندییەکی ئەوتۆی نەبوو، بێجگە لە چاوەڕوانی و گوێگرتن لە چەندین وتاری درێژی چەند پرۆفیسۆرێک و یەک بە یەک خوێندنەوەی ناوی قوتابییان و وەرگرتنی بڕوانامەکانمان، کە ئێمە تەنها بۆ ئەوە لەوێ ئامادە بووین. لەگەڵ وەرگرتنی بڕوانامەکاندا، لە هۆڵەکە دەر چووین و بەرە و سەنتەری شار بەڕێ کەوتین، پاش ئەوەی دایکم لە ڕێگا لێمان جیا بووەوە و بەجێی هێشتین، ئەگەر باش بەبیرم بێت، ئەو ڕۆژە دایکم لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی شێوەکاریدا پێشانگەی هاوبەشی کردبووەوە.

تاکوو ئێوارە درەنگ، چوارقۆڵی بە شاردا گەڕاین، لە چەندین بار و قاوەخانە لامان دا و بە بیانووی دەرچوونمانەوە، هەرجارە جۆرێک لە مەشروومان داوا دەکرد، کاتێ لە کۆفیشۆپێک لامان دا، سەرەتا لە بیرەوە دەستمان پێ کرد، پاشان کردمان بە

پێشبڕکێ و هەرجارە یەکێکمان جۆرێک لە ویسکیی داوا دەکرد، بە ڕادەیەک مەست بووبووم، مەیلم زیاتر بە ئانا دەدا وەک لە کارمن.
لە کاتێکدا کە هەموو قاقامان لێدەدا، لەپڕێکدا کارمن خۆی خستە سەر کۆشی فیکتۆر، دەمیان نایە ناو دەمی یەکتری و تاوێک بەسەر یەکدا نوشتانەوە، لە سەرەتاوە بە گاڵتە دەهاتە پێشچاوم، لەگەڵ ئانا پێکەنینمان پێیان دەهات، مەست بووم و لەنێوان ڕاستی و خەیاڵدا، خۆمم لێ ون بووبوو. بەگومان بووم، نەمدەزانی ئاخۆ ئەوەی ڕووی دا، ڕاستی بوو یان خەیاڵ، دڵگەرم و بێ ئارام، جێگەم بە خۆم نەدەگرت، زووزوو قومی قووڵم لە ویسکییەکەم دەدا و لەناو خەیاڵمدا نوقم بووبووم، بە خۆمم دەوت، 'هەڵبەتە ئەوانیش زۆر مەستن و هۆشیان لەلای خۆیان نییە.'
ئانا لەتەنیشتمەوە دانیشتبوو، زۆر مەست دیار بوو، خۆی لێ هێنامە پێش و لێی پرسیم، 'بیر لە چی دەکەیتەوە؟'
پاش تاوێک بێدەنگی و لەخۆمداگەڕان لە وەڵامێک، وتم، 'هیچ!'
باڵێکی خستە سەر شانم و دەمی هێنایە نزیک گوێم و لەبن لێوەوە چپاندی، 'تا کەی من و تۆ ئاوا بێدەنگ دانیشین و لەوان بڕوانین؟'
پێش ئەوەی ڕووی خۆی بە ڕوومەتمەوە بنێت و توند باڵەکانی لە ملمەوە بئاڵێنێت، هەردوو ڕانی بەسەر ڕانەکانمدا درێژ کرد و خۆی خستە سەر کۆشم، لەو دەمەدا، منیش بە تیلەی چاوێک کارمنم بەسەر کردەوە، ئەو لەگەڵ فیکتۆر، لە گەرمەی قسەکردندا بوو، لێ و لێوم تەڕ کرد و هێواش بەسەر ڕوومەتی ئانامدا خشاند، بۆنێکی قورس و پیاوانەی لە خۆی دابوو، لەگەڵ بۆدڕنی

ویسکی و ئارەقی لەشمان و بۆنی جگەرەدا تێکەڵ بووبوو، بەلام جوانیی ئانا و بێزار بوونم، لچ و لێوی ئانایان پێ لستمەوە، ئەوەندە خۆی لێ توند کردبووم، لەسەر جلەکانیشیەوە هەستم بە رووتیی ئەندامەکانی جەستەی دەکرد، توند چاوم داخست و ئەمەم بە خەیاڵدا هات، 'ئێمەی مرۆڤ، پێویستە جارجار خۆمان بەقووڵی مەست بکەین، تەنها مەستییە وامان لێ دەکات، کە بۆ ساتێک خۆمان و ئازاری خۆشەویستیمان لەیاد بکەین، ناوبڕێک وەر بگرین، کە ڕۆحی من و کارمن پێویستی پێیەتی، بەڵکوو تاوێک لە گیانکێشانی یەکتر دەست هەڵبگرین و ساتێک فڕین بە یەکتری ڕەوا ببینین، بەڵکو بتوانین ئەو سنوورە بشکێنین، کە ناوی غیرە و دڵپیسییە، سنووری خۆشەویستییەک بشکێنین، کە لە خۆپەرستیمانەوە سەرچاوەی گرتووە.'

ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژە، سالانێک خەیاڵی من و کارمنی شێواند. لەیادمە جارێکیان کارمن پێی وتم، 'پەیوەندیی من و تۆ، پێویستە هاوشێوەی تابلۆکانی دایکت ئەبستراکت بێت.'

درەنگانێکی شەو، چوارقۆڵی بەسەر شەقامەکانی شاردا، قۆڵمان لە قۆڵی یەک هەڵپێکابوون، پێیەکانمان بەئەستەم بەدوای پێی یەکتریدا بۆ هەڵدەگیرا و تەواو مەست و ماندوو بووین، خۆمان گەیاندەوە ماڵی ئێمە، لەسەر مێزی نانخواردنی چێشتخانەکە دانیشتین، بە هەرچوارمان، زیاتر لە چوار لیتر ئاومان خواردەوە، بەلام دوای ئەوەی تینوێتیمان شکا، دەستمان کردەوە بە شەرابخواردنەوە، شەرابی سوور، کە دایکم سالانە بەتایبەتی لە فەلاحێکی ناوداری دروستکەری شەراب، لە خوارووی فەرەنسا داوای دەکرد، باسی هیچمان نەدەکرد، یان باشتر بڵێم، زۆرینەی

کات بێدەنگ بووین، ئەگەر یەکێکیشمان دەمی بکردایەتەوە، ئەوا ڕستەکەی تەواو نەدەکرد و لەناکاو بێدەنگ دەبوو، کوتوپڕ فیکتۆر هەستایە سەر پێ و پڕ بە چنگی، کۆندۆمی فڕێ دایە سەر مێزەکە و وتی، 'مارتن، کچینە بە خۆشی، ئەگەر ڕێنماییمان بکەیت، من و کارمن لەکوێ...!'

قسەکەیم پێ بڕی، خێرا چاوم بڕییە چاوی و بە دەنگێکی بەرز وەڵامم دایەوە، 'تۆ و کارمن ملتان بشکێنن و بگەڕێنەوە بۆ وڵاتە کاولەکەی خۆتان.'

کاتێ من ئەمەم وت، هەرسێکیان دایانە قاقای پێکەنین، کارمن، کە جاری تر هاتبووە ماڵی ئێمە و شارەزای ماڵەکە بوو، دەستی فیکتۆری گرت و بەدوای خۆیدا ڕایکێشا بۆ هۆڵی دانیشتنەکە، پاش ئەوەی دەرگاکەیان بە ڕووماندا پێوە دا، بێدەنگییەکیان لەدوای خۆیانەوە بەجێ هێشت، کە من و ئانا کەوتینە ناو قووڵاییەوە، هەردووکمان بێدەنگ تاوێک لەسەر ڕووی مێزەکەمان دەڕوانی، لەو چەندین کۆندۆمەی لەسەر مێزەکە بڵاو بووبوونەوە. لە خەیاڵمدا، لەگەڵ کارمن لە لێدواندا بووم، لە مەستیمدا، سەری باسەکانم لەیەک بۆ گرێ نەدەدران و هەر هەمووی لە خەیاڵمدا بووبوونە جەنجاڵییەک، بووبوونە قورساییەک لەسەر سنگم و هەناسەیان لەبەر بڕیبووم، ڕووداوەکان بێ خواستی خۆم، زۆر بەخێرایی ڕوویاندا.

ئانا کورسییەکەی ڕاکێشایە دواوە و هەستایە سەر پێ، ڕووی تێ کردم و خۆی ئاخنییە سەر کۆشم، پاش ئەوەی هەردوو باڵە ڕووتەکانی لە ملم هەڵپێکان، لێوە ساردەکانی لە دەمی وشکم توند کردن، تاوێک بە ساردییەکەوە یەکترمان هەڵگلۆفی، هێشتا لە

قوولایی خەیاڵمدا بێدار نەبووبوومەوە، تاوێک لە چاومی ڕوانی و وتی، 'جێگەیەکی نەرم هەیە لەم ماڵەدا، تاکوو پێکەوە لەسەری ڕابکشێین؟'

بێ ئەوەی وەڵامی بدەمەوە، هەستاین و چەند کۆندۆمێکم لەسەر مێزەکە هەڵگرت و دەستی ئانام گرت و بەدوای خۆمدا بە پلیکانەکاندا بەرەو سەرەوە بردم، بۆ ژووری خەوتنەکەی خۆم.

خۆم فڕێدایە سەر جێگەکەم و لەسەر پشت ڕاکشام، بە لاچاوێک لە ئانام دەڕوانی، کە خەریکی داکەندنی جلەکانی بوو، پاش ئەوەی بەڕووتی هاتە سەر جێگەکەم، بە پێوە ڕاوەستا و پێیەکانی لەملاولای شانەکانمدا بڵاو کردەوە و بە مەکرێکەوە وتی، 'هەموو کوڕێکی هوڵەندی، وەکوو تۆ ساردوسڕن؟'

پەیکەرێک، کە هەموو ئەزموونی بینینمی بەتاڵ کردەوە، جەستەیەکی ڕێک و ڕەنگی پێستی ئاڵتوونی، نەمدەزانی لەکوێوە دەست پێ بکەم، کام هەستم پێش ئەوی تریان بکەوێت، هەموو پێکەوە گڕیان گرتبوو، پەنجەیان دەچەقاندە ڕۆحم، داوام لێ کرد، کە تاوێک بە ژوورەکەدا بگەڕێت، بێدەنگ، تکام لێ کرد نەمدوێنێت، دوای ئەوەی چەند جارێک بە بەردەمی جێگەکەمدا هات و چوو، بەدەم خۆنمایشکردنەوە وتی، 'دەتەوێت دیمەنی جەستەم بەڕووتی لە خەیاڵتا هەڵبگریت، پاشان بیخەیتە سەر کەنفاسێک.'

'نا، نا، کەنفاسی چی.. بۆ خەیاڵم، تەنها بۆ خۆم.'

'هەر عاشقم نەبیت باشە...!'

'بەس تەنها ئەمشەو.'

'ئاخ، ئەگەر وا بێت، بەوپەڕی خۆشحاڵیمەوە.'

بازی دایەوە سەر جێگەکەم و دەستی کرد بە داکەندنی جلەکانی من، پاشان دەستی برد، پەتی گڵۆپی ژوورەکەی ڕاکێشا، کە دەکەوتە ژوور سەرمانەوە و گڵۆپەکەی کوژاندەوە، بە جۆرێک، لە تاریکیی ژوورەکەدا، ڕوخساری و شەوقی زەردی لەشیم لێ ون بوو، خێرا دەستم برد و پەتی گڵۆپەکەم ڕاکێشا و گڵۆپەکەم داگیرساند، دیار بوو ئانا لەو کاتەدا بێئاگا بوو لەوەی ژوورەکە رووناک بووبووەوە، نینۆکەکانی لە پێستم دەچەقاند، چاوی نووقاند و بەردەوام لچ و لێوی دەگەست، باڵەکانم لە جەستەی هەڵپێکابوو، پڕ بە دەستم، لەشی ڕووتیم گرتبوو، سمتمان توند لێک گیر کردبوون و بێدەنگ لێکمان هەڵدەسوو، ناوبەینمان لە ئارەقە و کەفی سپی و هۆرمۆنی حەزمان تەڕ بووبوو، زۆربەی کات، بەسەریەوە بووم و بە سەرنجەوە لە بەر ڕووناکیی گڵۆپەکەدا لێم دەڕوانی. دیار بوو ئانا لە ڕیتمی تەکانە هێواشەکانی من ڕازی نەبوو، بە پرتاوێک لەسەر خۆی وەلای نام و ڕانەکانی بەسەر سمتمدا بڵاو کردەوە، بە هەڵەشەییەکەوە پێی وتم، 'گانکردن تەنها خۆش بێت، بەس نییە بەلای منەوە، دەزانیت، دەزانیت چۆن؟ ئازارم بدە، هەتا ئازار و خۆشی، لەناو ڕۆحمدا تێکەڵ بەیەک ببن، بکێشە بە ڕانەکانمدا، گازم لێ بگرە، نینۆکەکانت لە مەمکم گیر بکە، قژم ڕابکێشە. کاتێک ماچم دەکەیت، گاز لە زمانم بگرە، ئەوە تۆ زیاتر لە کاتژمێرێکە بەسەرمەوەیت، نە تیژیی نینۆکەکانت و نە تیژی و ڕەقیی هیچ بەشێکی دیکەی لەشت، نەچەقینە ناسکی و ڕووتیی لەشم، نازانم، بمبوورە، هەستت پێ ناکەم کە...'

لەمەوە بێدەنگ بووین، بێ ئەوەی من هیچ وەڵامێکی بدەمەوە،

خۆی بەسەرمدا درێژ کرد و هێواش سەری نایە سەر سنگم، وەکوو بڵێی پەشیمان بێت، نەمدەزانی چیی پێ بڵێم و چۆن وەڵامی بدەمەوە، سەرسام لێم دەڕوانی، مەستی و خواردنەوەی ڕێژەی زۆری ئەلکحول لە خوێنمدا، هێزیان لەبەر بڕیبووم، پاش چەند هەناسەیەک، چاوم لێک نا، ئەوکات ماندوو بووم، نەمتوانی زیاتر بیر لەو هەڵچوون و تووڕەبوونەی ئانا بکەمەوە، لەو دەمەدا چوومە ناو خەوێکی قووڵەوە.

کاتێک بەخەبەر هاتمەوە، لچ و لێوم تاکوو ناو قوڕگم، لە تینوواندا پێکەوە نووسابوون، ئانا هێشتا سەری لەسەر باڵم بوو، لەسەر پشت کەوتبوو و پرخەی دەهات، گۆی مەمکەکانی سوور و قیت لە حەوایان دەڕوانی، تاوێک بێدەنگ لێم ڕوانی و دەستێکم خستە سەر ورگی و تا خوار ناوکی بردم، ساردوسڕی جەستەی لەگەڵ ئەو جوانییە سروشتییەی ئەودا، خێرا هەوەسمی وەکوو خۆی سارد کردەوە، پاشان لە تینوواندا بەڕووتی بە پلیکانەکاندا چوومە خوارەوە و لە چێشتخانەکە دەمم نا بە بەلوعەکەوە و تاوێک سەرم خستە بەر ئاوەکەی.
بە سەری تەڕەوە، کە هێشتا ئاو بە سەر شانەکانمدا دەچۆڕایەوە، لەبەر پەنجەرەی چێشتخانەکەدا بێدەنگ ڕاوەستام، بیرم لە ڕووداوەکانی ڕۆژی ڕابردوو دەکردەوە، لەناکاو لەوپەڕی قووڵایی بێدەنگی و تاریک و ڕوونی چێشتخانەکەدا، کە بە ناوازە ڕووناکیی گڵۆپی سەر شۆستەکان بەشێکی کەمیان ڕووناک کردبۆوە، دەستێکی سارد کەوتە سەر شانم، بێ ئەوەی ئاوڕی لێ بدەمەوە وتم، 'ئانا، تۆیش تینووت بوو؟'

'بەڵێ، من هەمیشە تینوومە.'
دەنگەکەم ناسییەوە، پەشۆکام، گیانم داهێزرا، خێرا ئاوڕم لێ دایەوە، ڕووناکیی دارگڵۆپەکانی کۆڵان، بەکزی دەگەیشتنە ناو ژووری چێشتخانەکە، دەموچاوێکی خەواڵوو، بەڕووتی، دیار بوو ئەویش شەرابی سوور قوڕگی وشک کردبوو، لە تینووانـدا بەخەبەر هاتبوو، تاوێک بێدەنگ بەرامبەری یەک ڕاوەستاین، هیچمان بەیەک نە وت، پاشان لە شانی یەکەوە ڕاوەساین و لە گڵۆپی سەر شۆستەی شەقامەکانمان دەڕوانی، بەئەسپایی دەستی لە دەستم هەڵپێکا، نازانم ئەوکات چیم لە خەیاڵدا بوو، بێجگە لەوەی ئەوەندەم بەس بوو، کە تەنها بێدەنگ ببم، کارمن ئەو بێدەنگییەی شکاند، 'لە زەتت لە ئانا برد؟'
بێ ئەوەی وەڵامی بدەمەوە، توند دەستیم گوشی، تا زۆری بۆ هات و لە عەزرەتدا دەستی لە دەستم دەرهێنا، دەرگای چێشتخانەکەی کردەوە و بەڕووتی و بە پێی پەتی چووە دەرەوە، دەرگای پشتەوەی چێشتخانەکەمان دەکەوتە سەر باخی پشتەوەی ماڵەکەمان، بێ دوودڵی، خێرا دوای کەوتم و لەناو چیمەنەکەدا، کە دەکەوتە ناوەڕاستی باخەکە، کارمن ڕاست ڕاوەستابوو، لە ئەستێرەکانی ئاسمانی دەڕوانی، شەونم چیمەنەکەی تەڕ کردبوو، لەبنی پێکانمەوە فێنکییەکی دەدا بە لەشم، چووم لەپشتیەوە ڕاوەستام و هێواش باڵەکانم بەسەر شانەکانیدا هەڵخستن و خۆم پێوە نووساند، هەستەکانم بەئاگا هاتن و ئاشنایەتیی خۆیان نیشان دا، خوێنم سەرلەنوێ دەستی کردەوە بە گەڕان بە دەمارەکانمدا، بۆن و گەرمیی لەشی، هەموو خەیاڵ و توانای بیرکردنەوەمیان وەستاند، ئەو بۆنەی لووتەکانم پڕ نەدەبوون لێی، پاش تاوێ خۆ

لەیەک توندکردن و تەماشاکردنی ئەستێرەکان، کارمن وتی، 'ئەستێرەی من لە ئاسمان نییە.'

'باشتر، بە تۆ چی لەو دوورەوە.'

شنەی بایەک، تاڵی قژە ئاڵۆزکاوەکانی ئەوی دەدا بە ڕوومدا، سەری وەلاوە نا و لێوی وشکی بە لچ و لێومەوە نووساند، بۆنی هەناسەی دای بە ڕوومدا، ئەو هەناسەیەی هێشتا بۆنی شەرابی لێ دەهات، وەک گیرۆدەبوویەک، لەگەڵ هەموو هەناسەدانێکی ئەودا، من هەناسەم هەڵدەمژی، زمانم بە لچ و لێوی دا دەهێنا و درزی وردی وشک هەلاتوویانم تەڕ دەکردەوە.

دوای ئەوەی تاوێک بوو بێدەنگ یەکترمان لەئامێز گرتبوو، کارمن وتی، 'چوار ساڵ پێکەوەبوون، دوای ئەو هەموو یادگارییە، بێمانایە بەو جۆرەماڵئاوایی لەیەک بکەین.'

پاش تاوێک هەڵمژین و قومدان لە یەکتری، دیسان وتی، 'لەگەڵ تۆدا، کۆندۆمم پێویست نییە، دڵنیام لەوەی تۆ لە کاتی ڕابواردنماندا داوام لێ ناکەیت پەنجە بخەمە قنگتەوە.'

هەردووک دەستمان کرد بە پێکەنین، بەدەم پێکەنینەوە وتم، 'تۆیش لە کاتی ڕابواردنماندا داوای ئەوەم لێ ناکەیت، کە لێت بدەم و ئازارت بدەم.'

باڵەکانی لە ملم هەڵپێکان و بەدرێژایی لەشمان، خۆی پێوە نووساندم، شادەمارەکانم لەژێر پێستمدا خۆیان ڕادەپسکاند و هەڵئاوسابوون، تا دەهات، دڵم خێرا لێی دەدا و بەردەوام خۆی دەکێشا بە قەفەسەی سنگمدا، گوێم لێ بوو، سنگم وەکوو چەرمی دەهۆڵ زرمەی لێوە دەهات، گەرمییەک لەشمی داگرتبوو، کە نە سرووەی هەوای ساردی ئەو شەوە و نە ئەو چیمەنە تەڕەی بە

پێی پەتی لەسەری ڕاوەستابووم، ساردی نەدەکردمەوە. نازانم چەند دەبوو لەوێدا بەیەکەوە لکابووین، کاتژمێرێک بوو، بەدرێژایی ئەو شەوە، پێکەوە، یان چەندین شەو و ڕۆژ تێپەڕیبوون و ئێمە لە خەڵوەتی تێکەڵاوبووندا سڕ بووبووین و بێئاگا بووین لە کات، هەر لەوێدا و بە پێوە، لێو و ناو ڕۆحی یەکترمان تەڕ دەکردەوە، بەردەوام لەپێ دەستە زبرەکانم بە لەشی ڕووتیدا دەهێنا، ئەژنۆم دەلەرزین و تا دەهات، لەشم تەڕایی لێ دەبڕا.

پاشان خۆمان لەسەر شەقامەکە و لەژێر ڕووناکیی دارگڵۆپەکاندا بینییەوە، دەست لەناو دەست بەسەر شۆستەی ئەو کۆڵانە چۆڵانەدا بەڕووتی ڕامان دەکرد، لەگەڵ دەرکەوتنی هەموو لایتێی ئۆتومبێلێکدا، خۆمان لەودیو سنووری ڕووناکیی دارگڵۆپەکاندا ون دەکرد، بێئاگا بووین لەوەی ئەو شەوە تەمەنی کەمی ماوە، شەو دواساتەکانی خۆی ڕادەستی ڕۆژ دەکاتەوە و سپێدە لەو دەوروبەرە ڕووناکیی دارگڵۆپەکان کز دەکات.

باش بەبیرم دێت، سپێدەی دابوو، لە باڵاخانەکانەوە تاکوتەرا هاواریان لێ دەکردین و فیکەیان بۆ لێدەداین، کاتێک گەیشتینە ماڵەوە، ماڵەکە بێدەگ بوو، دیار بوو ئانا و فیکتۆر هێشتا لە خەوندا بوون، هەردووکمان مەست بووین و بە ڕاست و چەپماندا دەکەوتین. کارمن لە چێشتخانەکە هەردوو دەستی گرتم و لە چاومی ڕوانی، 'دڵم پڕە لە حەزێکی شێتانە بۆت، حەزێک، کە تەواوی هەستەکانم گیرۆدەین.'

ڕاچڵەکیم و دەستێکم بەسەر دڵمەوە گرت و پێم وت، 'ئەو وتە جوانەت هەڵگرتبوو بۆ دواساتی ماڵئاواییمان لە یەکتری؟'

'نازانم، ئەی تۆ، دواوتەت چییە؟'

'جا تۆ هیچت بۆ من تیا هێشتەوە؟'

کارمن برۆکانی هەڵبڕین، سەیرێکی کردم و بە شەرمێکەوە وتی، 'دەزانم، بمبوورە، بەتایبەتی لەم کاتەدا، کە دواساتمانە پێکەوە، هەست دەکەم ئەو لێدوانەم لەوپەڕی خۆپەرستیمەوە بوو، بەڵام...!'

تاوێک بێدەنگ و سەرسام لە چاوی یەکترمان دەڕوانی، دەستی لەناو دەستمدا دەلەرزی و وردە وردە سارد دەبووەوە، هێواش چاوی لێک نا و لێم نزیک بووەوە و لچ و لێوی بەئەسپایی بە ڕوومەتی تەزیومدا خشاند، ماچێکی کردم و پێی وتم، 'ژیانێکی خۆش، سوپاس بۆ هەموو شتێک.'

دەستی لە دەستم کردەوە و لێم دوور کەوتەوە، بێدەنگ، دەستە ساردەکانم لێک هەڵدەسوون، بێ ئەوەی وەڵامی بدەمەوە، بێوچان لێم دەڕوانی، پشتی تێ کردم و دەرگای هۆڵی دانیشتنەکەی کردەوە و چووە ژوورێ و دەرگاکەی بەدوای خۆیدا داخست، پاش تاوێک سەرسام بوونم، ماندوو بە پلیکانەکاندا سەر کەوتم و چووم بۆ ژوورەکەی خۆم، لەتەنیشت ئاناوە، بێ ئەوەی لێی بڕوانم و بەئاگای بێنم، ڕاکشام و لێی خەوتم.

ڕۆژی دوای ئەو ڕۆژە، لە ساردیی دەستی دایکم ڕاچڵەکیم و بەئاگا هاتمەوە، لەسەر قەراغی جێگەکەم دانیشتبوو، پاش ئەوەی بەپەلە چەرچەفەکەم بەسەر خۆمدا ڕاکێشا و تۆزێک خۆم هەڵپەسارد، لەو دەمەدا ژوورەکە پڕ بوو لە ڕووناکی، هێشتا سەرم زۆر قورس بوو، چاوم بەئەستەم بۆ هەڵدەهات، دایکم لێی ڕوانیم و پرسیی، 'دوێنێ زۆرت شەراب خواردەوە؟'

لە حەوسەڵەمدا نەبوو وەڵامی بدەمەوە، لچێکم لێ هەڵقورتاند،

دیسان ئەو وتی، 'ئەوە کاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆیە، پێدەچێت ئێوە تا درەنگانی شەو ئاهەنگی دەرچوونتان گێڕابێت!'
دوای ئەوەی دایکم ئەمەی وت، خۆی بەسەرمدا ڕاکێشا، لەسەر کۆمێدیی تەنیشتی جێگەکەم، پارچەیەک کاغەزی هەڵگرت و دەستی کرد بە خوێندنەوەی.

'ئازیز مارتن،
بمبوورە بۆ دوێنێ شەو، بمبوورە لە زیادەڕۆییم، ویستم شەوێکت لەگەڵدا بەسەر بەرم، پڕ بێت لە لەزەت و بتوانم سەرسامت بکەم بە خۆم و چێژ لەیەک وەر بگرین، بە داخم تۆ بۆ هەردووکمانت بە ڕەوا نەبینی.
ماچێک لە منەوە. ئانا.'

دایکم پاش ئەوەی تاوێک بە سەرنجەوە لە نامەکەی ڕوانی، بە سەرسامییەکەوە لێی ڕوانیم و پرسیی، 'ئانا...! ئەی، ئەی، تۆ دوێنێ شەو لەگەڵ کارمن نەبوویت؟ پێم بڵێ، چ باسە؟'
چەرچەفەکەم لە خۆمەوە ئاڵاند و هەستام، لەسەر جێگەکەمەوە بازێکم دا بۆ خوارەوە، بەرەو حەمامەکەمان چووم، بەدەم ڕێگەوە و لەبەر خۆمەوە وتم، 'بمبوورە، لە ڕاستیدا خۆشم نازانم دوێنێ شەو چی ڕووی دا.'

بە ڕۆژدا ژووری زیندانە بەرتەسکەکەم پڕ دەبوو لە ڕووناکیی خۆر و تەواو گەرم دادەهات. ڕۆژانە، کاتێک خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لەنگەری دەگرت، لەو بیابانەدا خۆر هاڵاو و بۆکڕووزی لە

هەموو شتێک هەڵدەستاند، بۆ چەند کاتژمێرێک بۆنی سووتان و بەخوڵبــوونی دەنــکە زیخــەکانی بیابانەکــە، هــەوای ژووری زیندانەکـەمیان دەگـۆڕی و لەسـەر سـنگمدا پـەنگیان دەخـوارد و هەناسـەیان تونـد دەکـردم، دەنکـی زیخـەکان دەبوونـە پارچەیـەک پشکۆ و سوور هەڵدەگەڕان، خۆر هـەموو شـتێکی دەسووتاند، کە بەر تیشکی ئەو بکەوتایە، بەردەوام دەنگی مار و مێروو و ئەو گیاندارە خشۆکانەم دەبیست، کە لە نـاو گـەرمای بیابانەکە خۆیـان دەئاخنییە ژێر سـێبەری دیـواری زیندانەکـە، ئـەو باڵاخانەیـەیی بـۆ مەبەستێکی تر لە ناوەڕاستی ئەو بیابانەدا دروست کرابوو.

پـاش ئـەوەی چەنـدین شـەو و ڕۆژم لـەناو تـەپوتۆز و کـەڕووی ژوورەکەدا گوزەراند، ڕۆژێک لـەو ڕۆژانـە گـوڕم دایـە بـەر خـۆم و دەسـتم کـرد بـە پاککردنـەوە و شـۆردنی هـەموو شـتێک لـە ژوورەکەدا، چەند ڕۆژێک خۆمم پێوە سەرقاڵ کـرد، لـەو ڕۆژانـەدا، بەلوعەی ئاوەکە ڕۆژی چەند کاتژمێرێک ئـاوی پێدا دەهـات، یـانی ڕۆژانـە زیـاتر سـێ کـاتژمێر بەبـەردەوامی ئـاوی لەبـەر دەڕۆیشـت، ئاوەکە بۆنی هێلکەی کوڵاوی لێ دەهات.

ئەو دوو بلـووزە کۆنـەی لـەژێر یـەکێک لـە جێگەکانـدا دۆزیمنـەوە، یـەکێکیان قـۆڵ درێـژ و ئـەوی تریـان قـۆڵ کـورت، ڕەنگیـان لەبـەر بڕابوو، نەدەناسرانەوە، تا بزانم ئاخۆ بە چ ڕەنگێک بانگیـان بکـەم، یـەکێکیانم لەبـەر کـرد، ئـەوی تریـان بـە ڕۆژدا ئـارەقی گیـانمم پـێ دەسڕی و خۆمم پێ وشک دەکردەوە.

کاتێک لەسـەر جێگەکـەم ڕاوەسـتابووم و بـە پارچـە جلـە شـڕێک بنمیچی ژوورەکەم پاک دەکردەوە، سـەرنجم دا جاڵجاڵۆکەیـەک لـە سـووچێکدا دەواری خـۆی لـێ هەڵـدابوو، خـۆی لـەژێر ڕایـەڵەی

تەیمانەکەیدا مات کردبوو، هەستم دەکرد بە چاوە زرتە وردیلەکانی لێی دەڕوانیم، نیومەترێک بە چواردەوری تەیمان و ماڵەکەی ئەودا بە ڕەشی و زەردی هێشمەوە، لەدوای ئەو ڕۆژەوە، هەموو ڕۆژێک سەردانم دەکرد، بەیانی باش و نیوەڕۆ و ئێوارە و شەوانیش چەند جارێک بانگم لێ دەکرد، کە شەوی ئەویش شاد بێت، زۆر جاریش بەجێی دەهێشتم و لە نێوان شیشەکانەوە، بە بەرچاوی منەوە دەچووە دەرەوە. ئەو ڕۆژانە بێجگە لەدەوری ماڵی جاڵجاڵۆکەکە، گڵۆپی ژوورەکەیشم پاک نەکردەوە، شەوان زیاد لە پێویست ڕووناکی دەیدا لە ژوورەکە، ئەگەر پاکم بکردایەتەوە، ڕەنگی لە زەردەوە دەگۆڕا بە سپی و هەر زوو لێی بێزار دەبووم و هێزیشی لە هێڵکارییەکانی سەر دیوارەکە دەبڕی.

پاش ئەوەی ژوورەکەم لە تەپوتۆز پاک کردەوە، نووسین و هێڵکارییە کۆنەکان باشتر دەر کەوتن، لەنێوان ئەوان و بیرکردنەوەدا لە ڕابردووم، بەتایبەتی لە دایکم و غەریبیکردنی شاری ئەمستردام، سەرنجم چووە سەر پۆرترێتێک کە زۆر ناەشاز و نەزانانە کێشرابوو، بەڵام چاوە مەنگ و ڕەشەکانی لە هەرجێگەیەکی ژوورەکەدا بوومایە، هەستم دەکرد لێیان دەڕوانیم و چاودێرییان دەکردم، ئەوەندەم لێ ڕوانیبوو شەوانیش لە خەونمدا ئامادە بوو. بێجگە لەو پۆرترێتە، دەیان دەموچاوی شێواو و تەواونەکراوی تر لە چواردەوری ئەودا و لەسەر دیوارەکانی تر کێشرابوون، زۆربەیان تەنها چاویان بەدەرەوە بوو، هەستم دەکرد بەکۆمەڵ نیگابانی ژوورەکەیان دەکرد، چاویان پڕ بوو لە شەرم و گومان، بە جۆرێک کە لە مرۆڤ بوونی ئەوان

دڵنیا نەبووم و زیاتر وەک گیانداریکی زەلیل خۆیان نمایش دەکرد. بەردەوام دەنگێکی ناوازە، دەنگێکی غەریب، وەکوو ئەوەی زۆر لە دوور بێت، شەوانە لەناو بێدەنگیی خۆم و چواردەورمدا گوێم لێ دەبوو، لە نادیار و قووڵایی دیوارەکانەوە دەهات، دەنگێکی زۆر نزم، زیاتر لە نووزە نووز دەچوو، دەنگی ئەو کەمئەندامانەی لەناو خۆیاندا مانیان گرتبوو، زیاتر بە چاویان دەیانویست بدوێن، پێدەچوو هێزێکی نادیار دەستی نابێتە قورگیان.

ڕۆژێک دوای ئەو ڕۆژانەی ژوورەکەمم تێدا پاک کردەوە، لە دەنگی خرەخرِی تۆپەڵە کلیل و هاتوهاواری ناو باڵاخانەی زیندانەکە بێدار بوومەوە، پۆلیسێک خەریکی کردنەوەی دەرگای زیندانەکەم بوو، خێرا بەهەڵەداوان ڕاست بوومەوە و خۆم گەیاندە بەردەمی دەرگاکە، لەگەڵ کردنەوەی دەرگاکە و هاتنە ژوورەوەی پۆلیسەکەدا، لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا ڕێک ڕاوەسابووم، بێ ئەوەی سەرجم بدات یان سڵاوم لێ بکات، چاوێکی خێرای بە ژوورەکەدا گێرا، بێدەنگ پاشەوپاش گەڕایەوە دواوە و دەرگاکەی بەدوای خۆیدا داخست.

تاوێک چاوم هەڵگڵۆفت و دوایین بنکڕی خەوم تێدا شڵەقاندن، بە ئەرز و دیواری ژوورەکەدا ڕوانیم، ژوورەکە تا دەهات، ڕووناکتر دەبووەوە، نووسین و هێڵکاریی سەر دیوارەکان، لەبەر ڕووناکیی تیشکی خۆرەکەدا جیاوازتر دەیاننواند.

هەموو پێکەوە، خەتە عەرەبییەکان و فۆرمە تێکشکێنراوەکان، هێڵە کۆن و کاڵەوەبووەکان، بەکۆمەڵ نمایشی دیمەنێکی ئەبستراکتیان دەکرد، ئەو ڕۆژە نەچوومە سەر جێگەکەم و بەردەوام بە ژوورەکەدا دەگەڕام و چاوم بە ڕووی دیوارەکانی چواردەورمدا

دەگێڕا، خەیاڵم بۆ ڕابردوو هەڵفڕی، بۆ بەردەم ئەو دیواربەندانەی لەگەڵ هاوڕێکانم، لەسەر دیوارەکانی شاری ئەمستردام دەمانکێشان، ئەو دیواربەندانەی شەوان بەدزیی پۆلیسەوە کارمان تێدا دەکرد و ئینجا ڕۆژانە وەکوو ڕێبوار دەچووین بۆ تەماشاکردنیان، هەروەها تەواوی هێلکاریی سەر دیواری ئەو بەندینخانەیەم لەگەڵ تابلۆکانی سامان خدردا بەراورد دەکرد، لێکچوونێکی زۆرم دەبینی، چارشێوە ڕەنگ ڕەشەکانیان، بەتایبەتی فۆرم و فیگوری ناو کارەکانی سامان، پێدەچوو ئەو هێلکارییانە لە خەیاڵ و کولتوورێکی هاوشێوەوە سەرچاوەیان گرتبێت، بەو هەموو لەیەکچوونە سەرسام بووم. ئەوەندە بە تێڕامانێکی غەمگینەوە لێم ڕوانین و بیرم لێ کردنەوە، قورساییان لەسەر زەینم کرد و بەکۆمەڵ گوشاریان بۆ هێنام، ئەو شەوە هەر زوو خۆم لەناو جێگەکەم توند کرد و بەتانییەکانم لە خۆمەوە ئاڵاند، هەستم بە ورووژانی ڕۆحم دەکرد، کاتێک لە پێشچاوی ئەو حەشاماتە نوقسان و کەمئەندامەدا کە چواردەوریان گرتبووم، بەکۆمەڵ بانگیان لێ دەکردم، بە جۆرێک ژوورەکەیان لە هاوار و نزای خۆیان پڕ کردبوو، ژوورەکەم لە گۆڕەپانێک دەچوو، کە هەزاران کەس خۆپیشاندانی تێدا بکەن و سەرجەم ناڕازی و تووڕە بن، بەکۆرس و بە ناوازە بانگیان دەدا، تووڕە لەو دەستەی فۆرمی ئەوانی بە نیوە ناچڵی کێشابوو، یان ناڕازی و تووڕە بوون بە هاتنی غەریبێکی وەکوو من بۆ ناویان، ئەوەی لەناو ئەو دەریای فۆرم و هێلکارییەدا سەرنجی ڕادەکێشام، پۆرترێتێک بوو، کە لە ناوەڕاسی دیواری بەرامبەری جێگەکەدا کێشرابوو، تەنها دەموچاوی بەدەرەوە بوو، لەسەر شانەکانیەوە، بەرەو خوار تا

سەر ئێسقان کڕابوون و شێوێندرابوو، لە هەمووان جیاواز تر دەیڕوانی، خامۆش و بێسرتە، چاوە ڕەش و نەرمەکانی ئەو، تەنها خاڵێک بوون، کە لە ژووری زیندانەکەمدا لە تەماشاکردنیاندا گومان و دوودڵیی منیان دەڕەواندەوە و ئارامیان بە ڕۆحم دەدا.

ڕۆژی دوایی، بڕیارم دا هێڵەکانی ئەو پۆرترێتە تۆخ بکەمەوە، سەری پەنجەکانم بە تف و لینجاوی ناودەمم تەڕ دەکرد و بە هێنانی ڕەشی و تۆزی نووسین و هێڵکارییەکانی چواردەوری، سنگ و مەمکەکانیم قوت دەر خستن و هەتا سەر سمتیم بەڕووتی کێشا، سێبەرم بۆ شانەکانی کرد، بە جۆرێک، تەواوی هێڵکارییەکانی تر دەکەوتنە پشتیەوە، بەو مەبەستەی بەڵکوو زیاتر لە نهێنیی نیگاکانی تێبگەم.

ئەو شەوە، تا درەنگانێ، بەدیاریەوە بووم، نازانم شەو چەندی مابوو تاریکیی خۆی لەگەڵ ڕووناکیی ڕۆژدا ئاڵوگۆڕ بکات، کاتێک بەخەبەر هاتمەوە، دەمێ بوو خۆر کەوتبوو، بە خۆمم وت، 'دیارە ئەم بەیانییە پۆلیسەکان دوا کەوتوون!'

لەپڕێکدا ڕاپەڕیم و خۆم ڕاست کردەوە، تاکوو خۆم ئامادە بکەم، نەبا لەناکاودا پۆلیسەکان خۆیان بکەن بە ژووردا.

کاتێک لەسەر جێگەکەم دابەزیم، سەرنجم دا پۆرترێتەکە شێوێنرابوو، هەر وەکوو سەرەتای هاتنم، تەنها دەموچاوی بەکاڵی دەبینرا، سەر سنگ و شانەکانی، دیسان کرێندرابوون و ڕەش کرابوونەوە. لە بێزاریمدا، لە دەرگای زیندانەکەم دەڕوانی، وەکوو ئەوەی لە خەیاڵمدا بمەوێت پرسیار لە پۆلیسەکان بکەم، 'بۆچی؟'

کاتێک ئاوڕم دایەوە، بینیم کابرایەکی سەر و ڕیش سپی و موولوول، لەسەر جێگەکەی خوارەوە خۆی گرمۆڵە کردبوو،

باڵەکانی لە خۆیەوە ئاڵاندبوو، چاوی لێک نابوو، گوێم لە دەنگی هەناسەدانی نەبوو. ویستم بێدەنگ سەر بکەوم بۆ سەر جێگەکەم، کابرا وەکوو لەخەو ڕاپەڕیبێت، بە شڵەژاوییەکەوە لەسەر قەراغی جێگەکـە دانیشـت و پـاش چـاو هـەڵگڵۆفتن و لـەچاوکردنی چاویلکەیەک، کە شووشەکەی ئەوەندە ئەستوور دیار بوو، چاوی گەورە و زەق دەینواند، بەدەم ورتەورتەوە، کە بەئاستەم گوێم لێی بوو، 'ئەریّ ئەوە تۆیت، بەندکراوە هۆڵەندییەکە؟'

سەرسام ڕاوەستابووم و لێم دەڕوانی، پیرەپیاوێکی پشتکوم، سیس و زەرد هەڵگەڕاو، بە تێڕامانێکی غەمگینەوە، بە دەنگێکی بەرز، دیسان وتی، 'دیارە لە ئینگلیزی تێناگەیت، باشترە بە عەرەبی پێت بڵێم، وایە یان نا؟'

دڵنیاییەک بە دڵ و دەروونمدا هات، ئینجا بە هەڵەشییەکەوە وتم، 'بەڵی، بەڵێ.'

'تۆ جوولەکەیت؟'

زۆرم لە خۆم کرد دەنگم هەڵنەبڕم، 'مەبەستت چییە، دەتەوێت بزانیت من...'

هەڵوێستەیەکم کرد، لە بیرکردنەوەدا بووم، ئاخۆ چۆن ڕستەکەم تەواو بکەم، ئەو لێی پرسیم، 'تۆ جوولەکەیت؟ دەزانم کە تۆ جوولەکەیت، ترسنۆک.'

'پێدەچێت تۆ لە من باشتر بزانیت.'

لەو دەمەدا، کابرا پێدەکەنی و ڕوومەتەکانی سوور هەڵگەڕابوو، بەدەم پێکەنینەوە وتی، 'تۆ جوولەکەیت، یان هەڵگەڕاویتەوە لە دینەکەی خۆت و بوویتە مەسیحی؟'

'نەخێر، تۆ هەڵەیت، من هەڵگری هیچ دیانەتێک نیم.'

بە قەهر و بێزارییەکی زۆرەوە هاواری کرد و وتی، 'یا حمار، بەدڵنیاییەوە تۆ جوولەکەیت، بوەستە، لێم بوەستە، زۆر چاکە، فرسەتێکی باشە بۆ من، هەتا لەگەڵتا ساغی بکەمەوە و بزانم، ئاخۆ ئێوە لەسەر هەقن یان ئێمە!'

بروسکەیەک بە لەشمدا هات، لە ڕۆحمەوە گەرمییەک شاڵاوی بۆ ماسولکەکانم دەهێنا، لە عەزرەتا دەستێکم بە سووچی قەرەوێڵەکەوە گرت و چاوم توند نووقاند، لە خەیاڵمدا ئەو ساتەم بەبیر هاتەوە، لە ئوتێل سماء، کاتێک یەکێک لەو دوو کەسەی لە ژوورەکەدا لەگەڵم بوون، چەندین جار ئەو پرسیارەی لێ کردم، 'تۆ جوولەکەیت؟ تۆ جوولەکەیت؟'

تاوێک بێئاگا بووم لە کابرا، کاتێک هاتمەوە هۆش خۆم و چاوم هەڵبڕی، کابرا لەسەر ئاودەستەکە چیچکەی کردبوو، دەستی بە ئاو دەگەیاند، سەیرێکی کردم و لەسەرخۆ پرسیی، 'بۆچی گیراویت؟'

'نازانم.'

هەستایەوە و پاش خۆگورجکردنەوە، هاتە بەردەمم، لێی ڕوانیم و پرسیی، 'پێیان نە وتیت لەم کاولەیەدا منت لەگەڵدام؟'

'نەخێر.'

'ئاغ، لێرە ئەوەیش ئاساییە.'

دەستی ڕووبەڕووم درێژ کرد، بە دوودڵییەکەوە دەستم لەناو دەستی نا، دەستی ڕەق و زبر، لە پارچەدارێکی سووتاو دەچوو، زەردەخەنەیەک کەوتە سەر لێوی و وتی، 'سەلیم عومەر عەبدلڕەحمانم'

'مارتن سەلەمۆ'

توند دەستی ڕاوەشاندم و وتی، 'دەڵێم، مارتن، تۆ دیارە جێگەی سەرەوەت هەڵبژاردووە، کە چەندین ساڵە جێگەی خەوی من بووە، بەڵام، لەمەولا لە خوارەوە دەخەوم و سەرەوە بۆ تۆ.'

پاش ئەوەی سەرم بۆ ڕاوەشاند، هیچی ترم نە وت، ئەو پێکەنی و وتی، 'پێت باشە؟'

سەرم بۆ لەقاند، 'باشە.'

دەستێکی خستە سەر شانم، دیسان پێکەنی و پێی وتم، 'داگیرکەر.'

## ٩

# کارمن

ماوەی ساڵێک بوو لەگەڵ کارمندا پەیوەنیمان هەبوو، کارمن پێی وا بوو کاتی ئەوە هاتووە لەگەڵ دایکی ئاشنا ببم و چاومان بە یەکتری بکەوێت.

کاتژمێر هەشتی سەرلەبەیانیی ڕۆژی بیستی مانگی نۆڤەمبەر، من و کارمن بە شەمەندەفەر، لە شاری ئەمستردامەوە بۆ برۆکسل بەڕێ کەوتین، بڕیار وا بوو چەند ڕۆژێک لای دایکی کارمن بمێنینەوە.

کاتژمێر یازدەی سەرلەبەیانی، لە وێستگەی برۆکسل لە شەمەندەفەر دابەزین، ملی شۆستەیەکی باریکی درێژمان گرتە بەر، تاوەکوو بردینییە ناو هۆڵێکی گەورەی جەنجاڵی چاوەڕوانکردن، لە لاپەڕێکەوە بە شانی یەکەوە ڕاوەستاین، کارمن بەردەوام چاوی بۆ دایکی دەگێڕا، کە بڕیار وا بوو لەوێ، لە کاتی دیاریکراودا، چاوەڕوانمان بێت. کارمن چەند جارێک هەواڵپرسیی لەگەڵ چەند کۆنە دۆست و ناسیاوێکیدا گۆڕییەوە، هەستەکانم لە

ئامادەباشیدا بوون، وەکوو پیشەی هەمیشەییم، لە بەرکەوتنی هەموو شتێک یان لەبەرامبەر هەموو جێ و شوێنێکی نوێدا.
چەند جارێک کارمن پەیوەندیی بە دایکیەوە کرد، بێ چۆنی و چاکی کورت و خێرا خێرا دەیپرسی، 'تۆ لەکوێیت؟ تۆ لەکوێیت؟'
چەندە بوو لەوێدا ڕاوەستابووین، لە ڕەنگ و ڕواڵەتی ئەو خەڵکەم دەڕوانی، لەگەڵ کارمن یەکتریمان نەدواند، لە کاتێکدا پشتم کردبووە کارمن، لە ئافرەت و پیاوێکم دەڕوانی، کە بە ڕواڵەت و جلوبەرگیاندا، پێدەچوو بە ڕەگەز خەڵکی یەکێک لە وڵاتانی ئەفریقا بن، لەو دەمەدا بە بەردەم مندا تێپەڕین، کابرا لەپێشەوە و بەدوای ئەودا، هەتا دەگەیشتە سەر ئافرەتەکە، هەشت منداڵم بژارد، زنجیرێکیان دروست کردبوو بەدوای یەکدا و دەستیان لەناو دەستی یەک نابوو، لە گەورەوە بۆ بچووک، لە شێوەی جەستەی مارێکدا، بەناو جەنجاڵیی ئەو خەڵکەدا دەکشان، کابرا ناوبەناو ئاوڕی لێ دەدانەوە و بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد، "یاللە، یاللە!" وەک ئەفسەرێک، چۆن فەرمان بەسەر سەربازەکانیدا بکات.

لەناکاوێکدا کارمن باڵی توند گوشیم و وتی، 'مارتن، مارتن، ئەوە کارلایە!'
لە ئاوڕدانەوەمدا، بینیم ئافرەتێک لە شانیەوە ڕاوەستابوو، ئەوەی لەو کاتەدا بینیم و بە خەیاڵمدا گوزەری کرد، بەراوردکردنیان بوو، ڕەنگی قژیان، میکیاج و بەرزیی بالایان، قەڵەمیی دەموچاویان، ئەوەی لە یەکتری جیایی دەکردنەوە، ڕەنگی مەسکارای دەوری چاویان بوو، کارلا قاتێکی چاکەت و پانتۆڵی ڕەشی تەسک و جووتێک پاپووچی پاژنەبەرزی ڕەنگ سپیی لەپێدا بوو، زیاتر

بواری نەدام لێی بڕوانم، ڕووبەڕووم هات و بە ڕووخۆشییەکەوە باڵەکانی بەرەو ڕووم پان کردنەوە، لەبەر خۆیەوە وتی، 'کارمن، ئەو شتە بەلەزەتە چییە؟'

باوەشێکی توندی پێدا کردم، پاش ئەوەی چەند جارێک ئەملاولامی ماچ کرد، تاوێک بە باڵامدا هەڵزنا و قژە ڕەش و لوولەکەی بەسەر دەموچاومدا پرژاند، بۆنێکی لێ دەهات، کە چاومیان خوساند و هەناسەیان قورس کردم، دەستێکی بە پشتمدا هێنا و هێواش تا سەر سمتم بردی و توند یەکێک لە گردەکانی سمتمی گوشی، منیش دەستێکم لەسەر شانی و دەستەکەی ترم لەسەر کەمەری ڕاگرتبوو، وەکوو پێکەوە بەنیازی سەماکردن بین، ئارەقێکی شەرمنانە سەر سنگی تەڕ کردبووم، کارمن دەستی کێشایە نێوانمان و لێکی جیا کردینەوە و بە مەکرێکەوە پێی وتین، 'تەواو، تەواو، بەسە ئیتر، هەڵی بگرن بۆ دوایی!'

لە چاوەڕوانیی ئەوەدا بووم، کە خۆمان بە یەکتری بناسێنین، لە هەمان کاتدا دەمێ بوو ناوی یەکتریمان بیستبوو، وا بزانم کارلا ئەوەی بە پێویست نەدەزانی، جانتاکانمان بە دەستەوە گرتن و لە ڕۆیشتنماندا، کارلا هاتە نێوانمان و قۆڵی لە قۆڵمان هەڵپێکا و پێی وتین، 'ئوتومبێلەکەم لە گەراجێک لەم نزیکانە ڕاگرتووە، کە نزیکەی کیلۆمەترێک لێرەوە دوورە، بمبوورن، لەم نزیکانە ئوتومبێل ڕاگرتن یاساغە.'

کاتێک لە وێستگەکە دەر چووین، کارلا وەکوو ئەوەی قسە لەگەڵ خۆی بکات وتی، 'کارمن، دەڵێم، مارتن لە چ جۆرە نموونەی پیاوێکە؟'

کارمن بێدەنگ بووبوو، دیار بوو لە بیرکردنەوەدا بوو، دیسان

کارلا وتی، 'مەبەستم ئەوەیە، تۆ بڵێیت ئەوەندە لێهاتوو بێت، دوو ئافرەتی بۆ تێر بکرێت؟'
کارمن قاقایەکی لێدا و وتی، 'ئاخ، مەگەر خۆم نەیناسم.'
'یانی پیاوی هۆڵەندی، لە جێگەدا لە پیاوی بەلجیکی لێهاتووترن؟'
'بەڵێ، بەڵێ، ئەوە بۆ ماوەی ساڵێکە کێرە لاستیکەکەم لە ماڵ لەبیر چووە و بیریشم نەکردووە.'
'ئەو پارچە لاستیکەی تۆ، شەوێکم لێ نەپەڕاندووە، تاکوو بۆت تەڕ نەکەمەوە.'
هەردووکیان دایانە قاقای پێکەنین، کاتێک گەیشتینە گەراجەکە، هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا و جانتاکانمان لە ئوتومبێلەکەی کارلا هاویشتن، سەرنجم لە ڕەنگی ئوتومبێلەکەی کارلا دا، کە هاوشێوەی ڕەنگی نینۆکی قاچ و پەنجەکانی دەستی بوو. لەشم ئارەقێکی گەرمی کردبوو، کارلا دەستێکی خستە سەر شانم و پرسی، 'دەڵێم مارتن، تۆ کتێبەکانی نووسەر، یان ڤۆڵکەرت خوێندۆتەوە؟'
'بەڵێ، جگە لە کتێب و نووسراوەکانی، تابلۆ و پەیکەرەکانیشیم دیون.'
'من ئەوسا شازدە ساڵ بووم، کتێبی *میوەی تورکیم* کڕی و خوێندمەوە، پاشان وەکوو فیلمێکیش بینیم، باوەڕ بکە، تەواو ئاسۆی بیرکردنەوەی منیان گۆڕی، دەتوانم بڵێم، ئەو نووسەرە منی پەروەردە کرد، لەسەر شێوازێکی تر لە ئازادی و زیاتر چێژبینین لە سێکس، لە هەمان کاتیشدا لێوەی فێر بووم، کە مرۆڤ پێویست ناکات پابەند ببێت بە هیچ خوویەک یان کولتوورێکەوە و دوای مێگەل بکەوێت، دەزانیت مارتن، من زیاتر

سەرسام بووم بە نووسەرەکە خۆی، باش بەبیرم دێت، کە ئەوسا لە یەکێک لە بەرگی یەکێک کتێبەکانی وێنەیەکی خۆی بەڕووتی، هەر بە ڕووتوقووتی بڵاو کردبۆوە، نازانم لەبیرم نەماوە چەند جار خوێندمەوە، بەڵام ئەوەندەی لەبیرم مابێت، هەموو جارێک دوای خوێندنەوەی، لەنێوان ڕانەکانمم دەنا و بەسەریدا دەنووستم.'

باش لەبیرم نەماوە چۆن بوو خۆم لەو قسە و باسانەی کارلا قوتار کرد و خۆم لەناو ئوتومبێلەکە هاویشت، لەپشتەوە لێی دانیشتم، زۆری پێ چوو، تا بەڕێ کەوتین، چونکە ئەوان تاوێک بوو لەتەنیشت ئوتومبێلەکەوە ڕاوەستابوون و لەگەڵ یەک دەدوان. تاوەکوو گەیشتینە ماڵی کارلا، نیوکاتژمێرمان پێ چوو، لە ڕێگە، باس باسی دایکم بوو، کارلا دۆکیومێنتارییەکی لە کەناڵی یەکی بەلجیکا دیبوو دەربارەی دایکم، دیار بوو زۆر سەرسام بوو پێی، داوای کرد من دایکمی پێ بناسێنم، یان لە داهاتودا لەگەڵ کارمن سەردانی ئەمستردام بکات و دایکم ببینێت، بەنیازی ئەوەی بەڵکوو دایکم پۆرترێتی کارلا بەڕووتی بۆ ژووری نووستنەکەی بکێشێت، سەرم بۆ لەقاند و پێم وت، 'بۆ نا، دایکیشم پێی خۆشە.'

لەو باسانەدا بووین، کارلا شکاندییەوە بەردەمی گەراجێک، گەراجی خانوویەکی گەورە، کە دیار بوو نۆژەن دەکرایەوە و کرێکارەکان لەسەر پەیژە و سەربان و ناو باخەکەدا خەریکی کار بوون، لە دابەزینماندا، کارلا ڕووی لە ئێمە کرد و پێی وتین، 'دیوی دەرەوەی، هێشتا زۆری ماوە تەواو ببێت، بەڵام ناوەوەی تەواو بووە، مەبەستم لە نۆژەنکردنەوە ئەوەیە، کە جێگە دەست و شوێنەواری کەسی پێوە نەهێڵم.'

لە دەرگایەکی کۆنی گەورەوە چووینە ژوور و کەوتین بەسەر هۆڵێکی گەورەدا، هۆڵەکە چێشتخانەیەک و بارێکی مۆدێرنی دەکەوتنە سەر، لەسەرخۆ چاوێکم بە ماڵەکەدا گێڕا، زۆر گەورە دیار بوو، ماڵەکە زۆر ڕۆشن بوو، ڕۆشن بوو وەکوو ڕەنگ و فۆرم، ماڵێک، بە ڕەنگی سپی داپۆشرابوو، کەرەستەکان یان ئەلەمنیۆم یان دار بوون و بۆیەی سپی کرابوون، مێز و کورسی و قەنەفەکان لە چەرمی سپی گیرابوون، کارلا و کارمن بە قژە ڕەشەکەیانەوە، زەق تێیدا دەر دەکەوتن، بەپانی دیوارەکاندا ڕەفەی باریک کێشرابوون و ڕازێنرابوونەوە بە پەرداخی شەرابی هەمەجۆر، لەسەر مێزی ناوەڕاستی هۆڵەکە، چەندین گۆڤاری ڕەنگاوڕەنگ کەڵەکە کرابوو، کارلا لە ناوەڕاستی هۆڵەکەدا ڕاوەستا و هەردوو باڵی پان کردەوە، وەکوو بیەوێت ئاماژە بە هەموو شتێک لە ماڵەکەدا بکات، بە دەنگێکی بڵند وتی، 'بەخێر بێن بۆ کۆشکی کارلا!'

پاش ئەوەی سەر و خواری ماڵەکەی پێ گێڕاین، پرسیی، 'ئێ، بەلاتانەوە چۆنە؟'

کارمن ماسولکەکانی دەموچاوی گرژ کرد و چاوی بچووک کردەوە و بە تووڕەییەکەوە لە کارلای پرسی، 'هەست ناکەیت زیادەڕۆییت کردبێت؟ من هیچ شتێک لە ماڵەکەدا ناناسمەوە!'

'ئازیزم، تۆ ساڵی جارێک ڕێگەت دەکەوێتە ئێرە، وەکوو میوان.'

لەمەوە بێدەنگی کەوتە نێوانیان، کارمن ئەو دوانیوەڕۆیە دەنگی لێ دابڕین و کزۆڵەی لێ کرد، بێزارییەکی زۆر بە ڕوویەوە دیار بوو، کارلا منی بەسەر هەموو پارچە و کەرەستەیەکی ماڵەکەدا گێڕا و

جۆری و نرخ و ناوی گارگە و چۆنێتیی گواستنەوەیشیانی بۆ باس کردم.

ئەو ئێوارەیە، کارلا بەیارمەتیی وەستای چێشتخانەکەی، کە لە سەنتەری برۆکسل بوو، بۆ ئامادەکردنی خۆراک سەرقاڵ بوو، چێشتکەرەکە کابرایەکی قەڵەوی سوورکار بوو، قژی بە سەرەوە نەمابوو، سەر و کەللەی سوور هەڵگەڕابوو، کارلا بە پییێر بانگی دەکرد، پییێر بە زمانێکی فەرەنسیی نەرم دەدوا و بەردەوام چاوی لە من نە دەترووکاند، کاتێک کارلا لە شانمەوە ڕاوەستابوو، بە گوێمدا چپاندی، 'خۆ چێشتکەرەکەم بێزاری نەکردوویت؟'

بە سەرسامییەکەوە و لەژێر لێوەوە وەڵامم دایەوە، 'تێناگەم، بۆ وای دەبینیت کە بێزاری کردبم؟'

'پییێر، تەنها حەزی لە پیاوانە و ئەگەر من خۆشمی بۆ ڕووت بکەمەوە، نەک هەر سەیریشم ناکات، بەڵکوو لەوانەیە ئێرەش بەجێ بێڵێت.'

سەرم بۆ لەقاند و پاشان چووم بۆ لای کارمن، لەو کاتەدا کز و خەمبار لە بەردەم بەنجەرەکەدا ڕاوەستابوو، تەماشای دەرەوەی دەکرد، کە لە گۆرەپانێکی بەتاڵی چیمەن پێک هاتبوو، منیش بێدەنگ لە شانیەوە ڕاوەستام، نەمویست ئەو بێدەنگییە بشکێنم و خەیاڵی کارمن بشێوێنم.

دیار بوو دەمێ بوو پشتمان لە کارلا و پییێر کردبوو، بەردەوام دەنگیان لێوە دەهات و خەریک بوون، لەناکاوێکدا کارلا خۆی هاویشتە نێوانمان و وتی، 'فەرموون، میوانە ئازیزەکانم، خۆراک ئامادەیە.'

لەو کاتەدا پییێر بە گرژومۆنییەکەوە دەستێکی بۆ حەوا داین، بێ

ئەوەی هیچ بڵێت، لێی دا و ڕۆیشت. دڵەکوتێم بوو، تاکوو بزانم چی ئامادە کراوە، هەرچەندە کارمن بە نابەدڵییەکەوە جێگەی گرت، ئینجا هەرسێکمان لەسەر مێزەکە دانیشتین، کارلا ئاماژەی بە خۆراکەکان کرد و وتی، 'دەی دڵەکانم، تامی بکەن بزانن چەند بەچێژە، چێشتی دەستی باشترین چێشتکەر لە بەلجیکا، مۆنسیۆر پییر.'

لەسەر هەرسێ قاپەکە، سێ پارچە ماسی دانرابوو، بە چواردەوریدا، چەندین پارچە سەوزەی کوڵاو، نە ماسییەکە و نە سەوزەکانم نەدەناسییەوە، پێم وا بێت ئەگەر زیندوو بوونایە، لەوە دەچوو بمزانییایە چین و کێن و سەر بە چ تیرەیەکن، دوو قاپی بچووکی شۆرباش لە ناوەڕاستی مێزەکەدا بوو، لەگەڵ کەرەی تێکەڵ بە سیر و سەبەتەیەکیش نانی فەرەنسیی لەسەر کەڵەکە کرابوو، بێجگە لە دوو شووشەی شەرابی سوور، کە سێبەری باڵای خۆیان بەسەر مێزەکەدا ڕاخستبوو، دیار بوو کارلا پەرداخی لەبیر چووبوو، لەو دەمەدا کە من چاوم لەسەر شووشەی شەرابەکان بوو، دەمویست نووسینەکانیان بخوێنمەوە، کارلا وتی، 'ئەو دوو شووشە شەرابە، بەتایبەتی بۆ ئەم شەوم کڕیون، ئەوە تەمەنیان لە ئێوە زیاترە، تا بڵێیت گرانن، شەرابی وا، لە هیچ بازاڕێکدا دەست ناکەوێت.'

کاتێ دەستمان کرد بە نانخواردن، کڕی و بێدەنگی باڵی بەسەر ماڵەکەدا کێشا، هەموو سەرمان داخستبوو، تام و لەزەتی خۆراکەکە، نووزەی لە هەموومان بڕیبوو، زۆری پێ نەچوو، قاپەکانی بەردەممان بەتاڵ بوون، ئینجا من تامەزرۆی قومێک شەراب بووم، ویستم پرسیاری پەرداخ بکەم و شەراب بخۆینەوە،

لەو دەمەدا کارلا ڕووی کردە کارمن و لێی پرسی، 'دەڵێم، کارمن، پێت باشە ژوورەکەی تۆ بخەمە سەر ژووری خەوتنەکەی خۆم، مەبەستم دیواری نێوانیان لا بەرم و بیانکەم بە یەک ژوور؟'

کارمن، بێ ئەوەی سەیری دایکی بکات، لەژێر لێوەوە پرسیی، 'چۆن؟'

'ئەوە دوو ساڵە، تۆ شەوێک چییە لەو ژوورەدا نەخەوتوویت! وەکوو تر، ماڵی تۆ ئێستا لە ئەمستردامە، وانییە؟'

'تۆ دەزانیت چی دەڵێیت، ئەمستردامی چی و ماڵی چی، منیش وەکوو تۆ لەم ماڵەدا دەژیم؟!'

'ئێ، ئێ، ڕاستە، زۆر ڕاستە، تۆ لەو دوو ساڵەی ڕابردوودا، من و ئەم ماڵەیشت بە ئەمستردام و ئەم کوڕە جوانە گۆڕیوەتەوە.'

کارمن بە قەهر و بێزارییەکەوە قیژاندی، 'دایکە، من لێت تێناگەم، دەتەوێت ئەم باسە بگەیەنیتە کوێ و مەبەستت چییە؟'

'ئازیزم کارمن، ئەوە خواستی من نەبووە، کە بەتەنیا بم، بەڵکوو تۆ بە پێویستت دەزانی بچیت بۆ دەرەوەی وڵات و لە ئەمستردام بخوێنیت، بۆ لە بەلجیکا زانکۆ قات، بووبوو؟'

پاش تاوێک بێدەنگی، بەدەم ورتەورتەوە، کە بە ئەستەم گوێم لە دەنگی بوو، کارمن وتی، 'دایکە، بە یارمەتیت، ئێستا کاتی ئەوە نییە، هەڵی بگرە بۆ سبەینێ، پێم وا بێت تۆ کێشەیەکت هەیە، بەڵام مەرج نییە ئەو کێشەیە من بەرپرس بم لێی.'

کارلا بەدەم گریانەوە منگاندی، 'خۆت گێل مەکە، باش دەزانیت مەبەستم چییە، بێبەختیی من لەوەدایە، تۆ زۆر لە باوکت دەچیت!'

کارمن لە عەزرەتدا دەستی دەگوشین، فرمێسک لە چاویدا پەنگی خواردبوو. تاوێک بوو بە قەهرەوە بێدەنگ لە دایکی دەڕوانی،

پاشان بە دەنگێکی نووساوەوە وتی، 'بەڵێ، دایکە، دەزانم من لە باوکم دەچم، پێی بەختەوەر بم یان نا، ئەوەیان لای کەس نادرکێنم و هەڵی دەگرم بۆ خۆم، چوونیشم بۆ ئەمستردام، ڕاکردنم بوو لەو دونیایەی تۆ بۆت خولقاندبووم، ڕاکردن بوو لە شەڕ و ئاژاوەی نێوان تۆ و باوکم، ئەو باوکەی ئێستا دڵنیام لە سووچێکی ئەم دونیایەدا بۆخۆی دوور لە ئێمە دەژی.'

کاتێک ناوی باوکی کارمن کەوتە نێو ناوانەوە، بیری ئەوەم کەوتەوە، لە سەرەتای پەیوەندیماندا کارمن بۆی باس کردبووم، باوکی بەیانییەک، بە مەبەستی ڕۆژنامەکڕین لە ماڵ دەر دەچێت و ئیتر ناگەڕێتەوە.

سەرم داخستبوو، وەکوو چۆن ڕووداوەکان وایان دەخواست، سەری پەنجەکانم بە ماسولکە داتاشراوەکانی ڕووی مێزی نانخوادنەکەدا دەهێنان، ڕاچڵەکیم لە قیژەی کارلا، 'باوکت، باوکت، لەو باوەڕەدای مابێت و ژیانێکی نوێی پێکەوە نابێت؟'

'دڵنیام، چونکە دڵم وام پێ دەڵێت.'

'ئەو پیاوە لاواز و ساویلکە و ترسنۆکە، لەو باوەڕەدایت بتوانێت تەنها ڕۆژێک بێ من بژی؟'

'دایکە، دیارە تۆ شتێک دەزانیت، دەربارەی باوکم، کە من بێئاگام لێی، تکایە، هەرشتێکی نوێ لەبارەی باوکمەوە دەزانیت پێم بڵێ.'

کارلا ڕووی لە کارمن وەر گێڕا، کە بەردەوام چاوی بە ماڵەکەیدا دەگێڕا، هەردوو دەستی بە قژیدا هێنا، هێشتا پاشماوەی گرژومۆنی بە ڕوخساریەوە دیار بوو، بە دەنگێکی نزم وتی، 'نەخێر هیچ هەواڵێکی نوێی نازانم، نایشمەوێت هیچ هەواڵێکی باوکت بزانم، ئەو باوکەی تۆ، شایانی ئەوەنییە، ئەگەر ئێستا

تۆپبێت و لەبنی دەریادا ڕزیبێت، دەربەسی نیم، هیچ دەربەسی نیم، لە قووڵایی دڵمەوە ئەو تۆپینەی پێ ڕەوا دەبینم.'
کارمن لە عەزرەتدا خەریک بوو لەسەر کورسییەکەی بەر ببێتەوە، بە دەنگێکی کزۆڵەوە لە دایکی ڕوانی و پێی وت، 'تۆ پەیمانت پێ دام، لە سۆراغکردنی کۆڵ نەدەین، ئیتر بەزیندوویی بێت یان...'
کارلا بواری نەدا کارمن قسەکەی تەواو بکات، بە بێزارییەکەوە زریکاندی، 'تاکوو کەی چاوەڕوانی ئەو باوکە بەڕێزەی تۆ بکەم، پێم ناڵێیت، کەی بتوانم ئەو سەرئێشەیەم نەمێنێت و بۆخۆم بەئاسودیی بژیم؟'

من نەمدەویست لەوە زیاتر گوێیان لێ بگرم، لە قووڵایی خەیاڵمدا، لە گەڕاندا بووم لە یادەوەرییەکم، تاکوو هەستەکانمی پێوە پابەند بکەم و هەستەکانم لە چواردەورم داببڕم، سەرنجم چووە سەر شووشەی شەرابەکان، لە خەیاڵمدا بە خۆمم وت، 'دەبێت ئەو شەرابە کۆن و گرانبەهایانە تامیان چۆن بێت، خەیاڵیان چەند بڕ بکات؟'
من لە ساغکردنەوەی نرخی دوو شووشە شەرابەکەدا بووم، بینیم چۆن کارلا دەستی دانێ و بردنی بۆ سەر مێزی کەوانتەری چێشتخانەکە. تاوێک بوو هەردووکیان بێدەنگی دای گرتبوون، بەردەوام بە شانی یەکدا دەهاتن و دەچوون، خەریکی کۆکردنەوەی قاپ و قاچاخی سەر مێزی نانخواردنەکە بوون، پاش تاوێک سەرنجدانم لە هەردووکیان، جارجار نیگای کارمنم دەکرد و لە ئاراستەی چاوی دەگەڕام، زیاتر لە کاتژمێرێک، کارمن و دایکی قسەیان لەگەڵ نەکردم و تەنانەت لێشیان نەڕوانیم، منیش

ورده ورده له خەیاڵی خۆمدا نغرۆ دەبووم.
ئەو ڕۆژانەم هاتەوە یاد، کە دایکم نیگاری دەکێشا، چۆن ئەو لە کاتی کێشانی تابلۆیەکیدا مەست و بێدەنگ دەبوو، هەستەکانی لە ڕووی فیگور و هێڵەکاندا چەقیان دەگرت، زەلیل خۆی گرمۆڵە دەکرد، گەر پرسیارێکیشم لێ بکردایە، خێرا وەڵامی دەدامەوە.
لەو دەمەدا، چەند جارێک ویستم بانگی کارمن بکەم، بەڵام هیچ پرسیارێکی ئامادەکراو یان وشەیەکم شک نەدەبرد لە خەیاڵمدا، تاکوو شیاوی دوای ئەو شەڕە دەنووکەی ئەوان بێت، ئەوسا لە خەیاڵی خۆمدا دەم وت، 'دەبێت کارمن هەست بە چی بکات و بیر لە چی بکاتەوە!'
خەمم بوو، خەمی دڵی کارمنم بوو، دەبێت دڵی لەکوێوە درزی بردبێت، دەبێت ڕۆحی ئێستا چ ڕەنگێک بنوێنێت، لەوانەیش بوو ئەوکات ئەو بەرامبەر من هەستی بە شەرمەزاری کردبێت، بۆ ئەوەی بواریان پێ بدەم زیاتر لەگەڵ یەک بدوێن، هەستام ویستم بچمە دەرەوە پیاسەیەک بکەم، کاتێک لەناو دەرگاکەدا ڕاوەستابووم و بەنیازی ڕۆیشتن بووم، ئاوڕم دایەوە و تاوێک لە هەردووکیانم ڕوانی، پشتیان لێم بوو، لە چێشتخانەکە، هەریەکەیان بە شتێکەوە خەریک بوو، بە ئەنقەست کۆکەیەکم کرد، دیار بوو ئەوان لە بیرکردنەوەیەکی قووڵدا بوون، دەرگاکەم بەدوای خۆمدا داخست و بەتەنیشتی گەراجەکەدا، کە شۆستەیەکی باریکەلەی بەرد ڕێژکراو بوو، تاوەکوو ناو باخی پشتەوەی ماڵەکەی بردم، هێشتا خۆر ئاوا نەبووبوو، باخی پشتەوەی ماڵەکە تێکوپێک درابوو بەسەر یەکدا، دەت وت ڕەوەبەرازی کێویی تێ کەوتووە. لە کەنارەوە، چەند کورسییەکی داری ڕزیو دانرابوو، بە

چواردەوریانـدا ئاخزەجگـەرە پرژابـوو، یـەکێک لـە کورسـییەکانم هـەڵگرت و بردمـە لا و تەنیشـت دیـواری خانووەکە، بە مەبەسـتی ئەوەی لە هیچکام لـە پەنجـەرەی ماڵەکـەوە نـەبینرێم، لـە کـەناری باخەکـەدا، کاتژمێرێک زیاتر دانیشـتم، نەمدەتوانی خـەیاڵم ڕابگرم لەسـەر سـاتێک لـە ڕابـردووم، بیریشـم لـە داهـاتووم نەدەکردەوە، کـارمن تـەواو بیروهۆشـمی داگیـر کردبـوو، لێدوانـەکانی ئـەوان، وەکـوو خڕکـە بـەردێک خۆیـان بـە دیوارەکـانی خـەیاڵ و کەللـەی سـەرمدا دەدا و زووزوو دووبـارە دەبوونـەوە، بـە دڵـەکوتێ خـۆم ڕاست کردەوە و هەستام و بەرە و ژوورەوە چووم.

کاتێـک لـە دەرگـام دا، کـارلا کردییـەوە، بـەبێ ئـەوەی هـیچ بڵـێم، ئـەویش بـە سـاردییەکەوە لێـی ڕوانـیم و هیچـی نـە وت، ماڵەکـە بێدەنگییەکی ترسناک دای گرتبوو، لەوە دەچوو نە شـەڕ بێت و نـە ئاشتی، دایکم هەموو جارێک دەی وت، 'نە شەڕ و نـە ئاشـتی یـانی بێـدەنگی، بـەڵام ئـەو بێدەنگییـە، لـە شـەڕکردن ترسـناکترە بـۆ ڕۆحمان.'

هەموو ئەو ڕۆژە، تەلەڤزیۆنەکە داگیرسابوو، بەڵام ئەویش لەلایـەن خـاوەن ماڵەکـەوە بێـدەنگ کرابـوو، لەسـەر کـەناڵی یـەکی بـەلجیکا بـوو، بەرنامەیـەکی لێدوان بـوو، چەنـد کەسـێک بـەدەوری مێزێکدا دانیشـتبوون و لـە گەرمـەی لێدوانـدا بـوون، دوای ئـەوەی بـۆ کۆنترۆڵی تەلەڤزیۆنەکە چاوێکم بە چواردەوری خۆمـدا گێـڕا، خـۆم ڕاست کردەوە و ویستم لـە کـارلا بپرسم، ئایا بۆم هەیە دەنگی تەلەڤزیۆنەکە زیاد بکەم، لـەو دەمـەدا، کـارمن لـەناکاو بـە دەنگێکـی بەرز وتی، 'گوێ بگرە دایکە، لـەو بـاوەڕەدا نیم تۆ بتوانیت ژیانت لەگەڵ هـیچ کەسێکدا بـەش بکـەیت، تۆ هـەرگیز ناتوانیت کەسێکت

خـۆش بوێـت، تـۆ تەنیـا خۆتـت خـۆش دەوێـت و بـەس، تـۆ خۆپەرستیت، دەقاودەق چوویتەتە سەر دایکت، ئەویش زیاتر لە چـل سـاڵی تەمـەنی، لەگـەڵ کەرەسـتە گرانبـەها و پشـیلە بێسفەتەکانیدا ژیا.'

'تۆ ڕاست دەکەی کارمن، ئەگەر من کەسانی هاوشێوەی تۆ و باوکتم هەبێت، هەر ئەوە چارەنووسمە، ناچارم لە جێگەی تۆ و باوکت، دوو پشیلە ڕابگرم.'

لەمەوە بێدەنگ بوون، هەردووکیان وەک دوو ورچی برسی، بێ ئـارام بـە ماڵەکـەدا دەگـەڕان، کـارلا وەک ئـەوەی شـتێکی بیـر کەوتبێتـەوە، ڕووبـەڕووی کـارمن چـوو، هـەردوو شـانەکانی توند گرت و ڕای وەشاند، بە توورەییەوە پێی وت، 'هەمووی خەتای تۆ و باوکتە، دەزانیت، دەزانیت؟'

'ئاخ دایکە، چەند بەستەزمانیت، یەک جار، تەنها، یەک جار لە ژیانتا سەرزەنشتی خۆت بکە و هەڵەکانی خۆت ببینە، هێندەی من لەبیرم بێت، تۆ هەمیشە مافت بە خۆت داوە و ئیمەت قەرزاربار کـردووە، خـۆت، هـەر خـۆت، هـەتا دوایـی، هـەر خـۆت و بـەس، دەزانیت وایە، خۆ پەرست.'

دەنگی هۆڕنی ئوتومبیلێک لەپێش گەراجی ماڵەکە، هەردووکیانی ڕاچڵەکانـد و لێکـی جیـا کردنـەوە، کـارلا بەهەڵـەداوانێک، بـێ ڕاوەستان و بە ڕاکردن بە پلیکانەکاندا چوو بۆ نهۆمی سەرەوە. دیسان کارمن چوو لە بەردەم پەنجەرەکەدا ڕاوەستا، بێدەنگ لە دەرەوەی دەڕوانی، لەو کاتەدا کارلا بە پلیکانەکاندا بە لەنجەولار هاتە خوارێ، لەبەر خۆیەوە گۆرانیی دەچڕی، جیاوازتر لە تاوێک لەوەوپێش، عەزییەکی سووری کورتی تا سەر ئەژنۆی لەبەردا

بوو، دوو جووت پێڵاوی پاژنەبەرزی بە دەستەوە بوو، وەکوو بڵێی ئەو تووڕەبوون و گرژییەی لە سەرەوە، لەبەری خۆی داکەندبێت، ڕووخۆش و گەشاوە دیار بوو، بەرامبەرم دانیشت و هەردوو جووتە پێڵاوەکەی تاقی کردەوە، جارێک لێی ڕوانیم و ڕای وەرگرتم، عەزییەکەی بەری ئەوەندە کورت بوو، ڕانە ڕێک و سپی و لووسەکانی، جێگەی سەرنجم بوون، چەند جارێک لە بەردەممدا خولایەوە و دیسان ڕای وەرگرتمەوە، منیش تەنها سەرم بۆ دەلەقاند، لەو کاتەدا کارمن پشتی تێ کردبووین و تاوێک بوو بێدەنگ لە دەرەوەی دەڕوانی. کاتێ کارلا چوو لەپشتی کارمنەوە ڕاوەستا و هەردوو باڵەکانی لەملیەوە ئاڵاند، بە دەنگێکی پڕ لە سۆز و مەکرەوە وتی، 'ئازیزم، لە دایکت زوویر مەبە، تەمەن و ساتەکانی ژیان وا دەخوازن، کە من و تۆ وا مامەڵە لەگەڵ یەکتریدا بکەین، ئەوەی ڕابورد ڕابورد، پێویست ناکات من و تۆ تاکوو دەمرین بەدیار ڕابردوومانەوە وشک ببین.'

کارمن نە دەنگی لێوە هات و نە لە جێگەی خۆی جوولا، لەو دەمەدا چەند جارێک زەنگی دەرگاکە لێدرا، کارلا بە ڕاکردن ڕووبەڕووی دەرگاکە چوو، دەرگاکەی واڵا کرد، کوڕێکی درێژی سوورکار، دیار بوو لە من و کارمن لاوتر بوو، بەدوای کارلادا هات و لە ناوەڕاستی هۆڵەکەدا ڕاوەستا، قاتێکی چاکەت و پانتۆڵی سپی و تەنانەت ڕەنگی پێڵاوەکانیشی سپی بوو، بەبێ ئەوەی سڵاومان لێ بکات، باوەشی بە کارلادا کرد و لە زەوی هەڵی بڕی، چەند جارێک بەدەوری خۆیدا خولاندییەوە، بۆ چەند هەناسەیەک دەمیان لەناو دەمی یەک نا، پاشان دەستی یەکیان گرت و بە فیزێکەوە بە ماڵەکەدا دەستیان بە گەڕان کرد، دیار بوو کارلا

دوایـین گۆڕانکـاری و جوانکـاریی ماڵەکـەی بـۆ بـاس دەکـرد، بەردەوام بە زمانی فەرەنسی لەگەڵ یەک قسەیان دەکرد. زۆری پێ نەچوو، بەدەم پێکەنین و یەکترگوشینەوە، بەبێ ماڵئاوایی لێیان دا ڕۆیشتن.

ماڵەکـە تـەواو بێدەنگی دای گـرت، مـن و کـارمن تـەنیا کـەوتین، نەمویسـت دەستپێشـخەری بکـەم و بـانگی بکـەم یـان بچـم بـۆ لای، زۆری پێ نـەچوو، کـارمن چـوو بۆ چێشـتخانەکە و دوو پـەرداخ و دوو شووشە شەرابەکەی هێنان و لەسەر مێزەکەی بەردەمی مندا دای نان، پاش هەڵبچڕینی یەکێک لە شووشـەکان، بە دەنگێکی گڕ و تێکشـکاوەوە، بـێ ئـەوەی سـەیرم بکـات، وتـی، 'شـەرابم لەگـەڵ دەخۆیتەوە؟'

سەیرێکم کرد و سەرێکی ڕازیبوونم بۆ لەقاند، دیار بوو هیچمان نەماندەزانی چۆن یـەکتری بدوێنین و لـەکوێوە دەست پـێ بکـەین، بێدەنگی دای گرتین، خێرا خێرا پەرداخـەکانمان نیوەپڕ دەکردن و دەمـان ڕژانـد بـە قـوڕگی وشـکماندا، پاشـان کـارمن، بـە هـەردوو دەستی، چاوی هەڵگلۆفت و وتی، 'دێیت لەگەڵم بچینە دەرەوە؟'

'بەڵێ، دێم لەگەڵت.'

لە کاتێکدا خەریکی خۆئامادەکردن بووین، کارمن تەلەفۆنی کرد بۆ تاکسـی، زۆری پێ نـەچوو، لـە بـەردەمی ماڵەکـە ئامـادە بـوو، لـێم نەپرسی بۆ کوێ دەچین، هـەموو ئـەو ڕێگەیـەیش، قسـەمان لەگـەڵ یـەکتری نـەکرد. پـاش بیسـت خولـەکێک، گەیشـتینە جێگەیـەک. دابـەزین و پـاش ئـەوەی دوو کۆڵانی بەرتەسـکمان بـڕی، کـەوتین بەسەر گۆڕەپانێکی جەنجاڵدا، کە سـەنتەری شـاری پێـک دەهێنـا و

بەناوبانگ بوو بە جێگەی ئاهەنگی شەوانە، کارمن بەدەم ڕێوە چاکەتە چەرمەکەی داکەند و دای بەسەر دەستیدا و وتی، 'لای من، ئەم گۆڕەپانە خۆشترین جێگەیە.'

سەیرێکم کرد و سەرم بۆ لەقاند، پێشم کەوت و بە ناوەڕاستی گۆڕەپانەکەدا، بۆ بەردەمی دیسکۆیەک، کە دیار بوو هێشتا نەکرابۆوە، کوڕ و کچ ڕیزیان گرتبوو، لە بەردەرگایەکی گەورەی ئاسندا، لەسەر دەرگاکە نووسرابوو، دیسکۆی *چاڵ*.

کارمن خێرا هاوڕێ کۆنەکانی دۆزییەوە و بەیەکدا ئاڵان، سێ کچ و دوو کوڕ بوون، پێدەچوو هاوتەمەنی ئێمە بن، لەپشتی کارمنەوە ڕاوەستابووم و لێم دەڕوانین، پاش تاوێک گفتوگۆکردن، یەکێک لە کوڕەکان دەستی بۆ من درێژ کرد و لە کارمنی پرسی، 'ئەو کوڕە لەگەڵ تۆیە؟'

کارمن، بێ ئەوەی ئاوڕ لە من بداتەوە، وتی، 'بەڵێ، میوانی منە.'

لە شوێنی خۆمەوە یەک یەک چاوێکم پێدا گێڕان و سەرم بۆ لەقاندن، ئینجا ڕووم لێ وەر گێڕان و لەپشتیانەوە، لە ڕیزەکەدا ڕاوەستام، هەستم پێ کرد، شەرابەکە تا دەهات زیاتر کاری تێ دەکردم، لەو جەنجاڵی و تەنیاییەمدا، پەلکێشی دەکردم و دەیهاویشتمەوە ناو خۆم، لە خەیاڵی خۆمدا وتم، 'کارلا ڕاستی کرد، بەڕاستی شەرابی چاکە.'

نازانم من زۆر مەست بووم، یان هەر وام دەبینی، زووزوو کارمن لەگەڵ یەکێ لە کوڕەکاندا دەستلەملانێی دەکرد، لە کاتێکدا پشتم تێ کردبوون و خۆم بە دیوارێکەوە هەڵپەساردبوو، دەستێک توند شانی گوشیم. لە ئاوڕدانەوەدا بینیم، کارمن زەردەخەنەیەکی بۆ کردم و پێی وتم، 'مارتن، وەرە با بچینە ژوورەوە.'

دوای کەوتم و چووینە ناو دیسکۆکە، کاتێک من جێگەیەکی بەتاڵم لە کەناری بارەکە گرت و داوای پەرداخێک ئاوم کرد، مەیخانەچییەکە سەرێکی لێ ڕاوەشاندم و پێی وتم، 'لێرە بەس لە تەوالێتەکان ئاو هەیە، ئەگەر زۆرت تینووە، بچۆ بۆ ئەوێ!'

بە بێزارییەکەوە سەیرێکم کرد و پێم وت، 'باشە، بمبوورە کۆلایەکم بەرێ.'

پێش ئەوەی مەیخانەچییەکە کۆلاکەم بۆ تێبکات، من پشتم تێ کرد و بینیم کارمن لەگەڵ هاوڕێکانیدا لە گەرمەی سەماکردندا بوو، دوای زیاتر لە کاتژمێرێک، هاوڕێکانی کارمن ماندوو بوون و بڵاوەیان لێ کرد، کارمن بەتەنیا لەسەر سەکۆی سەماکردنەکە، لەنێوان هەمووانـدا، بێئاگا لە چواردەوری چاوی لێک نابوو و چوارپەلی با دەدا و سەمای دەکرد، لەو کاتەدا وا هەستم دەکرد، کە تەنها نمایش بۆ من دەکات، چاوم لێ نەدەترووکاند و بێوچان بە سەرنجەوە لێم دەڕوانی، ئارەق لە دەموچاوی دەتکا، قژە لوول و ڕەشەکەی، تەڕ بە ملیدا مەلاسەیان کردبوو، بلووزە تەنک و تەسکەکەی بەری، بە گۆشتیەوە نووسابوو، ئەوەندەم بە سەرنجەوە لێ ڕوانیبوو، دڵم لە عەزرەتدا خۆی دەکێشا بە قەفەسی سنگمدا، لە تینوواندا قوڕگم بە مەلاشوومەوە نووسابوو، نازانم چەند جار یان چ جۆرە مەشروبێکم داوا دەکرد و ڕژاندم بە گەروومدا، بەڵام نە مەست دەبووم و نە چاوم هیلاک دەبوو لە ڕوانینی کارمن.

زۆری نەخایاند، خۆمم لەسەر سەکۆی سەماکردنەکەدا بینییەوە، ڕووبەڕووی کارمن، بەبێ ئەوەی بەئاگای بێنمەوە، هاوشێوەی ئەو چاوم لێک نا و بەرامبەری دەستم کرد بە سەماکردن، لە

کاتێکدا بەرێوە بووم بۆ ناو قووڵایی خەیاڵەکانم و هێشتا لە دەرگای هیچ ئانووساتێکم نەدابوو، دوو دەست وەبن باڵەکانم کەوتن و جەستەیەکی تەڕ و گەرم نووسا بە گیانمەوە، بەئەستەم چاوم هەڵبڕی، بینیم کارمن تا دەهات، زیاتر خۆی لێ توند دەکرم. وەک ئەوەی بڵێی لە قووڵایی مندا، لە جێگەیەک بگەڕێت، تاکوو خۆی تێ بئاخنێت، بێ دوودڵی، باڵەکانم تێوە ئالاند و هێواش هێواش چاوم لێک نایەوە، لەگەڵ تۆنی مۆسیقاکەدا، پێیەکانمان بەدوای پێی یەکتریدا دەخشاند و هێواش خۆمان دەلەنگاند. زیاتر چی بنووسم، دەربارەی ئەو دەمەی لەوێدا لەگەڵ ئەو بووم، بێئاگا بووم، بێئاگا بووم لە چواردەورم، دەرگای خەیاڵم لەسەر داخرابوو، هەموو هەستەکانم بە کارمنەوە پابەند کردبوو.

تا ئەو کاتەی یەکێک لە هاوڕێکانی کارمن، بە پێکەنینەوە دەستێکی خستە نێوانمان و لێکی جیا کردینەوە و پێی وتین، 'دەبێت بڕۆین، دیسکۆکە دادەخرێت.'

کاتێک ڕوانیم لە چواردەورمان، بێجگە لە هاوڕێکانی کارمن، کەسی ترم نەدەبینی، دوو کاتژمێر زیاتر بوو لەگەڵ کارمن چووبوومە خەڵوەتەوە و بێئاگا بووین لە چواردەورمان. لە چوونەدەرەوەماندا، سەرنجی کاتژمێری نێو تەلەفۆنەکەم دا، کاتژمێر سێی شەوی نیشان دەدا. گۆڕەپانەکە هێشتا جمەی دەهات و لێرە و لەوێ، هێشتا کوڕ و کچ بەکۆمەڵ ڕاوەستابوون، بەناو گۆڕەپانەکەدا ڕۆیشتین و گەیشتینە گەراجێک، کە لە ژێرخانی بالاخانەیەکدا بوو، یەکێک لە هاوڕێکانی کارمن، ئۆتومبێلەکەی لەوێ ڕاگرتبوو، ئەوان لە پلانی ئەوەدا بوون، کە چۆن هەر حەوتمان لەو ئۆتومبێلەدا جێگەی خۆمان بکینەوە، چەند

جارێک خۆمم لە کارمن نزیک کردەوە و ویستم پێی بڵێم، 'با بە جیا تاکسییەک بگرین.'

زۆری پێ نەچوو، خۆمم لەپشتەوەی ئۆتومبێلەکەدا بینییەوە، لەنێوان دووان لە کچەکاندا، نیوەی سمتی یەکێکیان لەسەر کۆشم بوو، کارمن لەپێشەوە دانیشتبوو، زووزوو دەنگی ڕیکۆردەکەی زیاد دەکرد و لەبەر خۆیەوە گۆرانییەکەی دەچرپییەوە. ئەوەندە نەبوو بەڕێوە بووین، ئۆتومبێلەکە ڕاوەستا و هەموو دابەزین، شەقامێکی چۆڵوهۆڵ لە کەناری دارستانێکدا، چەند هەنگاوێک لە ئۆتومبێلەکە دوور کەوتنەوە، تا سنووری دارستانەکە، هێشتا ڕووناکیی دارگڵۆپەکان دەیگرتەوە، هەموویان بە ڕیزی یەکدا ڕاوەستان و پانتۆڵەکانیان تا سەر ئەژنۆیان هێنانە خوار، یەکێک لە کوڕەکان منی ڕاکێشایە ڕیزی خۆیانەوە و پێی وتم، 'مارتن، دەی تۆیش لەگەڵماندا بەشدار بە و بەو تەلبەندەدا هەڵمیزە.'

دوای ئەوەی منیش چوومە ڕیزیانەوە، بە هەمان شێوەی ئەوان، پانتۆڵەکەم داکێشایە خوار، کارمن تاوەکوو سێی بژارد، پاشان یەکیەک و دوودوو هەڵمیزاین بە تەلبەندەکەدا، سەرنجم دا، چۆن کچەکان زیاتر خۆیان بۆ بەپشتدا دەخست و هەردوو دەستیان لەناو ڕانیان نابوو، تا بە لچ و لێوە سوور هەڵگەڕاوە تەڕەکانیان، وەک کوڕەکان میزەکانیان بگەیەننە تەلبەندەکە، بەدەم میزکردنەوە، کارمن وتی، 'مارتن، ئەوە پیشەی دەیان ساڵمانە، هەموو شەوێکی شەممان، دوای گەڕانەوەمان لە دیسکۆ، لەم جێگەیەدا، زۆر جار دوو هێندەی ئێستاین، ئەو تەلبەندە دڕکاوییە دەبینیت، ئەوە ئاسەواری جەنگی جیهانیی یەکەمە، ئەوە ئەو سنوورەیە، کە بەلجیکای کردبوو بە دوو بەشەوە، تاوەکوو

ئەمرۆیش، ئاسەواری بەسەر ڕۆحی خەڵکی ئەم وڵاتەوە ماوە، دەزانی مارتن، ئێمە هەموو تەنها هاوڕێی میزی یەکترین.'

زۆری پێنە چوو، هەموو ترنجاینەوە نێو ئوتومبێلەکە، بەدەم پێکەنین و هۆڕین لێدانەوە، گەیشتینە بەردەمی ماڵی کارلا. لە دابەزینماندا، هەموویان گەرموگوڕ دەستی تەوقەیان بۆ درێژ کردم و ماڵئاواییان لێ کردم.

کاتێک گەیشتینە بەردەم دەرگاکە، کارمن دەستی گرتم و خۆی هاویشتە باوەشم، سەرێکی بۆ هەڵبڕیم و دەمی نووساند بە ڕوومەتمەوە.

دەستێکی توند لە پشتم هەڵپێکا، دەستەکەی تری شۆڕ کردەوە بۆ نێوان ڕانەکانم، هێواش لەسەر ڕیتمی ماچکردنەکەمان، بەردەوام دەستی دەجوولاند، لەبن لێوەوە لێی پرسیم، 'پێم بڵێ، ئەمشەوت خۆش ڕابوارد؟ ئەی ئەو دیسکۆیەت بەلاوە چۆن بوو؟ بەڕاست، دیسکۆی چاڵ، لە دیسکۆکانی شاری ئەمستردام خۆشتر نییە؟'

پاش ئەوەی تاوێک لێم ڕوانی، بینیم هیلاکی بە ڕوویەوە دیار بوو، نەمزانی چیی وەڵام بدەمەوە، چاوم لێک نا و دەموچاوم توند کرد لەنێوان گەردن و قژە لوول و ئاڵۆزاوەکەی و بە گوێیدا چپاندم، 'زۆر تامەزرۆت بووم، تکایە، دەمت داخە و هیچ مەڵێ، بۆ تێربوونمان لە یەکتری، تەنها چەند کاتژمێرێکمان لەپێشە.'

کارمن ئەوەندە ماندوو و مەست بوو، خۆی بەپێوە بۆ ڕانەدەگیرا، لە هاتنەژوورەوەماندا پشتم تێ کرد و خۆی دا بەسەر پشتمدا و بێدەگ بردم بۆ ژوورەکەی خۆی، لەناو جێگەکەدا، بەدەم پێکەنینەوە دەت وت پێشبڕکێ دەکەین، ئاخۆ کاممان خێرا خۆی ڕووت دەکاتەوە، دوای ئەوەی تاوێک یەکتریمان گوشی و

لستەوە، پاشان لە شانی یەکەوە ڕاکشابووین و خامۆش و بێسرتە لە چاوی یەکترمان دەڕوانی، سپێدە بوو، ڕووناکیی دەرەوە لە پەنجەرەکەوە کارێکی کردبوو، کە ڕوخساری یەک بەباشی ببینین، لەناکاو کارمن، بەبێ ئەوەی ماسوولکەکانی دەموچاوی تێک بدات، بەخوڕ فرمێسک بە چاویدا دەهاتە خوار و تک تک دەکەوتنە سەر جێگەکە، لە قووڵاییمەوە گەرمییەک دای گرتم، کە لە چاومەوە سەری کرد و لە شێوەی فرمێسک هاتە دەرەوە. توند خۆمان بەیەکەوە نووساند و چاوی تەڕمان لێک نا.

دوانیوەڕۆی ڕۆژی دوایی، لە دەنگی کارلا بەئاگا هاتمەوە، کاتێک چاوم کردەوە، بینیم کارلا لەسەر قەراغی جێگاکە دانیشتووە، قاتێک تراکسوودی تەسکی لەبەردا بوو، چاوی بە مندا دەگێڕا، کە بەڕووتی لەسەر جێگەکە کەوتبووم، بە دەنگێکی عەیارانەوە وتی، 'بەیانیت باش، ئازیز.'
بێ ئەوەی وەڵامی بدەمەوە، بە پەلە پەل لە پێخەفەکە گەڕام، کارلا نوشتایەوە، لەبەر پێیدا پێخەفەکەی هەڵگرتەوە و بۆی فڕێ دام و پێی وتم، 'دەبێت ئەمشەو چ حەشرێکت بە کچەکەم کردبێت، زەرد هەڵگەڕاویت و بۆنی شەهوەتت لێ دێت.'
هەستا بڕوات، ئاوڕی دایەوە و دیسان وتی، 'زوو بکەن دەی، وەرنە خوارێ، من چاوەڕوانتانم، پێکەوە دەچین بۆ چێشتخانەکەم، لەوێ جێگەی تایبەتمان بۆ گیراوە و ئەمشەو لەوێ ئاهەنگە.'

١٠

# پۆرترێت

چەند حەفتەیەک دوای گەڕانەوەی سەلیم، سەرلەبەیانی زوو لەخەو بەئاگا هاتمەوە، بەلێشاو دەزوولەی تیشکی خۆر خۆیان ترنجاندبووە نێو ژوورەکەوە، بەئەستەم دەمتوانی چاوم هەڵبڕم، لە خەیاڵی خۆمدا بە خۆمم وت، 'خۆ دوێنێ شەو پێش خەوتنم پەردەکانم دادابوونەوە؟'

بەردەوام گوێم لە خشەخشی پێ بوو، بەتانییەکەم بەسەر خۆمدا دا و تاوێک خۆم لەژێریدا شاردەوە، لە خەیاڵی خۆمدا وتم، 'دیسان دایکم، وەکوو پیشەی هەمیشەیی، بەم بەیانییە زووە هەڵی کوتاوەتە سەرم.'
لەپڕ بەتانییەکەم لەسەرم لا دا، بەنیازی ئەوەی ئەو پرسیارە لە دایکم بکەم، ئاخۆ، بۆچی بەو بەیانییە زووە بێزاری کردووم؟
کاتێک چاوم بە دیوارەکاندا گێڕا و قژە لوول و سپی و ئاڵۆزکاوەکەی سەلیمم بینی، وەک پیشەی ڕۆژانەی، بەیانییان زوو

بە زیندانەکەدا زیاتر لە کاتژمێرێک دەستی لە پشتی توند دەکرد و دەگەڕا، شەپۆلی گەرمییەک لە شادەمارەکانمەوە دایان بە ڕوومدا، چاوم تەڕ بوو، بەڵام ئەو بێزاری و تووڕەبوونەم ڕێگەیان بە فرمێسکەکانم نەدان بەر ببنەوە. سەرسام، تاوێک بوو لە بنمیچی دێز و چڵکنی ژوورەکەم دەڕوانی، بۆ ئەوەی بتوانم بە خەیاڵیشم لەو ئانوساتە دەر بچم. بە دەنگی سەلیم ڕاپەڕیم، بە بێزارییەکەوە وتی، 'دەزانیت مارتن، من و تۆ چوار حەفتەیە پێکەوەین!'
لەژێر لێوەوە بەهێواشی وتم، 'چوار حەفتە، چوار حەفتەی پڕ لە گومان، بریا هەر تەنیا بوومایە.'

لەگەڵ سەلیم، ئەو چوار حەفتەیە جگە لەوەی ڕۆژانە چەند جارێک بە گومانەوە لە چاوی یەکترمان دەڕوانی، یەک قسەمان لەگەڵ یەکتر نەکرد، بۆ ئەوەی هیچمان دەستپێشخەری بکەین و وتەیەک چییە بیدرکێنین.
سەرلەبەیانیی ئەو ڕۆژە، پۆلیسەکان، وەکوو بیانەوێت دووبارە دەستگیرمان بکەنەوە، بەکۆمەڵ دایان بە سەرماندا و بێبەزەییانە باڵبەستیان کردین، بۆچی و بۆ کوێ، پێم وا بێت سەلیمیش نەیدەزانی، هەرچەندە ئەو خۆی لە پۆلیسەکان تووڕە کرد و تفی تێ دەکردن و بە ئینگلیزی و بە عەرەبی جنێوی پێ دەدان، سەلیم بەدەست پۆلیسەکانەوە ئەوەندە بچکۆلە و لاواز بوو، دەت وت کەروێشکە و بەدەم تانجییەوەیە.
کەلەبچەیان کردین و خۆمان لە ژوورێک بینییەوە، لە بەشی ناوەڕاستی باڵاخانەی بەندینخانەکەدا بوو، خۆری تێ نەدەکەوت و تیشکی خۆرەکە تا سەر قەراغی پەنجەرەکە دەهات، پەنجەرەی

ئـەو ژووره، چـوار جارێـک لــە پەنجــەرەی ژووره کۆنەکــەمان گەورەتر بوو، ئەوەندەیش نزم بـوو، کـە هـەردووکمان دەمانتوانی لـە بەردەمیدا بوەسـتین و لـە دەرەوە بڕوانین، پەنجەرەکە ڕیزێک شیشـی ئاسـنی ئەسـتووری ژەنگاوی بـوو، لـە سـەر بۆ خـوار، لـە کۆنکرێتی دیـوارە ئەسـتوورەکان چـەقێنرابوون، لـەوە دەچـوو لـە ئەزەلــەوە هــیچ ڕەنگێکیــان پــێ نەبەخشــرابێت، ئــەو شیشــانە سـنوورێکیان لەنێـوان بەنـدایەتی و سـەربەسـتی و مـردن و ژیانـدا دروســـت کردبـــوو، ژوورەکـــە دوو ئەوەنـــدەی ژووری زیندانـــە کۆنەکــەمان گــەورەتر بــوو، قەرەوێڵــەی تێــدا نــەبوو. لەســـەر ئەرزەکـەی، دوو بـەتانیی سـەوز ڕاخرابـوون و چەنـد بەتانییـەکیش لەسەریان بەقەدکراوی دانرابوو.

ســـەرلەبەیانیی ڕۆژی دوای ئــەو ڕۆژە، دوو پــۆلیس ســـەلیمیان باڵبەســـت کــرد و پــێش خۆیــان دا و بردیــان، ئــەو ڕۆژە، تــا دەمـاودەمی ئێـوارە، بەتـەنیا لەبـەر پەنجەرەکـەدا ڕاوەستابووم، لـە گۆڕەپــانی بەندیخانەکــەم دەڕوانــی، بــە خــۆمم وت، 'لەوانەیــە سەلیمیان بۆ دادگا بردبێت.'
کاتێک سەلیم درەنگانێک گەڕایەوە، هەمان پرسیارم لێ کرد، دایـە قاقــای پێکــەنین و ســـەرێکی لــێ ڕاوەشــاندم، پاشــان کفــت و پرزەلێبـڕاو خـۆی دا بـە زەویـدا، بێجگـە لـەوەی جارجـار گـوێم لـە لووشکە لووشک و نووزە نووزی گریـانی بـوو، ئـەو ڕۆژ و شـەوە هیچی تری نە وت.
ڕۆژی دوایی، پاش ئەوەی من پێش سپێدە بـەئاگا بـووم و تاوێـک بوو لە بەردەمی پەنجەرەکەدا بێدەنگ ڕاوەستا بووم، ئینجـا سـەلیم

لە خەو ڕاپەڕی و لەبەر خۆیەوە و بە دەنگێکی تێکشکاوەوە وتی، 'دادگا... دادگا، ئەم وڵاتە وڵاتێکی بێدادە.'

زۆری لە خۆی کرد و و هات لە شانمەوە، لە بەردەم پەنجەرەکەدا ڕاوەستا، بێزاری بە دەموچاوە زەردەڵە و وشک هەڵهاتوەکەیەوە دیار بوو، دەستیشی ڕەش هەڵگەڕاو، وەکوو دوو دەستکێشی ڕەشی لەدەست کردبن، زووزوو بە یەکتری دەیشێلان، بێ ئەوەی سەیری بکەم، لێم پرسی، 'ئازاریان دێت؟'

'ئازاری چی؟'

'دەستەکانت!'

'نەخێر، دەخورێن، ئەوەیش مانای ئەوەیە، خوێنیان بۆ دێت.'

ڕووی لێ وەر گێڕام و هەردوو دەستی خێرا لەپشتی هەڵپێکان و لێمی شاردنەوە، لە خەیاڵی خۆمدا وتم، 'ئەوەندەی کێشاون بە ڕووی ئەو دەرگا ئاسنە ڕەقەدا، وەکو پارچە کۆتەرەیەک ڕەق هەڵگەڕاون.'

ئەو وشەیە، کە بەردەوام لە گوێمدا دەزرنگێتەوە، هەموو ڕۆژێک سەلیم چەندین جار لەپشتی دەرگای ژوورەکەوە ڕادەوەستا، بە کۆڵەمست لە دەرگاکەی دەدا و بانگی دەکرد، 'یاناس حرام علیکم.' سەلیم هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و دیسان وتی، 'مارتن، حەفتەی یەکەمی هاتنی تۆ بۆ ئێرە، من لە زیندانی تەنیاییدا بووم.'

بێ ئەوەی وەڵامی بدەمەوە، هەردووکمان بێدەنگ لە پەنجەرەکەوە لە دەرەوەمان دەڕوانی، ئەوەی لێمانەوە دیار بوو، گۆڕەپانێکی زەردباوی کۆنکرێتکراو بوو، هەر بە یاریگەی باسکە دەچوو، گۆڕەپانەکە سێ لای بە دیواری باڵاخانەی بەدینخانەکە گیرابوو، لاکەی تری، کە دەکەوتە بەرانبەر پەنجەرەی ژوورە نوێکەمان، بە

دیوارێکی پێنج تا شەس مەتر بەرز گیرابوو، سەر دیوارەکە بە تەلی دڕکاوی تەنرابوو، بە جۆرێک، کە تەلە دڕکاوییەکان وەک پرچ بە شان و ملی دیوارەکەدا شۆڕ بووبوونەوە، بەرزی دیوارەکە کارێکی کردبوو، کە بیابانەکەمان لێوە دیار نەبێت. لەبن دیوارە بەرزەکەدا، دەیان بەندکراو، کە هەمان جلی ئێمەیان لەبەردا بوو بە ڕیز لە شانی یەکەوە لەبەر ئەو خۆرە گەرمەدا بێدەنگ چاویان لێک نابوو و نێرگەلەیان دەکێشا، بەدرێژایی ئەو ڕۆژە لێم ڕوانین، چاوەڕوانی ئەوە بووم، ئاخۆ کەی تیشکی خۆرەکە دەیانسووتێنێت و دەبن بە خۆڵ، من لەبەر سێبەرەکەیشدا خەریک بوو لە حەژمەت گەرما دەخنکام، لە خەیاڵی خۆمدا لە خۆمم دەپرسی، 'دەبێت بەر ئەو خۆرە چەند گەرم بێت؟'

بەدرێژایی ئەو ڕۆژە، بێوچان مژیان لە نێرگەلەکانیان دەدا و تاوێک دووکەڵەکەیان لە سییەکانیاندا بەند دەکرد و پاشان دەیانکرد بە هەوادا. کاتێک من لەم خەیاڵانەدا بووم، سەلیم پرسیی، 'بۆچی بەند کراویت؟'

ڕووم تێ کرد، پاش ئەوەی لێم ڕوانی، شانم هەڵتەکاند و وتم، 'لەوەتەی لە بەدینخانەم، خۆیشم ئەو پرسیارە لە خۆم دەکەم، بۆچی بەند کراوم؟'

باڵەکانی بڵاو کردنەوە، ڕای وەشاندن و بە بێزارییەکەوە وتی، 'بۆچی ڕاستیم پێ ناڵێیت، لەسەر چی بەند کراویت؟'

'کەی زانیم لەسەر چی بەند کراوم، ئەوا پێتی دەڵێم.'

'یا حمار، تۆ جوولەکە نیت؟'

'بەڵام پرسیارەکەی تۆ ئەوە نەبوو، تۆ دەتەوێت بزانیت من لەسەر چ تاوانێک بەند کراوم.'

'ئەوە گرنگ نییە لێرە، تەنها ئەوەندە بەسە کە...'

بە سەرسوورمانێکەوە لێم ڕوانی و پرسیم، 'تێناگەم، چی، تەنها ئەوەندە بەسە؟'

'کە تۆ جوولەکەیت.'

'ئەوان بە هەڵە تێگەیشتوون، من جوولەکە نیم، من تەنها هاووڵاتییەکی ئاسایی هۆڵەندیم.'

دەستێکی بۆ دەرگای ژووری زیندانەکە ڕاکێشا و پێکەنی و وتی، 'دەزانی چی، مارتن، تۆیش وەکوو من ڕۆژانە ئەو پرسیارە لەو دەرگایە بکە، گوایا بە ناهەق گیراویت، ئەوە من زیاتر لە سێ ساڵە، پرسیار لەو دەرگا ئاسنە دەکەم، بەڵام هەرگیز بێئەقلی وا نەکەیت، ئەو پرسیارە لە پۆلیسەکان بکەیت.'

'بۆچی نا؟'

'بە خوای گەورە، ئەوان تەنها بە دارەکانی دەستیان وەڵامت دەدەنەوە!'

تاوێک بوو بیرم لە قسەکانی سەلیم دەکردەوە، پۆلیسی بەندینخانەکەی پێشووم هاتەوە یاد، بە خۆمم وت، 'لەوانەیە سەلیم ڕاست بکات، هەموو ڕۆژێک و بەدرێژایی شەش مانگ، ویستم تەنها یەک پرسیار لەو پۆلیسە بکەم، هەرگیز بواری پێ نەدام وشەیەک چییە بیدرکێنم، خۆیشی تەنها یەک وشەی دەزانی و بەردەوام دەی وتەوە، ئەویش وشەی خنزیر بوو.'

ڕووم لە سەلیم کرد و پرسیم،

'خنزیر بە مانای چی دێت؟'

دایە قاقای پێکەنین و سەیرێکی کردم و وتی، 'لەکوێ ئەو وشەیەت بیستووە؟ لە من، گوایا من پێم وتیت خنزیر؟'

'نەخێر، پێش ئەوەی بمهێنن بۆ ئەم بەندینخانەیە، شەش مانگ لە بەندینخانەیەکی تر بووم، پۆلیسێک بەدرێژایی ئەو شەش مانگە، تەنها ئەو وشەیەی لەگەڵدا بەکار دەهێنام.'

دەستە ڕەش و وشکەوەبووەکانی هەڵبڕین و خستنیە سەر شانم، بە پێکەنینەوە لە چاومی ڕوانی و وتی، 'خنزیر بە مانای بەراز دێت.'

پێکەوە دامانە قاقای پێکەنین و پاشان لێم پرسی، 'بۆچی بەراز؟'

'لەبەر ئەوەی زۆر ڕێزی لێ گرتوویت!'

سەلیم ئەمەی وت، پاشان لەبەر پێکەنین، زووزوو دەکۆکی و هەناسەی توند بووبوو، لەبەر خۆیەوە وتی، 'بەدرێژایی ئەو سێ ساڵەی کە بەندم، پۆلیسێک یان لێپرسراوێک نەبوو بە ناوی خۆمەوە بانگم بکات، تەنها بە وشەی حمار نەبێت، بەڵام بۆ زانیاریت، لێرە هەردەم کەر لە بەراز بەنرخترە.'

دیسان دامانەوە قاقای پێکەنین، زۆر دەمێک بوو نەک هەر پێنەکەنیبووم، بەڵکوو زەردەخەنەیەکیش چییە، نەکەوتبووە سەر لێوانم، هەستم بە ئازاری ماسولکەکانی دەموچاوم و سەر سنگم دەکرد. پاش ئەوەی لە باسی بەراز و کەر بووینەوە، تاوێک بوو بێدەنگ لە دەرەوەمان دەڕوانی، سەلیم بەهێواشی لەبەر خۆیەوە وتی، 'دەزانیت مارتن، ئەو بەندینخانەیەی تۆ پێش ئێرە لێی بوویت، پێم وا بێت، بەندینخانەی الأستئنافە لە دەرب سعیدی سەر بە قاهیرە.'

'نازانم، بەڵام زیاتر لە شەش مانگ لەوێ بووم.'

'ئاخ، کوڕی باش، شەش مانگ، ئەو شەش مانگە لە میسر، بە شەش ڕۆژ لە هۆڵەندا بەراورد بکە، ئەم بەندینخانەیەی ئێستا من

و تۆ لێی بەندین، لە ناوەڕاستی بیاباندایە، شەش سەد کیلۆمەتر لە خوارووی شاری قاهیرەیە، لە سەرەتای سالانی نەوەدەکاندا و لەسەر فۆرمی "H"ی زمانی ئینگلیزی دروست کراوە، زیاتر لە دوو سەد ژوورە، کە ژوورەکان دابەش دەبن بەسەر دە بەشدا، یەکێک لەو بەشانە، ئەم بەشەی ئێمەیە، تایبەتە بە گیراوانی سیاسی و جاسوس، بۆ نموونە، من و تۆ، زۆرێک لەو گیراوانەی لەم بەشەی ئێمەدان، لە سەرەتای دروستبوونی ئەم بەندینخانەیەوە لێرەن، هاوشێوەی من و سەدان بەندی تری وەکوو من، کە زۆربەمان هەمان کەیسمان هەیە، بۆ زانیاریت، من لە دەی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٨٥وە بەند کراوم.'

'چی، چی، ئەوە بەڕاستتە، ئەوکات من تەمەنم تەنها چوار ساڵ بووە.'

'خوا ئاگادارە، زۆرت لە سەرم نییە تا درۆت لەگەڵدا بکەم، پێش ئەوەی بمگوێزنەوە بۆ ئێرە، کە هەژدە ساڵێک پێش ئێستا دەکات، دە ساڵێک لە نزیک قاهیرە لە بەندینخانەی سەربازی بووم، ئەوێ تەنها تایبەت بوو بە گیراوانی سەر بە دەستە ئیسلامییەکان، بەتایبەتی لایەنگرانی ئیخوان.'

'ئەگەر بۆم هەبێت پرسیاری ئەوەت لێ بکەم، لەسەر چی بەند کراویت؟ ئایا، ئایا تۆیش جوولەکەیت؟'

' استغفر الله، استغفر الله العظیم! کوڕی گەنج، تکات لێ دەکەم بە جوولەکە ناوزەدم مەکە!'

'بۆ؟'

'پێم وتیت، تکات لێ دەکەم، بە یارمەتیت!'

'تێناگەم!'

'تکات لێ دەکەم ڕێزم لێ بگرە، تا ڕێزت لێ بگرم، بە هەرحاڵ، لە یاسای میسردا، ئێمە زۆر لە جوولەکە...'

'ئێوە... ئێوە کێن؟'

'ئەگەر بتەوێت بزانیت من کێم و بۆ ئەوەندە ساڵە بەند کراوم، پێویستە لە سەرەتاوە بۆت باس بکەم، ئەگەر خوازیاریت گوێم لێ بگریت!'

'ئیشمان، کارمان؟ بەدڵنیاییەوە گوێت لێ دەگرم.'

سەلیم هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، پاش ئەوەی تاوێک بێدەنگ لە دەرەوەی دەڕوانی، کە پێدەچوو لە بیرکردنەوەدا بێت.

ئەوسا سەلیم بەسەرهاتی خۆی ئاوا بۆ گێڕامەوە:

'شەوێک بەڕێکەوت لە شەقامێکی قاهیرەدا، ڕیسوا و بێماڵ و بێکار، بێ هاوڕێ و بێ کەسوکار، بەڕێکەوت لە شەقامی قصر النیل ڕووم بوو بە ڕووی چەند کەسێکەوە، نانیان دابەش دەکرد بەسەر ئەو کەسانەدا، کە ئەو شەوە لەو شەقامەدا ئامادە بوون، پاسێکی سپییان پێ بوو، چەندین گەنج بە مەبەستی خۆراک وەرگرتن دەورەیان لێ دابوون، بە فرسەتم زانی و چوومە ڕیزەوە ڕاوەستام، سەرنجم دا خۆراکیان بە هەرکەسێک دەدا، ڕایان دەگرت و تاوێک قسەیان لەگەڵدا دەکرد، کاتێک سەرەم هات، گەنجێکی ڕێکپۆش، چاکەت و پانتۆڵێکی ڕەشی لەبەردا بوو، پێڵاوەکانی لەبەر ڕووناکیی گڵۆپی سەر شەقامەکەدا بریقەیان لێوە دەهات، بە ڕوویەکی خۆشەوە سڵاوی لێ کردم و لێی پرسیم ناوت چییە و کارت چییە بەڕێز، ئایا بەڕێزت خاوەنی ماڵیت یان بێ دەرەتانیت، لە وەڵامدا ناوی خۆم و پاشان پێم وت، "سالانیکە

بێکارم و لە کوچە و کۆڵانەکانی شاردا شەو و ڕۆژم دەگوزەرێنم."

دەزانیت چی، مارتن، باوەڕ بکە لەو ساتەدا زۆر دەترسام کە سەر بە پۆلیس بن، دەستی بۆ درێژ کرم و دەستم نایە ناو دەستی، کابرا توند دەستی گوشیم و ڕای وەشاندم، زەردەیەکی بۆ کرم و پێی وتم، "ئێمە ئامادەین، وەکوو ڕێخراوێکی خێرخوازی هاوکاریت بکەین. یەکەمین، وەک جێگەی خەو. دووەمین، دۆزینەوەی کار بۆت، هەرئێستا بڕیاری خۆت بدە و ئەم هەلە لەدەست خۆت مەدە، لە میسری خۆشەویستدا، هەموومان یەکسانین و گەنجێکی وەکوو بەڕێزیشت، شایانی ژیانێکی باشترە."

چاوی لە چاوم بڕیبوو، دەستی بەر نەدام، تا وەڵامم دایەوە، "باشە، باشە، بە سوپاسەوە هەموو هاوکارییەکی ڕێخراوەکەتانم قبوڵە."

دەزانیت مارتن، ئەوسا من خاوەنی هیچ نەبووم، تاوەکوو لەدەستم بچێت و لێی زەرەرمەند ببم، خۆم ڕادەستی ئەوان و قەدەری خوای گەورە کرد، هەر لەوێدا پاسەکەیان پڕ کرد لە کەسانی بێدەرەتان و ڕیسوای سەر ئەو شەقامانە و بەرەو دەرەوەی قاهیرە بەڕێ کەوتین. لە دەرەوەی شار، لە بەردەمی باڵاخانەیەکدا پاسەکە ڕاوەستا و هەموو پێکەوە دابەزین، بێجگە لەوان، کە چوار کەس بوون، ئێمەیش دە کەسێک دەبووین، چەند پیاوێک لە بەردەمی باڵاخانەکەدا ڕاوەستابوون، پێدەچوو چاوەڕوانی ئێمەیان کردبێت. بە ڕێز تەوقەی گەرمیان لەگەڵ کردین و بە ڕوویەکی خۆشەوە پێشوازییان لێ کردین، هەر لەوێدا

کردینیان بە دوو بەشەوە، من لەگەڵ سێ کەسی تردا و دووانیش لە پێشوازیکارەکانمان بۆ نهۆمی چوارەم پێشمان کەوتن، شوقەیەکی نوێ بوو، لەوە دەچوو تازە نۆژەن کرابێتەوە، چونکە هێشتا بۆنی گەچ و چیمەنتۆی تەڕی لێ دەهات، ئەپارتمانەکە دوو ژوور و هۆڵێک بوو، هۆڵەکە تەنها کومباریێکی تێدا ڕاخرابوو و هیچی تر، ژوورێک دوو قەرەوێڵەی دووقاتیی تێدا بوو، ژوورەکەی تریان، چەند کورسییەک و چەندین کتێبخانەی پڕ لە کتێب، یەکێک لەو دوو پیاوەی لەگەڵمان بوو پێش ئەوەی بەتەنیا بەجێمان بهێڵن، پێیان وتین، "کوڕە گەنجەکان، ئەمە ماڵی ئێوەیە و سەربەستی خۆتان وەر بگرن، ڕۆژانە چەند جارێک خۆراکتان بۆ دێت، دانیشتووانی ئەم باڵاخانەیە، هەموو بە برای خۆتان بزانن و دەتوانن شەو و ڕۆژ لە دەرگایان بدەن، ئێستا پشوو بدەن، خوا یار بێت، بەیانی زوو چەند برایەکمان دێن و پێکەوە دەچن تا شوێنی کارتان نیشان بدەن، هەروەها لە چەند ڕۆژی داهاتوودا، خۆتان کلیلی ئێرەتان پێ دەبێت و ئەوکات ئێوە سەربەستن کاتتان چۆن بەسەر دەبەن."

پاشان دەرگای ژووری کتێبخانەکەیان داخست و لێیان دا ڕۆیشتن، یەک یەک تەوالێتمان کرد و دەست و دەموچاومان پاک کردەوە لە تەپوتۆز و ڕەشی و دووکەڵی گاز و بەنزینی ئوتومبێلەکانی سەر شەقامەکانی شاری قاهیرە، کاتێک چوومە ژووری خەوتنەکە ئەوان سێ جێگەیان بۆ خۆیان گرتبوو، تەنها جێگەیەک کە مابوو، بە بەرزییەوە بوو، پێش ئەوەی سەر بکەوم بۆ سەر جێگەکەم، ڕووم تێ کردن و پێم وتن، "ئێمە، پێویستە یەکتری بناسین."

دیار بوو ئەوانیش پێشتر یەکتریان نەدیبوو، خوا ئاگادارە، ئەو سێ گەنجە هەژارە چاویان پڕ پڕ بوو لە ترس و گومان، یەک یەک دەستم بۆ درێژ کردن و ناوی خۆمم بەڕاستی پێ وتن، بە دەموچاویاندا دیار بوو، کە ئەوان هەرسێکیان ناوی خوازراویان بۆ خۆیان هەڵبژاردبوو، پاشان بۆم دەر کەوت کە وا بوو.

من هەر زوو لێی خەوتم، بە خوای گەورە ئەوە چەند ساڵێک بوو، یەکەم جارم بوو بچمە ناو جێگەی نەرم و پاکەوە، پێشتر هەموو شەوێک لە کوچە و کۆڵانەکاندا هەر بە دانیشتنەوە دەخەوتم، دەبووایە چاوێکم لێک بنایە و بە چاوەکەی ترم، ئاگاداری خۆم بوومایە.

باوەڕ بکە مارتن، وەکو گورگ ژیانم دەبردە سەر، نەبا پۆلیس دەرکم پێ بکەن، کە ڕیسوا و بێدەرەتانم، ئەگینا دارکارییان دەکردم، لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا، دوو جار لێدانم خواردبوو، خوا ئاگادارە هیچ شارێک بە ئەندازەی شاری قاهیرە بێجێوڕێی تێدا نییە، دەتوانم بڵێم، ملیۆنێک کەس لەو شارەدا بێدەرەتانن، پۆلیسی قاهیرەش شەوانە دەکەونە ڕاوکردنیان و شەو نییە چەند کەسێکیان لێ نەکوژن و بێسەروشوێنیان نەکەن.

بەبیرم دێت، جارێکیان لە کارتۆنێکدا خەوتبووم، بە دەست پۆلیسەکانەوە بەخەبەر هاتمەوە، بەدەم لێدانمەوە پێیان دەوتم، "شاری قاهیرە بۆ کەسێکی ڕیسوا و بێدەرەتانی وەک تۆ، یاساغە، چونکە تۆ و ئەمسالی وەک تۆ، ڕوخساری شار ناشیرین دەکەن و گەشتیاران پێتان بێزار دەبن."

دەی، با لە باسەکەم دوور نەکەومەوە، ڕۆژی دوایی، تاریک و ڕوون بەخەبەریان هێناین و پاش خواردنی نان و خورما و پەنیر،

لەگەڵ دوو کەسدا بە تاکسییەک ڕۆیشتین، یەکێکیان لێی دەخوڕی، لەگـەڵ سـێ گەنجەکـەی تـر لەپشـتەوەی تاکسـییەکەدا لێـک ترنجابووین، بە خوای گەورە براکەم، خۆیشمان لە بۆگەنی چلکی لەشـمان بێـزار بووبـووین، شـۆفێرەکە لـەتاوا هـەموو جامـەکانی هێنابوونـە خـوارێ، ئینجـا یـەکێک لـە ڕێبـەرەکانمان، یـەک یـەک پرسیاری دەربـارەی ڕابردوومـان لـێ دەکرین، ئـاخۆ چ کارێکمـان کردووە و لە چی کارێکدا شارەزاییمان هەیە.

ئەگـەر بـاش لـەبیرم مابێت، وا بزانم مـن دوای هـەموویان سـەرەم هات، بواری ئەوەم هەبوو تۆزێک بیر بکەمەوە و بیری خۆم ڕێک بخـەم، وا بـزانم لـە وەڵامـدا پـێم وت، "مـن زمـانی ئینگلیـزی بـاش دەزانـم و خـاوەنی مۆڵەتنامـەی شـۆفێریم، لـە سـاڵانی ڕابـردوودا، ئەوەی کە نـانم پـێ پەیدا کردبێت، زانینی زمانی ئینگلیزی و ئەو مۆڵەتنامەی شۆفێرییەم بووە، وەکوو تر هیچ دەست ڕەنگین نیم، بـەڵام بەلامـەوە گرنـگ نییـە، هـەموو کارێـک دەکـەم، ڕێخراوەکـەی بەڕێزتان بۆم بدۆزنەوە."

کـابرا سـەرێکی بـۆ ڕاوەشـاندم و پاشـان هـەموو بێـدەنگی دای گرتین، کاتێک گەیشتینە ناو حەوشـەی کارگەیـەکی گـەورە، کە بـە دار و پـەردووی ئـەو نـاوەدا دیـار بـوو دارتاشـخانە بـوو، هـەموو پێکەوە دابـەزین و یـەکێک لە ڕێبـەرەکان، لە دەرەوەی تاکسـییەکە دەستێکی خستە سەر شانم و پێی وتم، "تۆ بچۆ لەناو تاکسییەکە دابنیشە و چاوەڕوانمان بە، کاری گونجاو بۆ تۆ لێرە نییە."

سـەرم بـۆ لەقانـد و چـووم لـە تاکسـییەکەدا دانیشـتم. پـاش کاتژمێرێـک، یـەکێک لـە ڕێبـەرەکان گەڕایـەوە، کـە شـۆفێری تاکسییەکە بوو، هـەر لە ڕێوە پێی وتـم، "ڕێخراوەکەمان خـاوەنی

کۆمپانیایەکی گەشتوگوزارە و لەوێ کارمان هەیە بۆ تۆ، کۆمپانیاکەیش ناوی الخوطارە و لە زۆرینەی ولاتانی عەرەبی نووسینگەمان هەیە، لە داهاتووشدا، خوای گەورە پشتیوان بێت، لە تەواوی دونیادا نووسینگەمان دەبێت، ئەمڕۆ تۆ دەچیتەوە ماڵەوە و لە سبەینێوە برایەکم دێت بەدواتدا و پێکەوە دەچن بۆ نووسینگە، هەر ئەو برا بەڕێزە سبەینێ دێت بەدواتدا، خۆی لێپرسراوی نووسینگەکەیە و بەرپرسیارە لە پێداویستیی جلوبەرگی گونجاو و خاوێن بۆ تۆ."

گەیاندمییە بەردەم بالاخانەکە و تا ناو ئەپارتمانەکە لەگەڵم هات، زەرفێکی دایە دەستم، کە چەند سەمونێکی تێدا بوو، دەرگای لەسەر داخستم و بەتەنیا بەجێی هێشتم، لە حەمامەکە، کە تەنها سابوونێکی سەوزی ڕەقی لێ بوو، خۆم پاک شت و بە چەرچەفی سەر جێگەکەم، خۆم وشک کردەوە، بە خوای گەورە ئەوە چەندین ساڵ بوو، تەنها لە نیلدا مەلەم دەکرد، پاش ئەوەی چەرچەفەکەم لە خۆمەوە ئالاند، پانتۆڵ و کراس و گۆرەوییەکانیشم پاک شۆردن و بە قەراغی جێگەکەمدا هەڵم خستن.

دەمەو ئێوارەیەکی درەنگ، کاتێک هاوەڵەکانم گەڕانەوە، ئەوەندە ماندوو بوون، خۆیان بە پێوە بۆ ڕانەدەگیرا، لەو دەمانەدا بوو، کابرایەکی سوورکاری قەڵەو بە مەنجەڵێکەوە خۆی کرد بە ژووردا، دوو کەسی تری لەگەڵ بوون، یەکی قاپ و کەوچکێکیان داینێ و خۆراکیان بەسەردا دابەش کردین، باش لەبیرم نەماوە چیمان خوارد.

ڕۆژی دووەم، تاریک و ڕوون بەخەبەریان هێناین، سێ هاوەڵەکەم دوای هەمان دوو کابرای ڕۆژی پێشوو کەوتن، بە منیان وت، "تۆ

لێره چاوەڕوان بە." زۆری پێ نەچوو، کابرایەکی بالابەرزی ڕێکپۆش خۆی کرد بە ژووردا، لە دەرگاکەوە بە ناوی خۆمەوە بانگی لێ کردم، "اخ سەلیم یاالله، یاالله..." خۆی پێ ناساندم، ناوی محەمەد جعفر بوو، پێکەوە بەرەو سەنتەری قاهیرە بەڕێ کەوتین، لە ڕێگە خۆمان کرد بە کۆگایەکی جلفرۆشیدا، دوای هەڵبژاردنی دوو قات و چەند کراس و جووتێک گۆرەوی، سوپاسی کابرای خاوەن کۆگاکەی کرد و بێ ئەوەی پارەی بداتێ، لێمان دا ڕۆیشتین، لە ڕێگە پێکەنیم و پێم وت، "ئەو کۆگایە بە بەلاشە."
بێ ئەوەی لێم بڕوانێت و بەدەم ڕۆیشتنەوە وتی، "نەخێر، ئێمە خۆمان خاوەنی ئەو کۆگایەین، مەبەستم، من، تۆ، ئێمە."
ئەو ڕۆژە و ڕۆژانی دواییش، لەگەڵ ئەو کابرایە بەیانییان لە کاتژمێر هەشتی بەیانییەوە دەچووین بۆ نووسینگەی الخوطار، دەکەوتە سەنتەری شار لە شەقامی ئەحمەد عورابی، کارم بەڕێکردنی میوان و لێنانی چای ئامادەکردنی شەربەت و پاککردنەوەی نووسینگەکە بوو، ئەوەی ماندووی دەکردم، تەنها ئەوە بوو کە دەبووایە لە بەیانی زوو تا درەنگانی ئێوارە بە پێوە ڕابوەستامایە و خزمەتم بکردایە.
هەموو شەوێک، ئەپارتمانەکەمان پڕ دەبوو لە میوان و تا درەنگانێک دادەنیشتین قسەمان دەکرد، قسەوباس بوو لەسەر گوزەرانمان، بە مەزەندەی ئەوان، ئامادەکردنمان بوو بۆ ئەوەی لە پاشەڕۆژدا خۆمان بێ دەستگیرۆیی ڕێخراوەکەی ئەوان، لە هەرجێگەیەک بێت، جا قاهیرە یان هەرجێگەیەکی تر لە میسر بێت، سەرلەنوێ دەست بە ژیانی ئاسایی خۆمان بکەینەوە، پاش مانگێک، هەریەکێک لە ئێمە کەسێکیان بۆ دیاری کردین، تاوەکوو

ڕێنماییمـــان بکـــات، بـــۆ خوێندنـــەوە و باشـــکردنی ئاســـتی بیرکردنـەوەمان، لەدوای ئـەو ڕۆژەوە، لەگـەڵ ئـەو مامۆسـتا یـان باشترە بڵێم ڕێنماییکارەم، کە نـاوی سـەلاح عیزەدین بـوو، بۆمـان هەبوو پێکەوە بچینە ژووری کتێبخانەکە، بـاش بـەبیرم دێت، دوو کتێبی بۆ دەستنیشان کردم، یەکێکیان کتێبێکی سید قوطب و ئەوی تریان، چ ڕۆمانێک بوو، لە ڕاستیدا لـەبیرم نـەماوە نـاوی چـی بوو، بـەلام پـێم وا بێـت نووسـەرەکەی میسـری بـوو و نـاوی نـەجیب مەحفوز یان شتێک لەو بابەتە بوو.

بۆ خوێندنەوەی ئەو کتێبانە سـەلاح عیـزەدین، چـوار ڕۆژی مۆڵـەت دامێ، هـەروەها پێـی وتـم، "پێویسـت ناکـات بچیت بـۆ کارەکـەت و چەند مانگێک تۆ تەنها خەریکی خوێندنەوە بە، مانگانەکەیشت بێ کـەموزیاد وەر دەگریـت." کاتێـک ویسـتی بـڕوات، دیسـان وتـی، "دێمـەوە و پێکـەوە دەربـارەی ئـەو دوو کتێبـە دەدوێـین." دەسـتی لەناو دەستم نا و بەگەرمی باوەشێکی توندی پێدا کردم، لـە کـاتی ڕۆیشـتنیدا، ئـاوڕێکی لـێ دامـەوە و پێـی وتـم، "بـە سـەرنجەوە بیانخوێنەرەوە و باش بەراوردیان بکە."

بـاش بـەبیرم دێـت، دوای ئـەو دوو کتێبـە، دەیـان کتێبـی تـرم خوێندەوە و پێکەوە گفتوگۆمان لەسەر کردن.

پاش ئەو مانگە و خوێندنـەوەی ئـەو کتێبانـە، پەیوەندییـەکی گـەرم لەنێـوان مـن و سـلاح عیـزەدین و سـێ هاوەڵەکەمـدا، کـە لـە ئەپاتمانەکە لەگەڵمدا بوون، دروست بووبوو، ئەو ڕۆژەیشـم لـەبیر ناچێتـەوە، ڕۆژی هـەینی بـوو، لەگـەڵ سـلاح عیـزەدین پێکـەوە لـە مزگەوتی ئەزهەر نوێژمان کرد.

پاش نوێژ، بـە پیاسـە بـەرە و ماڵـەوە بـەڕێ کـەوتین، درەنگانێکی

شەو گەیشتینە ماڵەوە، لە ڕێگە سەلاح وتی، "مەبەستی سەرەکیی ئەم ڕێخراوەی ئێمە، گەڕانەوەی ڕگەزنامەی ڕەچەڵەکی خەڵکی میسرە."

ئەوەی ڕاستی بێت، ئەوسا باش لە مەبەستی سەلاح تێنەگەیشتم، هەروەها یەکێک لە هاوەڵەکانم پێی وتم، "ڕێخراوەکەمان سەدان مزگەوتی ئاوەدان کردۆتەوە، دەیان یانەی وەرزشی، هەزاران چایخانە لە سەرتاسەری وڵاتدا، چەندین قوتابخانە، تا ئێستا هەشت کتێبخانەی گشتی و دوو چاپخانە، نووسینگەی هەلی کار، نووسینگەی گەشتوگوزار، دەیان ئوتێل، لە هەزاران شار و دێی وڵاتدا خانەی هەژاران کراونەتەوە، گرنگترینیان ئەوەیە، لە هەموو شارە گەورەکانی میسردا، لە زۆربەی شارەکان گەلێک لە هاوشێوەی ئەم باڵاخانەیی ئێمە دروست کراون و خەڵکی هەژار و بێدەرەتانی وەک ئێمە لێی سوودمەندن، ئەوەیش ڕەنجی شانی گەنجانی ماندوونەناس و دڵسۆزی دامەزرێنەری ئەم ڕێخراوەیە، ئێمەیش ئەرکی سەر شانمانە، بەردەوامیی پێ بدەین و لەپێناویدا ڕەنج بدەین."

ڕۆژێک لەو ڕۆژانەی لەگەڵ سەلاح عیزەدین پێکەوە لە گەڕان بووین، سەلاح وتی، "کوڵەکەی ئەم باوەڕەی ئێمە، لە وڵاتی میسری ئازیز و گەورەدا، زانایانە، بە هێز داکوترا، پشتیوان بە خوای گەورە، لە ساڵانی داهاتوودا، هەموو دونیا دەگرێتەوە."

ئەوسا، یەکەمین جار بوو لە ژیانمدا هەست بە بەختەوەری بکەم، دەمزانی بۆچی دەژیم و کار دەکەم و چ پاشەڕۆژێک چاوەڕێمە، زۆر بە دڵسۆزی و هەست بە لێپرسراوێتییەوە کارم دەکرد.

سێ سەد جنیە مانگانەکەم بوو، ڕێخراوەکە نیوەیان بۆ خۆیان

دەبرد، لە سەرەتاوە ڕازی نەبووم، دوای چەند مانگێک، ئەوەیشم بە زۆر دەزانی، نیوەی داهاتەکەم بۆ خۆم هەڵگرم، چونکە لەو دەمانەدا ئەوەندە بە خوێندنەوە و هاوڕێ نوێکانمەوە خەریک بووم، نەمدەپەرژایە سەر ئەوەی پارەکانم خەرج بکەم، پاشان، ئەوەی مانگانە دەمایەوە، دەمگەڕاندەوە بۆ ڕێخراوەکەمان.

برام مارتن، پرسیارەکەی تۆ ئەوە بوو، من لەسەر چی گیراوم، شەوێک لە خەودا بووین، کە دایان بەسەرماندا، هێزی سەربازیی تایبەت لە دەرگا و پەنجەرەوە خۆیان کرد بە ژووردا، خوای گەورە ئاگادارە، لە بانگی الله أکبر و شریخەی گوللە بەئاگا هاتمەوە، زۆر بێبەزەییانە باڵبەستیان کردین، دەیان گەنج لەو باڵاخانەیەیی ئێمەدا خۆیان نەدا بەدەستەوە و بوونە قوربانی، لە ئەنجامدا، سێ پەراسووم شکا و جومگەی شانێکیشم دەر چووبوو، لە بەندینخانە زیندانییەک شانی بۆ خستمەوە جێگەی خۆی، پەراسووەکانم هەر بەخواری خۆیان یەکیان گرتەوە.

ئیتر ئەو شەوە، هەموو سەرنشینانی باڵاخانەکەیان دەستگیر کرد، کە زیاتر لە بیست پاسێک دەبووین.

پاش ئەوەی چوار ساڵ لە گرتووخانەی سەربازی بووم، ئینجا لێپێچینەوەم لەگەڵدا کرا، بە خوای گەورە هیچ پرسیارێکیان لێ نەکردم، هەموو لێپێچینەوەکەم دوو خولەکی پێ چوو، بێ ئەوەی من بۆم هەبێت هیچ بڵێم، لێپرسراوێکی سەربازی پێی وتم، "تۆ بە دوو تۆمەت تاوانبار کراویت:

یەکەم، تۆ ئەندامێکی چالاکی دەستەی تیرۆرستی اخوان المسلمینیت.

دووهەم، لە ساڵی ١٩٧١دا، کاتێک تەمەنت هەژدە ساڵ بووە،

نـەچوویت بـۆ سـەربازی، هـەڵهاتوویت لـە ئەدرەسـی نیشـتەجی بوونـت، بەتایبـەتی لـەو سـاڵەدا وڵات لـە تەنگانـەدا بـووە، چونکـە لەگەڵ ئیسرائیلدا لە جەنگێکی قورسدا بووە."

دەزانیت چۆن، مارتن، بەبیرم دێت ئەو ساڵەی دەبووایە بچوومایە بۆ سـەربازی، مـن تـەواو خـۆم ون کردبـوو، مـاددەی هۆشـبەرم بەکار دەهێنا. ئەو چەندین ساڵەم بە یەک ڕۆژ لێ ڕۆیشت، خۆم و باوەڕەکەیشـم لـە جـەنجاڵیی شـەقامەکانی قـاهیرەدا لـێ ون بـوو، بـەڵام نـەمتوانی لـە بـەردەم ئـەو لێپرسـراوە سـەربازییەدا هـیچ بەرگرییەک لە خۆم بکەم، هـەر وەکوو بۆم بـاس کردیت، هـەموو دانیشتنەکەمان دوو خولەکی خایاند، لەبەرامبەر ئـەو دوو تاوانـەدا، سزای هەتاهـەتاییان بەسـەردا بڕیم، لـەو ڕۆژەوە تـا ئـەمڕۆ، هـیچ بەرگرییـەکم لـە خـۆم نـەکردووە، لـەوە دەچێت هـەر لـە یەکـەم ڕۆژەوە، ڕۆحم ئەوەی قبوڵ کردبێت و بەندبوون بە شایانی خۆی بزانێت، بەڵام لە هـەمان کاتیشـدا، ڕۆژی جارێک گـەرم دادێم و لـە نـاوەوە دەکـوڵێم، بـە جۆرێـک، ئەگـەر ڕۆژێـک ڕوو نـەدات، لـەوە دەچێت دڵم لە لێدان بکەوێت.'

سـەلیم، پـاش تاوێـک بێـدەنگی، هەناسـەیەکی قـووڵی هەڵکێشـا و دیسان وتـی، 'یا خنزیر، تۆ وا دەزانیـت زیرەکیت و نهێنیی خـۆت لای کابرایەکی غەریبی وەکوو من ناڵێیت، دەتـەوێت مـن بەئاسـانی بـاوەڕت پـێ بکەم، گوایا نـازانی لەسـەر چـی بەنـد کراویـت، هـیچ پەلـەم نییـە، بـە خـوای گـەورە، ڕۆژێـک دێـت خـۆت دەیـدرکێنیت، بوەستە جارێ، جارێ زووە، بە خوا پاش ساڵێک یان دووان خۆت خوازیاری ئەوە دەبیت یەکێک بێت و گوێت لـێ بگرێت، وەک من،

چەندین ساڵە چاوەڕوانم تاوەکوو کەسێک بێت و بەسەرهاتی ژیانی خۆمی بۆ بگێڕمەوە، ئەوەی بۆم باسکردیت، ئەوە هەمووی نییە بگرە بەسەر هاتی من زۆر لەوە زیاترە و سەدان و هەزاران جار بۆ ئەو دیوار و دەرگا و پەنجەرە و جێگەیەم گێڕاوەتەوە، تەنانەت زیخ و بای ئەو بیابانەیش بە سەرهاتی ژیانی من دەزانن، ئەگەر لە ناکاویش مردم یان لە یەکتری جیایان کردینەوە، ئەوا ئەوان بەسەرهاتی تەواوی منیان لایە.'

بە سەرنجەوە لێم ڕوانی، لە خۆمدا بۆ وشەیەکی گونجاو دەگەڕام، بەڵام ئەوسا هیچم نە وت، ڕووم لێ وەر گێڕا، بە دوو چاوە تەڕەکانم، لە بەندییەکانم دەڕوانی، کە لە گۆڕەپانی بەندینخانەکە دانیشتبوون و بەردەوام نێرگەلەیان دەکێشا.

سەلیم دەستی ڕووەو گۆڕەپانەکە ڕاکێشا و وتی، 'ئەو زیندانییانە دەبینیت؟ ئەوانە یان زیندانیی هەتاهەتایین، یان بە مردن سزا دراون، شەو دەخەون و بە ڕۆژیش لەبەر ئەو خۆرە گەرمە نێرگەلە دەکێشن.'

'بۆچی یەکتری نادوێنن، بۆیان نییە یان...!'

'نەخێر، نەخێر، "قومی لێ بدە و خۆت هەڵبدە ڕابردووتەوە." ئەوە حیکمەتی ئەو دانیشتنەیە.'

بە سەرسووڕمانێکەوە لە سەلیمم ڕوانی و پرسیم، 'تێناگەم!'

'ژیان بۆ ئەوان، کۆتایی پێ هاتووە، هیچ ڕووناکی و ئاسۆیەک لەپێشیان نەماوە، تاوەکوو بۆی بژین، بە پێچەوانەی مرۆڤی سەربەستەوە، دەژی بە هیوای بەردەوامبوون و گەیشتن بە هیواکانی و داهاتوویەکی باشتر و زۆر شتی تریش، بەڵام ئەو زیندانییانە بۆ گەیشتن بەو ئازادییە و وەک مرۆڤ، سەرلەنوێ

بەرکەوتنەوەیان لەگەڵ ژیاندا، تەنها گەڕانەوەیانە بە خەیاڵ بۆ ڕابردوویان، ئێستا ئەوان خوازیارن ڕۆحیان لە ئێستایان داببڕن. مارتن، بۆ زانیاریت، ئەوانە هەموو مولحیدن و مونافیقن، باوەڕیان بە خوا و پاشەڕۆژ نییە، جا گوێ بگرە مارتن، ئەوە ئێمەیش ئەوسا لە قاهیرە وامان دەکرد، ئەها، ئەها، سەیریان بکە، چۆن قومی لێ دەدەن، دەیانبینیت چۆن بە دووکەڵی نێرگەلە ڕۆحیان قانگ دەدەن، پاشان تیشکی ئەو خۆرە گەرمە کاسیان دەکات و ڕۆحیان لە جەستەی کوڵاویاندا بێزار دەبێت، ئینجا تەواو بێهۆش و سڕ دەبن، وەک چۆن هەنگبڕەکان دووکەڵ بە شارەهەنگدا دەکەن، بە خوای گەورە، بەندبوون مانای لێسەندنەوەی مافی بەمرۆڤبوون و تەنانەت ئیمانیشت لێ زەوت دەکات، زیاتر لە بیست ساڵ لە مانای بەمرۆڤبوونم گەڕام، کاتێک خەریک بووم لێی نزیک ببمەوە، ئەوە ڕووی دا، کە بۆم باس کردیت، لەوانەیە تۆ لەو باسانەم سەرت تەقەی بێت، بەڵام ئەوەیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی من دەمێکە ژیانی بەندیم پەسەند کردووە، لەبیرم چۆتەوە چۆن ئەزموونی ژیان و سەربەستی بکەم، مەبەستم لە تۆ نییە، بەڵکوو مەبەستم خۆمە، تۆ هێشتا بۆن و بەرامی مرۆڤێکی سەربەستت لێ دێت.'

ئەوەندە بە سەرنجەوە گوێم لە سەلیم گرتبوو، قسەکانی قورساییان لەسەر زەینم کرد و گوشاریان بۆ هێنام، بە دڵپڕییەکەوە، بەهێواشی و لەبن لێوەوە چپانبدم، 'وا پەروەردە کراوم، لە دەرەوەی خۆم هەرگیز بۆ سەربەستی نەگەڕێم، جا لێرەبم یان لە...'

'تۆ باشتر وایە گوێ لە من بگریت، باشتر وایە وشەی سەربەستی

به زووترین کات لەبیر خۆت بەریتەوە. ئەو وشەیە، لەم کاولەیەدا ڤایرۆسێکە و دات دەڕزێنێت.'

'یانی، بەو هەموو بێمانابییەوە ئێرەم قبوڵ بێت؟'

لەو دەمەدا، لە فیکەفیکی پۆلیسەکان ڕاچڵەکین، لەناکاو بە گۆڕەپانی بەندینخانەکەدا بڵاو بوونەوە، پۆلیسەکان نێرگەلە کێشەکانیان پێش خۆیان دان و لە دەرگایەکەوە کە دەکەوتە ژێر ژوورەکەی ئێمەوە کردنیان بە ژووردا، لە کاتێکدا ئێمە لە دەرەوەمان دەڕوانی و بێئاگا بووین، لەوەی دوو پۆلیس هاتبوونە ناو ژوورەکەمان و لە پشتمانەوە بێدەنگ ڕاوەستابوون، بێ ئەوەی بماندوێنن، کەلەبچەیان کردە دەستمان و پێش خۆیان داین، سەلیم لەبەر خۆیەوە هەر دەیبۆڵاند و چەند جارێک، هەر وەکوو پیشەی هەمیشەیی جنێوی بە پۆلیسەکان دەدا، پۆلیسەکانیش نووکی دارەکانیان لە قنگ و لاقەبرغەی دەدا و پێی پێدەکەنین، زۆری پێ نەچوو، گەیاندینیانەوە ناو ژوورە کۆنەکەی خۆمان، پۆلیسەکان، وەک ئەوەی یاریمان لەگەڵدا بکەن، سەروشەقیان لە قنگمان هەڵدا و بەدەم قاقا لێدانەوە لێیان دا ڕۆیشتن.

سەلیم باڵەکانی پان کردنەوە و چەند جارێک بەدەوری خۆیدا خولایەوە، بەدەم پێکەنین و بە دەنگی بەرز وتی، 'ئاخ، ژوورەکەم، بە خوا بەهەشتت پێ ناگات، ماڵەکەی خۆم!'

پاش ئەوەی تاوێک بوو بە جووت پێدەکەنین، سەلیم لەو دەمەدا بەدەم پێکەنینەوە بە ژوورەکەدا دەهات و دەچوو، چووم لەسەر قەراغی جێگەکە دانیشتم و لە سەلیمم دەڕوانی، لە یەک ساتەوەختی کورتدا، ڕەنگی گۆڕا و ڕەش هەڵگەرا، لەپڕ هەڵوێستەیەکی دەکرد و سەرسام لە هێڵکارییەکانی سەر

دیوارەکانی دەڕوانی، دەستی لەیەک هەڵپێکان و وشک لە بەردەم پۆرترێتە شێواوەکەی سەر دیوارەکەدا ڕاوەستا، ئەو پۆرترێتەی شێوێندرابوو. سەلیم ڕۆژانە چەند جارێک دەستەونەزەر بەرامبەری ڕادەوەستا و تاوێک لێی دەڕوانی.
لەناکاو سەلیم بێدەنگیی نێوانمانی شکاند و وتی، 'دە ساڵێک پێش ئێستا، ئەو وێنەیەی ئەوم کێشا، چونکە زۆر بیرم دەکرد، خوشکە بچکۆلانەکەم، فاتمە، خوا بیبەخشێت، ئەوسا کە منداڵ بووین، بۆمان دابین نەدەکرا، بەردەوام بە ماڵەکەدا دەگەڕا و لەبەر خۆیەوە دەنگی لێوە دەهات و نووزە نووزی بوو، هەرگیز بە ئێمە سەرسام نەبوو، بەردەوام لەگەڵ خۆیدا دەدوا و لەبەر خۆیەوە گۆرانیی دەچڕی و پێدەکەنی.'
لەژێر لێوەوە، بێ ئەوەی ڕوو لە سەلیم بکەم وتم،
'ئەوەیش یەکێک بوو لە ڕەوشتەکانی دایکم.'
'چۆن؟
لەمەوە بێدەنگ بووین، بە سەرنجەوە لە پۆرترێتەکەم ڕوانی، ماڵی خۆمانی بەبیر هێنامەوە، ئەو ماڵەی لەگەڵ دایکمدا بەتەنیا تێیدا گەورە بووبووم، ماڵێک لە پێشانگەی وێنە دەچوو. ماڵێک، دیوارەکانی بە تابلۆکانی دایکم داپۆشرابوو، لەسەر دیوارەکان، ئەو جێگەیانەی تابلۆیان پێوە نەبوو، من بە دەباشیر یان بە قەڵەم ڕەنگم کردبوو، گەلێ جار دایکم تابلۆ یان سکێچی بە تەواونەکراوی بەجێ دەهێشت، پاشان دوای مانگێک، زۆر جار، پاش دوو ساڵێک دەگەڕایەوە سەریان و دیسان کاری تێدا دەکردنەوە. سەر تا خوار، دار و دیوار و هەموو کەرەستەی ناو ماڵەکەمان بە پریشکی ڕەنگ داپۆشرابوون، ژووری خەوتن و

حەمام و تەنانەت ئاودەستەکەیشمان بەر شەپۆلی ڕەنگ کەوتبوو، یان پڕ بوو لە کەرەستەی نیگارکێشان.

ئەو ڕۆژە، تا زیاتر لە پۆرتریتی سەر دیوارەکە ورد دەبوومەوە، زیاتر وێنەی دایکمم تێدا دەبینی، کەسێک کە هەرگیز وێنەیم لە پێشچاو ون نابێت، ئەو ئافرەتە لەشولاررێک و قژ ڕەش و لولە بێوێنەیە، ئەویش هەرگیز سەرسام نەبوو بە دونیای دەرەوەی خۆی، تەنها لە دونیای خۆیدا دەژیا و لەگەڵ خۆیدا دەدوا و لەبەر خۆیەوە پێدەکەنی، شەو و ڕۆژ بە ماڵەکەدا ڕاوڕاوێنی بوو، یاریی بە ڕەنگ دەکرد و گۆرانیی بۆ خۆی دەچڕی، هاوڕێی هەمیشەیی نەبوون، تاکوتەرا پیاوێک لە ژیانیدا پەیدا دەبوو، لەناکاویشدا لێی ون دەبوو.

هەموو ژیانی پارچەیەک بوو لە هونەرەکەی، وەکوو چۆن هەموو جارێک خۆی دەی وت، 'ڕەنگ بەری چاوی گرتووم، دەبێت بیانڕێژم بە کەنفاسێکدا، ئەگینا بەرپێی خۆم نابینم.'

لە کاتێکدا دایکم ئەمەی دەوت، من زۆرم لێ دەکرد تاوەکوو تاوێک پێکەوە بچینە دەرەوە، بۆ باخێک، بازاڕێک، سینەمایەک.

ئینجا کە زۆر مەست دەبوو، دەی وت، 'من هەڵەکانی سروشت ڕاست دەکەمەوە، تەمەنی بەهار درێژتر دەکەم، وەرزەکانی تر مرۆڤ بێزار دەکەن، من ڕەنگە ونبووەکان دەبینم، هێڵە شاراوەکان هەست پێ دەکەم، لە نەبوونەوە دەیانهێنمە دیوی بوون و سەرلەنوێ دەیانخولقێنمەوە.'

بەبیرم دێت، کاتێک من پازدە ساڵان بووم، دایکم پێشانگەیەکی لە یەکێک لە مۆزەخانەکانی ئەمستردام کردبووەوە، لەسەر تابلۆیەکی نووسیبووی، 'هەموو شتێک لە ژیانی مرۆڤدا بریتییە لە درۆ، تەنها

یەک شت نەبێت، ئەویش درۆ خۆیەتی.'

زۆربەی گۆڤار و ڕۆژنامەکان، ناویان لێ نابوو، 'ڕەشبین و شێت!'

دوایین جار کە دایکمم بینی نیگار بکێشێت، لەسەر کەنفاسێکی سێمەتری بوو، کە دوو مەترێکیش بەرز دەبوو، دەیان سەتڵی پڕ لە ڕەنگی لەپێش خۆی دانابوو، دەستی لە سەتڵەکان دەژەند و بە ڕووی کەنفاسەکەیدا دەهێنا، سەدان فۆرم و هێڵکاریی غەریبی تیادا بەدی دەکران، هەموو ڕەنگیان لێ دەچۆڕایەوە و تک تک دەکەوتنە سەر ئەرزەکە، لە تەماشاکردنیاندا، هەستت دەکرد هەموو ماسکن و لێت دەڕوانن و ڕووبەڕووت دێن، بێوچان شەرابی دەخواردەوە، ئەوەندە مەست بووبوو خۆی بە پێوە بۆ ڕانەدەگیرا.

کاتێک دایکم نیگاری دەکێشا، بێدەنگ دەچووە ناو قووڵایی خۆی و هەستەکانی لەسەر بیرۆکەکەی ڕادەگرت، چەندە مەست بووایە، هەردەم ئاگای لای من بوو، هەرگیز فەرامۆشی نەدەکردم.

# ١١
# ڕەنگ

ئـەو ڕۆژەم بـاش بـەبیر دێتـەوە، تەمـەنم پێنج سـاڵان بـوو، لـە کاتێکدا دایکم سەرقاڵی نیگارکێشان بوو، من بە ماڵەکەدا ڕاوڕاوێنم بـوو، سـەرەتاتکێم لەگـەڵ دایکمـدا دەکـرد، فرسـەتم لـێ هێنـا و بەسکەخشـکێ خـۆم گەیانـدە ژێـر ئـەو مێـزەی کەرەسـتەی نیگارکێشانەکەی لەسەر بوو، دایکم لەو دەمەدا لە بەردەمی ئەو مێزەدا ڕاوەستابوو، کە دەیان سەتڵی بۆیەی ڕەنگاوڕەنگی ئاکرێلی لەسـەر بـوون، بـە مەبەسـتی ئـەوەی لـە ئاوڕدانەوەیـدا بیترسـێنم، تاوێک بوو چاوەڕوانی بووم و خۆم لێ مـەڵاس دابوو، هەناسـەم لـە خۆم بڕیبوون، نەمدەزانی دایکم هـەمان مەبەستی هەیە و بە لاچاوێک چاودێریی کردبووم، لەناکاوێکدا وتی، 'ئەوەتا!'

لە عەزرەتاندا ڕاچڵەکیم و ڕاست هەستامە سەر پێ، لە ئەنجامدا هەموو سەتڵە بۆیەکان قڵپ بوونەوە بەسەر ئەرزی ژوورەکەدا.

لەتـاو ئـازاری سـەرم و ترسـی ئـەو ڕووداوە چـاوەڕوان نـەکراوە، چاوم پڕ بوون لە فرمێسک و دەستم کرد بە گریان، دایکم بەدەم

پێکەنینەوە سەیرێکی کردم و تاوێک لە ڕەنگە ڕژاوەکانی ڕوانی، شەپۆلیان گەیشتبووە ئەوسەری ژوورەکە. بە ترس و لەرزێکەوە لە دایکم ڕوانی، دەستی بۆ ڕاکێشام و وتی، 'دەستتم بدەرێ.'

دەستی گرتم و بەدوای خۆیدا ڕایکێشام، بە پێی پەتی بەناو بۆیە ڕژاوەکەدا چەند جارێک هاتین و چووین، دەستی کرد بە قاقای پێکەنین و خێرا خێرا بەبنی پێیەکانی شەپۆلی بە ڕەنگەکان دەدا. هێشتا چاوم پڕ بوو لە فرمێسک، دڵم خێرا لێی دەدا، دایکم تەماشایەکی کردم و وتی، 'ئازیزەکەم، خۆت دڵگران مەکە، با وا بڵێین، ئێمە ئێستا وەک دوو ئاژەڵین، بزن و کار، ئا، ئا، بێئاگاین لە یاساورێسای ژیان، چاک و خراپ، پاک و قێزەون، پاشان ئێمە، هەموو ڕووداوێک وەکوو گەمەیەک دەبینین.'

من هێشتا نووزە نووزم بوو و ژێر نەبووبوومەوە، کاتێ ئەو لەناو بۆیەکەدا لەسەر دەم پاڵ کەوت و دەستی کرد بە باڵەمەلە، داواشی لە من کرد مەلە بکەم، 'دەی ئازیز، وەرە.'

بە سەرسامییەوە لێم دەڕوانی، بە دەست و پەلی بۆیاوییەوە، بە پێکەنینەوە هەڵمەتی بۆ هێنام و لەباوەشی گرتم، دەستم کرد بە پێکەنین لەگەڵیدا و تاوێک لەناو بۆیە ئاکریلەکەدا تلاینەوە، بە چنگ بۆیەمان دەکرد بە سەرو گوێلاکی یەکتریدا. بەوەیشەوە نەوەستاین و بە ماڵەکەدا دەستمان کرد بە ڕاوڕواێن، ئاسەواری پێیەکانمان گەیشتنە هەموو جێگەیەکی ماڵەکە، ساڵانێک دوای ئەو ڕۆژەیش، ڕەنگی ئاکریل بە کاشی و پلیکانە و پێخەفی ژووری خەوتنەکانیشەوە دیار بوو.

ڕۆژی دوای ئەو ڕووداوە، یەکەم ڕۆژی چوونم بوو بۆ قوتابخانە، ساڵێک بوو لە خۆئامادەکردندا بووم، هەروەها بۆ یەکەمین جار لە

ژیانمدا، چوار کاتژمێر لە دایکم جیا بوومەوە، ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژە، لە خانەی یادەوەرییەکانمدا بە جۆرێک لە خەیاڵمدا تۆمارن، کە تاکوو لە ژیاندا مابم، ئاسان دەستم پێیان ڕادەگات و دەتوانم بیانگێڕمەوە.

پاش ئەوەی دایکم لە پۆلێکدا و لەناو زیاتر لە بیست قوتابیی تردا بەجێی هێشتم، مامۆستاکەمان گەنجێکی بالابەرزی زەردەڵە بوو، لەتەنیشت کچێکی قەڵەوی پرچ زەردەوە دانیشتبووم، خۆی لێ نزیک دەکردمەوە و شانی لە شانم دەخشاند، مامۆستاکەمان خۆی پێ ناساندین و داوای لە ئێمەیش کرد، یەک یەک و لە جێگەی خۆمانەوە هەستینە سەر پێ و ناوی خۆمان و دایک و باوک و خوشک و براکانمان بڵێین، لە ڕیزی ناوەڕاستدا دانیشتبووم، مامۆستاکەمان ئاماژەی کرد، لەوێوە دەست پێ بکەین، چوار یان پێنج هاوپۆلم پێش من خۆیان ناساند، کاتێک سەرەی من هات، هەستامە سەر پێ و زۆر بەخێرایی وتم، 'من مارتن سەلەمۆ، دایکم ئەیفا سەلەمۆ.'

خێرا دانیشتمەوە، هەموو بە سەرنجەوە لێیان ڕوانیم، مامۆستاکەم لە جێگەی خۆیەوە لێی پرسیم، 'مارتن، تۆ باوک و برا و خوشکت نییە؟'

سەیرێکی مامۆستاکەم کرد و پاشان چاوێکم بەسەر هاوپۆلەکانمدا گێڕا و لەبەر خۆمەوە، 'نەخێر.'

'نەخێر، نەخێر، نەخێر چی!'

'نەخێر مامۆستا.'

'ئاوا، فێر بە، بە دوو وشە وەلام بدەرەوە. بە ڕێزەوە!'

'بەڵی مامۆستا.'

لەپڕ زەنگ لێی دا، دەنگی ئەو زەنگەی بۆ یەکەم جارم بوو لە نزیکەوە گوێم لێی ببێت، پێشتر لە ماڵی خۆمانەوە، ڕۆژانە دووراو دوور گوێم لێی دەبوو، مامۆستاکەمان پێی وتین، 'هەموو بچنە گۆڕەپانی قوتابخانە و یاری بکەن، ئەگەر گوێتان لە دەنگی هەمان زەنگ بوو، خێرا بگەڕێنەوە پۆل و هەریەکە لە جێگەی خۆی دابنیشێت.'

زۆر لە قوتابییەکان بە پەلە پەل، پێش مامۆستاکەمان کەوتن و بە ڕاکردن بۆ گۆڕەپانی قوتابخانەکە چوون، دوای هەموو هاوپۆلەکانم گەیشتمە گۆڕەپانەکە، چاوێکم بە هەمووواندا گێڕا، لەو دەوروبەرە، لە نزیکی هاو پۆلەکانمەوە تاوێک هەڵوێستەم کرد و گوێم لێ گرتن، بەنیازی ئەوەی بەڵکوو یەکێکیان لێم بڕوانێ یان بانگم بکات بۆ یاریکردن، زوو بێهیوا بووم لێیان و چووم لە ناوەڕاستی گۆڕەپانەکەدا دەباشیرەکانم لە گیرفانی پانتۆڵەکەم دەرهێنان و لەسەر کاشیی گۆڕەپانەکە دەستم کرد بە نیگارکێشان.

قوتابییەکان هەموو بە چواردەورمدا ڕاوڕاوێنیان بوو، لە سەرەتاوە کەس سەرنجی نەدام، پاش ئەوەی نیگاری باخچەیەکی ئاژەڵانم کێشا و دەیان ئاژەڵم لەنێویدا وێنە کرد، نازانم چەندبوو لەسەر ئەژنۆم کەوتبووم و سەرم داخستبوو بەسەر کاشییە ڕەنگکراوەکاندا، چەندین قوتابی لە دەورم ڕاوەستابوون و لێیان دەڕوانیم، دوانیان بەدەم یاریکردن و قاقای پێکەنینەوە بەسەر نیگارەکەمدا بازبازێنیان دەکرد، بێ گوێدان پێیان، خێرا خێرا بە دەستی ڕاست و چەپم خەریکی هێڵکاری بووم، ویستم نیگاری ئەو باخی ئاژەڵانەی لە خەیاڵمدا بوو، لەسەر کاشییەکان بیکێشم،

لەو دەمەدا زەنگ لێی دا، خێرا چواردەورم چۆڵ بوو، ئینجا دوای قوتابییەکان کەوتم و گەڕامەوە بۆ پۆل و سەر جێگەکەی خۆم، وانەی دووەم، سەیرکردنی چەند کورتە فیلمێک بوو، هەموو دەربارەی یەکەم ڕۆژی قوتابخانە بوو، مامۆستاکەمان جارجار فیلمەکانی دەوەستاندن و لێدوانێکی لەبارەیانەوە دەدا.

لە پشووی دووەمدا، هەموو هاوپۆلەکانم چوونەوە بۆ گۆڕەپانی قوتابخانە، بەتەنیا لە پۆلەکەدا مامەوە، تاوێک بە پۆلەکەدا گەڕام و چەند دەباشیرێکم بە ڕووی تەختە ڕەشەکەدا هێنا، باش بەبیرم دێت، بیرۆکەی ئەوەم بۆ دەهات، ئەگەر لەسەر دیواری پۆلەکە ئاژەڵەکان بکێشم، لەوانەیە هاوپۆلەکانم و مامۆستاکەم زۆریان بەلاوە جوان بێت و ئەو دیوارە کاڵ و سپییانەیش ڕەنگێکیان دێتەوە بەبەردا.

هەموو دەباشیر و قەڵەم بۆیەکانم لە جانتاکەم دەرهێنان و دەستم کرد بە وێنەکێشانی چەندین ئاژەڵ، گەورە و بچووک، بۆ کێشانی گەورەکان، دەچوومە سەر مێزەکان، چەند باڵندەیەکیشم لەسەر شووشەی پەنجەرەکان کێشان، لەسەر مێزێک ڕاوەستابووم خەریکی کێشانی سەر و گوێی ورچێک بووم، کاتێک گوێم لە دەنگی هاوپۆلەکانم بوو، بە لێشاو خۆیان کرد بە ژووردا، یەکێک لە قوتابییەکان زریکاندی، 'تۆ بۆت نییە!'

بەدوای ئەودا هەموو بە کۆرس، 'بۆت نییە، تۆ بۆت نییە!'

بێ ئەوەی ئاوڕیان لێ بدەمەوە، بەدەم نیگارکێشانەوە لەبەر خۆمەوە، 'بەلاتانەوە جوانە؟'

دەنگێکی گڕ بە پەرۆشێکەوە پڕ بە پۆلەکە نەڕاندی، 'ئەوە خەریکی چیت؟ دابەزە، دابەزە خێرا.'

ئاوڕم دایەوە، مامۆستاکەم بینی، خەریک بوو دەگەیشتە بەردەم ئەو مێزەی منی لەسەر ڕاوەستابووم، بە هەردوو دەستی، هەڵی گرتم و لە ئەرزەکەدا دای نام و پێی وتم، 'بۆت نییە لەسەر دیواری قوتابخانە بنووسیت!'

قوتابییەکان هەموو دیسان بە کۆرس، 'بۆت نییە، بۆت نییە لەسەر دیوارەکان بنووسیت.'

مامۆستاکە بە تەوسێکەوە سەیرێکی کردم و پێی وتم، 'بەڵێ، هەرگیز بۆی نییە.'

شانی گرتم و بۆ لای تەختەڕەشەکە پێش خۆی دام، ڕای وەشاندم و بە تووڕەییەوە لێی ڕوانیم و پێی وتم، 'لێرە بوەستە، نەجووڵێی، ئێستا دێمەوە، دەچم بەدوای بەڕێوەبەردا.'

مامۆستاکە هێشتا لە پۆلەکە دەر نەچوو بوو، قوتابییەکان بە ژوورەکەدا پەرتەوازە بوون، هەریەکە بە جۆرێک خەریکی کڕان و سڕینەوەی وێنەکانم بوو. فریا نەکەوتن زەرەر بگەیەننە وێنەکان. هەر کە گوێیان لە دەنگی پێی مامۆستاکە بوو، خێرا هەریەکە بەهەڵەداوان لە جێگای خۆی دانیشتەوە، بەڕێوەبەری قوتابخانە لە شانی مامۆستاکەوە بوو، کابرایەکی تۆکمەی بچووکی قژن و سوورکاری لوت زل بوو، لە هاتنەژوورەوەیدا، پاش ئەوەی چاوێکی بە ژوورەکەدا گێڕا، سوور بووبووەوە و چاوی زەق دابچڕان، ڕووی تێ کردم و بە تووڕەییەوە، 'بۆت نییە، گوێ ڕووت، بۆت نییە!'

بە دوایدا مامۆستاکە و پاشان هاوپۆلەکانم دووبارەیان کردەوە، 'بۆی نییە، ئەو بۆی نییە.'

بەڕێوەبەر زیاتر لێم دەهاتە پێش و چاوی خەریک بوو دەر

دەپەڕی، بە توورەییەوە نەڕاندی، 'بۆت نییە لەسەر دیوارەکان بنووسیت، نیگار بکێشیت، ئەوەی تۆ کردووتە، جێگەی قبوڵ نییە، تۆ چۆن بۆت نییە لەسەر دیوارەکانیماڵەوەتان بنووسیت، ئاواش بۆت نییە لەسەر دیوارەکانی قوتابخانە بنووسیت و نیگار بکێشیت، تێگەیشتی لێم، هەرگیز بۆت نییە.'

لە چاوە زەقەکانی بەڕێوەبەرم ڕوانی و وتم، 'بەڵی، چۆن، لە ماڵەوە بۆم هەیە، بەڵام دیوارەکانی ماڵی ئێمە، جێگەی بەتاڵییان تێدا نەماوەتەوە، تەنانەت بۆ بەشی نیگاری مشکێکیش!'

دەستی لەپشتی هەڵپێکان و بە توورەییەوە وتی، 'ناچێت بە ئەقڵمدا، ڕاست ناکەیت، دەی گوێ ڕووت، جانتاکەت هەڵبگرە و پێشم بکەوە، پێویستە پەیوەندیی بە باوکت یان دایکتەوە بکەم، لەگەڵ تۆ سوودی نییە!'

پێشی خۆی دام و بردمی بۆ ژوورەکەی خۆی، لە دەرگاکەدا ڕاوەستا بووم، کاتێک لە دەفتەرێک دەگەڕا و وەکوو شتێکی بیر کەوتبێتەوە، ئاوڕێکی خێرای لێ دامەوە و لێی پرسیم، 'دەبێت دایک و باوکت لە ماڵ بن؟'

لەژێر لێوەوە و بە توورەییەوە وتم، 'نازانم.'

پاش تاوێک گەڕان بە دەفتەرەکەدا، دەستی دایە تەلەفۆنی سەر مێزەکە و زۆری پێ نەچوو، دەستی کرد بەلێدوان لەگەڵ دایکمدا، بەڕێوەبەر زۆر بەکورتی وتی، 'پێویستە هەر ئێستا بەڕێزت بگەیتە ئێرە و کوڕەکەت، مارتن، زەرەرێکی گەورەی لە قوتابخانەکەمان داوە.'

تەلەفۆنەکەی داخستەوە و بێدەنگ بە ژوورەکەدا، لە ڕاستەوە دەچوو بۆ چەپ. بەردەوام لێم دەڕوانی. پاش چەند خولەکێک،

دایکم بە شپرزەییەکەوە خۆی کرد بە ژووردا، لە ڕێوە بێ سڵاوکردن، ڕووی لە من کرد و لێی پرسیم، 'چی بووە ئازیز؟ چی ڕووی داوە؟'

پێ ڕانەگەیشتم وەڵامی دایکم بدەمەوە، بەڕێوەبەر خۆی هاویشتە نێوانمان و ڕووی لە دایکم کرد، 'ئەیفا سەلەمۆ، تۆ ئەیفا سەلەمۆی شێوەکاریت، وا نییە؟'

دایکم بە ساردییەکەوە، 'بەڵێ، خۆیەتی.'

بەڕێوەبەر ڕووی تێ کردم، 'دەی، کوڕی جوان، بڕۆ، تۆ بڕۆ و لە گۆڕەپانی قوتابخانە چاوەڕوانی دایکت بکە.'

سەیرێکی دایکمم کرد، چاوم لە چاوی بڕی، دەستێکی هێنا بە سەرمدا، 'بڕۆ، ئازیزەکەم، چاوەڕوانم بە، هەر ئێستا دێم بۆ لات.'

گۆڕەپانی قوتابخانەکە کەسی لێ نەبوو، هێڵکاریی باخی ئاژەڵەکانم شێوێندرابوو، بەڵام بە چواردەوریدا، دەیان وێنەی ئاژەڵی ڕەنگاوڕەنگی تر کێشرابوو، بێ وەستان دووبارە دەستم کرد بە کێشانەوەی باخەکە، یەک یەک ئاژەڵەکانم تۆخ کردنەوە. سەرم بەسەر هێڵکاریی ڕووی کاشییەکاندا دانەواندبوو، لەناکاو دایکم دەستێکی بە قژما هێنا، لەلامەوە ڕاوەستا، 'ئەمەیشیان زۆر جوانە، تەواو بووە؟ ئەگەر تەواو بوویت، لەگەڵم وەرە با بڕۆینەوە بۆماڵەوە.'

تاوێک بەدەوری کاشییە ڕەنگکراوەکاندا سووڕایەوە و بە سەرنجەوە لێی ڕوانی، پاشان لەبەر خۆیەوە وتی، 'ئەو نەزانانە تێناگەن لە مانای ڕەنگ، با بزانیت ئەزیزەکەم، تۆ هیچ کارێکت نەکردووە هەڵە بێت، من لە مەبەستی تۆ تێدەگەم، تۆ ویستووتە

پۆلەکە بڕازێنیتەوە و لە ژوورێکی گەورەکانەوە بیکەیت بە پۆلیکی پڕ لە ڕەنگ بۆ منداڵانی هاوتەمەنی خۆت، ئەوە قوتابخانە نییە، بەڵکوو فەقیرخانەیە، ئەو کاولەیە جێگەی تۆ نییە. دایکت لە سبەینێوە بەدوای قوتابخانەیەکی گونجاودا دەگەڕێت، ئەمستردام پڕە لە قوتابخانە. هەڵوێستەیەکی کرد و وتی، 'دەڵێم، پێشبڕکێیەک بکەین، تاوەکوو بەردەرگای ماڵەوە، بزانم کاممان خێراین لە ڕاکردندا.'

لە شانی یەکەوە ڕاوەستاین و من تا سێم بژارد و هەردووکمان بە ڕاکردن بەرەو ماڵەوە بووینەوە.

# ١٢

# سەلیم

سەرمای شەو، کەسیرەی کردبووین. کات، بەیانی زوو بوو، پێش ئەوەی خۆر ڕووناکیی خۆی بە ڕووی بیابانەکەدا بڕژێنێت، پۆلیسەکان وەکوو پیشەی ڕۆژانەیان، خۆیان بە ژوورەکەماندا کرد و چاوێکیان پێدا گێڕا، چەند جارێک سەرەداریان لەسەر سنگمان کوتا و بەجێیان هێشتین.

لەگەڵ سەلیم بە ژوورەکەدا دەستمان بە گەڕان کرد، بێ ئەوەی بەیانی باشم لێ بکات، تاوێک بوو بەبێدەنگی بە ژوورەکەدا دەگەڕاین. پاشان سەلیم لەبەر خۆیەوە دەستی کرد بە گێڕانەوەی بیرەوەرییەکانی:

'ئەوسا کە منداڵ بووم، هەموومان لە خانوویەکی گەورەدا دەژیاین، خانوویەکی گەورەی لە بەرد دروستکراو، تەمەنی ئەو خانووە دەگەڕایەوە بۆ سەردەمی باپیرە گەورەم، ئەو سەردەمەی عوسمانییەکان میسریان داگیر کردبوو و حوکمی وڵاتیان دەکرد،

ماڵەکەمان بە ماڵی ئاغا ناسرابوو. بە خوا بەهەشتێک بوو بۆ خۆی.

لە سەردەمی باپیرەمدا، دەیان گوند و هەزاران هێکتار زەوی موڵکی ئەو بوون، وەکوو دەیانگێڕایەوە، بە دەسەڵاتترین ئاغا بووە لە هەرێمی ئەسیوط، هەرچەندە باوکم جێگەی باوکی گرتبۆوە، بەڵام باوکم دەسەلات و موڵکێکی زۆری لەدەست دابوو، تەنها ئەو گوندەی خۆمان و زەویوزاری ئەو گوندەی بۆ مابوونەوە، گوندەکەیشمان ناوی تەل عومەر بوو، گوندەکە بە ناوی باوکمەوە ناو نرابوو. ماڵەکەمان دەکەوتە سەر سنووری تەل عومەر، لە ماڵەکەمانەوە بۆ ناو دێکە، نزیکەی کیلۆمەترێک دەبوو، هەر بیست ماڵیک دەبوو، دێی تەل عومەر، دە کێلۆمەترێک لە باشووری شاری ئەسیوط و لە خۆرهەلاتیەوە، ڕووباری نیل بوو، سێ سەد و پەنجا کیلۆمەترێکیش لە باشووری قاهیرەوەیە.

چەندین هێکتار بە چواردەوری ماڵەکەدا باخوباخات بوو، دار خورما و زەیتوون و دەیان داری میوەی تری بەردار، بە خوای گەورە مارتن بەهەشتێک بوو بۆ خۆی، پڕ لە میوە و ئاوی سازگار، سێ خزمەتکاریشمان هەبوو، بە خۆیان و تفەنگەکانیانەوە، شەو و ڕۆژ پاسەوانیی ماڵ و باخەکەیان دەکردین، جێگەی خەوتن و حەوانەوەیشیان لەپشتی ماڵەکەمانەوە بوو، دوو ژووری خۆیان هەبوو، پاسەوانەکان بۆیان نەبوو پێیان بنێنە ناو دەرگای ماڵی ئاغاوە، ئەو یاسایەیش، ئێمەی منداڵانی ماڵەکەی لێ ئاگادار بووین و بەردەوام چاودێریمان دەکردن.

باوکم سێ ژنی هەبوو، ژنی یەکەمی، کە ئامۆزای خۆی بوو، لە تەمەنی چواردە ساڵییەوە خێزانی بوو، لە هەمان کاتدا، جێگر و

دەمڕاستی باوکم بوو، حەوت کوڕی هەبوو، هەموو منداڵی ئەو ماڵە بە دایە گەورە بانگمان دەکرد، تەنانەت دایکم و ژنەکەی تری باوکیشم، هەر بە دایەگەورە بانگیان دەکرد.

ژنی دووەمی، یازدە کوڕی لەسەر یەک بووبوو، دایکم دوایین ژنی باوکم بوو، ناوی سەلما بوو، من و فاتمەی هەبوو، منداڵترین منداڵی خێزانەکە بووین، فاتمەی خوشکم، تاکە کچی باوکم بوو.

ماڵەکەمان، لە دەرگایەکی ئاسنی سەوزەوە لێوەی دەچوویتە ژووری بۆ ناو هۆڵێک، کە دە مەترێک پان و پازدە مەترێکیش درێژ دەبوو، بە چواردەوریدا چواردە دەرگای دەکەوتە سەر، بێجگە لە دەرگای ژوورەکەی باوکم و چێشتخانەکە، کە ڕەنگیان ڕەش بوو، هەموو دەرگاکانی تر، ڕەنگیان سوور بوو، لە سەرەتای هاتنەژوورەوەدا، بە دەستی ڕاستدا بە ژوورەکەی باوکم دەستی پێ دەکرد، ژوورێک، کە کەس لەو ماڵەدا بۆی نەبوو توخنی بکەوێت، تەنانەت دایە گەورەیش، لە شانیەوە ژووری دایە گەورە و پاشان ژووری ژنی دووەمی باوکم، بە گوێرەی تەمەنی ژیانیان لەو ماڵەدا بەدوای یەکدا دەهات، چونکە ژوورەکەی من و دایکم و فاتمە دوایین ژوور بوو، پاشان ژووری کوڕە هەرزەکارەکان بوو، ژوورەکانی تر، جگە لە باوکم، خوا ئاگادارە هیچ کەس لەو ماڵەدا نەیدەزانی بۆچی بەکار دەهێنرێن و چییان تێدایە، هەمیشە داخرابوون و کلیلەکانیان تەنها لای باوکم بوو، چێشتخانەکەمان لەگەڵ ئەوەدا زۆر گەورە بوو، دەرگای ژوورێکیشی دەکەوتە سەر، کە ژووری زەخیرەمان پێ دەوت، زۆر جاریش باوکم ژنەکان و فاتمەی تێدا بەند دەکرد.

ژووری هەرزەکارەکان، زۆر جار بە ژووری پیاوان ناومان

دەبرد، زۆری پێ چوو تا باوکم وەکوو پیاو بینیمی و بڕیاری دا بچمە ئەو ژوورەوە و لەگەڵ براکانمدا بخەوم. ژوورەکەی ئێمەیش، سێ مەترێک پانی و چوار مەترێکیش درێژییەکەی بوو، تەنها سندوقێکی تەختەی تێدا بوو، ئەو پێخەفانەی بۆ خەوتن بەکارمان دەهێنان، دایکم بەقەدکراوی لەسەر سندوقەکە هەڵی دەچنین، چەند ڕاخەرێکیش لە ئەرزەکەیدا ڕاخرابوو، هەرچیی جلوبەرگیشمان بوو، لە سندوقە تەختەکەدا قاییم کرابوو.

خوا ئاگادارە مارتن، تاوەکوو ئەمڕۆیش مەراقمە، بەردەوام بیر لەوە دەکەمەوە، ئاخۆ ئەو ژوورە داخراوانە چییان تێدا بووبێت، بەتایبەتی ژوورەکەی باوکم، کە ئێستایش خەونی پێوە دەبینم.

خۆشترین کات لە سەردەمی منداڵیمدا، کە هێشتا باش لەبیرمن و هەمیشە بیریان لێ دەکەمەوە، تایبەتمەندیی ئێوارانی ئەو ماڵە بوو، کە دایە گەورە خۆراکی دابەش دەکرد بەسەر هەمووانداו هەر خێزانە مەنجەڵ و قاپ و کەوچکی خۆی هەبوو، مەنجەڵەکانیش، ئەندازەیان بەگوێرەی گەورە و بچووکیی خێزانەکان دەگۆڕا، هەر خێزانە مەنجەڵی پڕ لە خۆراکی خۆی وەر دەگرت و لە ژووری خۆی نانی دەخوارد، باوکیشم هەر ئێوارەیە لەسەر سفرەی یەکێک لە ژنەکانی بوو، هەر ژنێک ئێواران مەنجەڵی دەسکداری وەر بگرتایە، بەمانای ئەوە بوو، کە خۆراکی تایبەتیی باوکمی تێدایە، یانی ئەو مەنجەڵە ڕووی لە هەر ژوورێک بکردایە، باوکم ئەو ئێوارەیە لەوێ بوو، ئەویش دایە گەورە بڕیاری لەسەر دەدا، خوا شایەتی حاڵە، هەر بیستویەک منداڵەکەی ئەو ماڵە، ئێواران بەڕیز لە بەردەم چێشتخانەکەدا ڕادەوەستاین و چاوەڕوان بووین، ئاخۆ مەنجەڵە دەسکدارەکە ڕوو لە چ ژوورێک دەکات، ئەو ئێوارەیە کێ

خێروبەرەکەت ڕووی تێ دەکات، مانای ئەوە بوو، ئەو ژەمە لەو ژوورەدا گۆشت دەخورێ و کوڕانیش بۆیان هەبوو لەگەڵ باوکیاندا نان بخۆن.

دەزانی چی مارتن، ئەو ئێوارانەی باوکم لە ژوورەکەی ئێمە دەبوو، لەلایەوە دادەنیشتم و پێکەوە لەسەر سینییەکی فافۆن نانمان دەخوارد، دایکم و فاتمەیش لەولاوە بە جیا، باش بەبیرم دێت، دایکم فاتمەی لەباوەش دەنا و توند بەخۆیەوە دەیگوشی، لە عەزرەت ئەوەی نەوەک بە ژوورەکەدا بگەڕێ و باوکم بێزار و تووڕە بکات، ئەوسا دایکم نانی نەدەخوارد و دەوەستا، تاوەکوو ئێمە تەواو دەبووین، کاتێک باوکم لە نانخواردن تەواو دەبوو، خێرا بەجێی دەهێشتین، ئینجا دایکم لەگەڵ فاتمە دەستیان دەکرد بە نانخواردن. هەر هەمان شەو، لە نیوەشەودا، لە کاتێکدا مانگەشەو ژوورەکەمانی نیوەڕووناک دەکردەوە، باوکم جارێکی تر سەردانی ژوورەکەی ئێمەی دەکردەوە، بۆنی باوکمم دەکرد و گوێم لە تەپەتەپی پێیەکانی دەبوو، بۆنی ئارەقی لەشیم دەکرد، خۆم لەژێر بەتانییەکەم توند دەکرد و هەناسەم لە خۆم دەبڕی، چاوم توند دەنوقاند، دەستم لەسەر گوێم دانابوو، هەرچەندە تەنها کاتیش بوو دایکم و باوکم پێکەوە ببینم، وەکوو تر، باوکم لە پێشچاوی ئێمەدا توخنی ژنەکانی نەدەکەوت.

ئێوارەیەک لەو ئێوارانەم باش لەبیر ماوە، باوکم لای ئێمە بوو، لەناکاو فاتمە خۆی لە دەستی دایکم ڕاپسکاند و خۆی گەیاندە سەر سینییەکەی ئێمە، وەکوو من لەلای باوکمەوە لێی دانیشت، لەپڕ باوکم خۆی ڕاپسکاند و ڕاست هەستایە سەر پێ، پەلی فاتمەی گرت و لە دووری دوو مەترێکەوە فڕێی دایە باوەشی

دایکم، دەستی کرد بە شەق تێهەڵدانی دایکم و فاتمە، بە خوای گەورە، باوکم ئەوەندە تووڕە و بێزار دیار بوو، غەزەب لێ دەباری، دایکیشم خۆی بەسەر فاتمەدا گرمۆڵە کردبوو، لەژێرەوە هەردووکیان دەیانزریکاند و بەکوڵ دەگریان، ئینجا باوکم سینیی خۆراکەکەی هەڵگرت و بۆ ژوورەکەی خۆی بردی، تاوەکوو ناو هۆڵەکە بەدوایدا چووم، ئاوڕی لێ نەدامەوە و دەرگای ژورەکەی توند بەدوای خۆیدا داخست، هێشتا من پاروویەکم خواردبوو، تاوێک بەرامبەری دایکم و فاتمە ڕاوەستام و خۆم لێ تووڕە کردن، بەرە و ڕوویان دەستم کرد بە شەق داهێنانەوە.

ئەگەر باش لەبیرم مابێت، دایکم سەری هەڵنەبڕی و لێی نەڕوانیم، بەکوڵ بەسەر فاتمەدا دەگریا، ئەوەی ئێستا لە خەیاڵمدا مابێت، با بزانم، ئا، پێم وتن، 'خەتای ئێوە بوو، باوکم ڕۆیشت.'

دەزانی، مارتن، ئەو ئێوارانەی باوکم لای ئێمە نانی دەخوارد، تەنها ساتێک بوو کە پێکەوە بین، بەس من و ئەو و کەسی تر نا، تەنها لەو ساتانەدا، ئەو پیاوە باوکی من بوو، وەکوو تر، خوا ئاگادارە نە سەیری دەکردم و نە دەیدواندم. ئەو ئێوارانەی لەگەڵ باوکمدا پێکەوە نانمان دەخوارد، هەموو جارێک باوکم لێی دەپرسیم، "کوڕم، بووی بە پیاو؟"

زووزوو خۆم قنج دەکردەوە، بێ ئەوەی بوێرم لێی بڕوانم، لە وەڵامدا دەم وت، "بەڵێ باوکی بەڕێزم."

بە خوا ئەوسا، جاری واش هەبوو، بە مانگ باوکم سەری بە ژوورەکەی ئێمەدا نەدەکرد، بەبیرم دێت، باوکم هەموو جارێک دەی وت، "من تەنها لەگەڵ پیاودا دەچمە سەر سفرە."

'ئەوسا پێم وا بوو دەبێت من هۆکاری ئەو نەهاتنەی باوکم

بـووبێتم، بـەردەوام براکـانم تانـەیان لـێ دەدام و دەیـان وت، "باوکمان دێتە ژوورێک، کە پیاوی تێدا بێت.""

پاش ئەوەی سەلیم ڕووبەڕووی دەرگاکە ڕاوەستابوو، تاوێک بوو بێدەنگی دای گرتبوو، لەوە دەچوو لە خەیاڵیدا بۆ بەسەرهاتێکی تر لە ڕابردوویدا بگەڕێت، لێم پرسی، 'ئەوسا تەمەنت چەند بوو؟'
'حەوت تا هەشت ساڵان بووم.'
'ئـەی، باوکـت چـۆن پیاوێـک بـوو؟ پەیوەنـدییت لەگـەڵی گەیشـت بەکوێ؟'
'بـاوکم پیـاوێکی باڵابـەرزی کەتـەی چوارشـانە بـوو، کاتێـک مـن لەدایـک بـووم ئـەو دەمێـک بـوو پـەنجا سـاڵی تێپەڕانـدبوو، جووتیارەکـانی گونـدی تـەل عومـەر، لـە بـەروبوومی سـاڵەکە، لـە سەدا بیست بۆ ئەوان و لە سەدا هەشتایشی بەر باوکم دەکەوت، هەرچەندە لە سەردەمانی باوک و باپیرەی باوکمدا جووتیارەکان مافیان زۆر لەوە کەمتر بوو، بەڵام ئەوە گرێبەستی نێوانیـان بـوو، هەڵبەتـە هـەردوو لا ڕازی بـوون پێـی، زەوییـەکان هـەموو مـوڵکی باوکم بوو، نەک هەر ئەوە، بگرە هەموو خانوو و زەویی دێکەیش، موڵکی ئێمە بوو.
پـێش جـەژنان و ڕۆژانـی جـەژنانی ماڵەکـەمانم بـاش لـەبیرە، لـە یەکێک لەو ڕۆژانەدا، باوکم و دایە گەورەم پێکەوە چووبوون بۆ شـار، تـا پێداویسـتی و جلوبـەرگ بکـڕن بـۆ هـەموان، بـە بۆنـەی هـاتنی جەژنـەوە، کـە ئەوسـا چەنـد ڕۆژێکی مـابوو، خـوای گـەورە ئاگادارە، لەگەڵ دەرچوونی ئەوان لە دەرگای باخەکەمان، ئەو ماڵە بوو بە مەیدانی جەنگ، دایکم و ژنی دووەمی باوکم، پڕ بە ماڵەکە

هاواریـان دەکرد و جنێویـان بـە یـەکتر دەدا، کوڕەکـانیش هـەموو بەرامبـەر ئێمـە ڕاوەسـتابوون و دانیـان لـێ جیـڕ دەکردینـەوە و چاوەڕوانی فـەرمانی دایکیـان بـوون، لەناکـاو یـەکێک لـە کوڕەکـان هـاواری کـرد، هێـرش بـەرن، پـەلاماریان بـدەن، ملیـان بشـکێنن، گازیان لێ بگرن، لە ئانوساتێکی کورتدا، هـەموو دەستمان کرد بە زۆرانبازی و ژنانیش دەستیان نایە قژی یەکتری، تـەنها کەسـێک کە بەشدار نەبوو لەو شەڕەدا، فاتمە بوو، بێ ئەوەی گوێ بـە ئێمـە بدات، لە ژوورەکەی خۆماندا یاریی بە دوو چڵەدار دەکرد، من ئەو ڕۆژە بـــەرەنگاری چەنـــد برایـــەکم بوومـــەوە، بـــەلام لـــە چەنـــد هەناسـەیەکدا بـەزیم، چونکـە ئـەوان نـەک هـەر بەتەمـەن لـە مـن گەورەتر بوون، بەڵکوو دوو هێندەیش بە لاشـە زلتر بـوون، خێرا بـە زەوییانـدا دام و چەنـدین شـەق و کۆڵەمسـتیان تـێ سـرەواندم، ناچـار پاشەکشـەم کـرد و بەسکەخشـکێ خـۆم گەیانـدەوە نـاو دەرگـای ژوورەکـەی خۆمـان، لـەوێوە دەمبینـی چـۆن دایکـم ژنـی دووەمی باوکمی لەژێر دەنا، بە قژ بـەو هۆڵـەدا ڕای دەکێشـا، پێـی سەرسـام بـووم، تـا ئـەو کاتـەیش نـەمزانیبوو دایکـم ئەوەنـدە ئافرەتێکی لێهاتوو و قارەمـان بـوو، بـاوەڕ بکـە مـارتن، هاوشـێوەی پیاو شەڕی دەکرد.

بە خوا دایکم ئەوسـا هـەر بەوەیشـەوە نەوەسـتا، ئینجـا یـەک یـەک پـەلاماری براکانمیشـی دا، خـوا ئاگـادارە، ئـەو پیـاوە زلانـە لـە بەردەمیدا ڕایان دەکرد و خۆیـان لە ژوورەکانیان قاییم دەکرد و دەرگایان لەسـەر خۆیان دادەخست، گۆڕەپانی شەڕی بـە هـەموان چـۆڵ کـرد، دایکیشـم بەسـەر دەرگـا داخراوەکانـدا دەگـەڕا و بـە نەعلـەکانی دەسـتی، پێیـدا دەکێشـان، ئـەوانیش لـەودیو دەرگـا

داخراوەکانــەوە بانگیــان لــێ دەکــرد، "ســەلما بەرەڵلایــە، ســەلما بێکەسـە، سـەلما بێڕەوشـتە." ئینجـا دایکم زیاتر شێتگیر و تووڕە دەبــوو، هــاواری لــێ دەکــردن، "ئەگــەر غیرەتتــان تێدایــە، وەرن ڕووبەڕوو وام پێ بڵێن."

ئەوانیش لەودیو دەرگـا داخراوەکانـەوە، بە کۆرس دەیانزریکاند، "سـەلما بەرەڵلایـە، سـەلما بەرەڵلایـە." لـە ئەنجامـدا دایکـم بـەدەم گریــان و جنێودانــەوە پاشەکشــەی دەکــرد و دەگەڕایــەوە بــۆ ژوورەکەی خۆمان، لەو کاتانـەدا من لە ئەرزەکـەدا، لەسـەر سنگ پـاڵ کـەوتبووم، بـەس تـەنها سـەرم بردبـووە دەر و لـە دوورەوە تەماشای ڕووداوەکانم دەکرد، ئینجا خۆم کشـاندە دواوە و دایکـم دەرگاکــەی تونــد داخســت، دوای نیــوەڕۆ، دایکــم لــە ســووچێکی ژوورەکـەدا بێوچـان دەگریـا و گرمۆڵـە ببـوو. دەمـەو ئێوارەی ئـەو ڕۆژە، خۆم دابوو بەسەر پەنجەرەی ژوورەکەماندا و لـە باخەکـەم دەڕوانــی، جــێگە شــەق و کوڵەمســتی براکــانم، هێشــتا ئازاریــان دەهات، بەئەستەم خۆم بە پێوە بۆ ڕاگیر دەکرا، لەپڕێکدا ماڵەکە تــەواو بێــدەنگ بــوو، لــەو بێدەنگییــە کوتــوپڕە ســەرم ســووڕ مــا، وەکــوو هــەموو لەناکــاو فــڕیبن و ماڵەکــەیان بەجــێ هێشــتبێت، تەنانـەت درەختـەکانیش جووڵـەیان لـە خۆیـان بڕیبـوو، ئـەو نەرمـە بایەیش، کە بەردەوام پڕ بە کۆشێک تـەپوتۆزی بیابانی دەکرد بـە ژوورەکەمانـدا، دەنگـی نـەما، چۆلەکـەکانی باخەکـە لەسـەر پـەلی دارەکــان وشــک هەڵنیشــتبوون و دەنووکیــان لێــک نــابوو، پاسـەوانەکان لـەناو دەرگـای هاتنـە ژوورەوەی باخەکـەدا، ڕاسـت بەرامبەری یەک ڕاوەستابوون، دارخورماکان بـەڕیز و لـە شێوەی سەربازدا، کە لە گۆڕەپانی مەشقدا بن، قیت ڕاوەستابوون، لەناکاو

دووراو دوور جێبەکەی باوکمم بینی، بە بەردەمی خزمەتکارەکاندا تێپەڕی و ڕووەو ماڵ دەهات، خێرا بانگم لە دایکم کرد و پێم وت، "باوکم هاتەوە، باوکم هاتەوە." دیار بوو لە ژوورەکانی تریشەوە هەمان دیمەنیان دیبوو، چونکە پەنجەرەکانی ئەوانیش، ڕووەو دەرگای باخەکەمان بوو، یانی ئەوانیش هەمان دیمەنیان لێوە دیار بوون، لەگەڵ دایکم کاتێک چووینە هۆڵەکە، هەموو لەوێ بوون و بە تووڕەییەوە لە چاوی یەکترمان دەڕوانی، کاتێک باوکم خۆی کرد بە ژووردا، زۆرمان لە خۆمان دەکرد تاوەکوو ئاسەواری بێزاری بە ڕوومانەوە دیار نەبێت، سارد و ناشیرین بەدەم یەکەوە پێدەکەنین و بە لالووتێکەوە لە شانی یەکەوە ڕاوەستابووین. لەگەڵ هاتنەژوورەوەی دایە گەورەدا، منداڵان هەموو لەدەوری کۆ بووینەوە، باوکیشم لەولاوە، لەسەر کورسییەکەی دانیشت و قاچی نایە سەر قاچی و خەریکی ئامادەکردنی نێرگەلەکەی بوو، چاوەڕوان بووین ئاخۆ چیمان بە دیاری بۆ کڕدراوە، لە ماڵی ئێمەدا ڕۆژێکی وا، ساڵی جارێک ڕووی دەدا. ئەو جارەیش ڕێکەوتی جەژنی قوربانی دەکرد، پاش وەرگرتنی دیارییەکە، دەبووایە بمان وتایە، "خوا بە خێری بنووسێت بۆ باوکی بەڕێزمان." پاشان یەک یەک دەچووین سێ جار دەستی باوکمان ماچ دەکرد و دیسان هەمان ڕستەمان دووبارە دەکردەوە. بێدەنگ، هەموو هەناسەمان لە خۆمان بڕیبوو، گەورە و بچووک، هەموو ملمان کووڕ کردبوو، لە بەرپێی خۆمانمان دەڕوانی، هەموو خۆمان بە تاوانبار دەزانی، هەموومان بەشدار بووین لەو شەڕەدا، دەمانزانی باوکم سزامان دەدات، خوا ئاگادارە، کەسی لێ دەر ناکات، بەڵام کەی، ئێستا، دوایی، نیوەی شەو. دەزانی چی، مارتن،

هەموو باشمان دەزانی هەرشتێک لەماڵەکەدا ڕووی بدایە، باوکمی لێ ئاگادار دەکرایەوە، ئەوەیش گران نەبوو بزانرێت کێ سیخوڕی بۆ باوکم دەکات، بە خوا هەموو سیخوڕیمان بەسەر یەکەوە دەکرد، باوکیشم لەبەرامبەر هەر سەرپێچییەک کە لە ماڵەکەدا ڕووی بدایە، هەرگیز لێبووردنی بەرامبەر بە تاوانبار نەبوو، سزای گرانی دەدا و بێبەشی دەکرد لە خۆراک و پاشان لە ژوورێکی تاریکدا بەند دەکرا، دوای وەرگرتنی دیارییەکان، هەموو بە ڕیز لە شانی یەکەوە ڕاوەستابووین، چاوەڕوانی دواقسەی باوکم بووین. ئەویش زووزوو قومی لە نێرگەلەکەی دەدا و دوکەڵەکەی تێکەڵ بە هەوای گەرم و خنکاوی هۆڵەکە دەکرد، تووڕەیی لە چاویەوە سەری کردبوو، لەو کاتەدا تەنها دەنگ کە دەبیسترا، دەنگی فاتمەی خوشکم بوو، لە ژوورەکەی خۆمانەوە دەنگی دەهات و لەبەر خۆیەوە گۆرانی دەچڕی، یان زۆر جار وەک شێت لەگەڵ خۆیدا قسەی دەکرد. باوکم زۆر جار فاتمەی سزا دەدا لەسەر ئەو نووزە نووز و گۆرانی وتنەی، فاتمە هەرگیز کۆڵی نەدەدا و بە کەس بێدەنگ نەدەکرا.

هەر وەکوو چۆن پێم وتیت، تاوێک بوو هەموو بێدەنگ بووبووین و چاوەڕوانی باوکمان دەکرد، ئەویش خێرا خێرا مژی قووڵی لە نێرگەلەکەی دەدا و بە تووڕەییەوە لێی دەڕوانین، هەموو ئارەق بە ڕووماندا دەچۆڕایە خوار. لەپڕێکدا باوکم ئەو بێدەنگییەی شکاند و نەڕاندی، "لەبەر خاتری خوا و ڕێزم بۆ جەژنی قوربانی پیرۆز، بە خوای گەورە و میهرەبان، ئەگەر پیاوبم، نایەڵم بەسەرتانەوە بچێت."

هەستایە سەر پێ و پاش ئەوەی دیسان بە تووڕەییەوە لە

هەمووانی ڕوانی، نەڕاندی بەسەرماندا، "من پیاوم، پیاو! دەی لە بەرچاوم ون بن، جانەوەرینە."
لە یەک ساتەوەختی کورتدا، هۆڵەکە چۆڵ بوو، هەر خێزانە و چووینەوە ژوورەکانی خۆمان و دەرگاکانمان لەسەر خۆمان داخست، دایکم، وەکوو ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێت، من و خوشکەکەمی لە شانی یەکەوە ڕاگرت و ئەو جلە نوێیانەی کە بۆمان کڕابوو، لەبەری کردین.'

لەمەوە بێدەنگی کەوتە نێوانمان، پاش تاوێک، سەلیم لەبەر خۆیەوە پرسیی، 'مارتن، خوشک و برات هەن؟'
'نەخێر.'
'تاقانەیت؟'
'بەڵێ، من تەنها منداڵی دایکمم.'
'دایکت؟'
'بەڵێ دایکم.'
'ئەی باوکت؟'
'باوکی چی!'
سەلیم هەستایە سەر پێ و بەرامبەرم ڕاوەستا، پاش ئەوەی تاوێک لێی ڕوانیم، دایە قاقای پێکەنین، زۆری پێ چوو، تاوەکوو هێواش بووەوە و توانیی بدوێت، بەدەم پێکەنینەوە وتی، 'تێناگەم!'
'باشتر کە تێناگەیت، بەڵام سەلیم، تۆ لەسەر باسەکەی خۆت بەردەوام بە و پێم بڵێ، باوکت ئەو ڕۆژە سزای دان؟'
سەلیم زووزوو دەکۆکی و قوڕگی خاوێن دەکردەوە، پاش ئەوەی بە ژوورەکەدا دەستی بە گەڕان کرد.

بەردەوام بوو، ئەوەی لەبیرم مابێت، هەر ئەو شەوە باوکم یەک یەک ژنەکانی دارکاری کرد، بە خوا قیژە و گریانیانماڵەکەی پڕ کردبوو، ڕۆژی دوایی، دایکمم بینی هەردوو بەرچاوی شینومۆر هەڵگەڕابوو، ئەو ڕۆژەی ڕێکەوتی یەکەم ڕۆژی جەژنی دەکرد، بەیانی زوو من و دایکم لە گریان و هاوار هاواری فاتمە بەخەبەر هاتینەوە، کە هەردووکمان بە جلە نوێکانمانەوە خەوتبووین، پڕ بە ژوورەکە هاواری دەکرد و هەردوو دەستی توند بە سکیەوە گرتبوو. دایکم بەهەڵەداوان باوەشی پێ دا کرد و دەستی کرد بە گریان بەسەریدا، زۆری پێ نەچوو، باوکم خۆی کرد بە ژووردا و پەلی من و فاتمەی گرت، بەدوای خۆیدا ڕایکێشاین بۆ چێشتخانەکە و لەوێوە هەردووکمانی فڕێ دایە ژووری زەخیرەکە و دەرگاکەی لەسەر داخستین، من بۆ جاری یەکەمم بوو، بچمە ئەو ژوورە، وا بزانم باوکم منی بینی، چاوم پڕ بوو لە فرمێسک، هەر بۆیە منی لەگەڵ فاتمەدا سزا دا.

ژووری زەخیرەکە، گڵۆپی تێدا نەبوو، ئەوسا دایە گەورەم هەموو جارێک بە چرایەکی دەستییەوە خۆی پێدا دەکرد و پێداویستی و کەرەستەی چێشتلێنانی لێ دەر دەهێنان، لەناو تاریکیی ئەو ژوورەدا، بە لوشکەلوشک لە شانی یەکەوە ڕاوەستابووین، فاتمە پێش من ژیر بووەوە، من هێشتا پاڵم دابوو بە دەرگا ئاسنەکەی ژوورەکەوە و تووڕە و دڵشکاو دەگریام، بێجگە لەوەی ئەو سەرلەبەیانیی جەژنەم لەکیس چووبوو، خەمی ئەوەیشم بوو، ئاخۆ چی بکەم دوایی و چۆن ڕووم بێت لە ڕووی براکانمدا سەر هەڵبڕم، دەبێت چەند گاڵتەم پێ بکەن؟ کە باوکم بە پیاوی نەزانیوم و لەگەڵ فاتمەدا سزای داوم. ئەوسا باوکم کە سزای کوڕەکانی

دەدا، دوای چینێــک لێــدانمان، هـــەرگیز لـــەو ژوورەدا بەنـــدی نـەدەکردین، بـەڵکوو دەری دەکردینـە دەرەوە بـۆ نـاو باخەکـەمان، ئەوسـا براکـانم دەیـان وت، "ژووری زەخیرەکـە پـڕە لـە جنۆکـە و خێو، ئەو پیاوەی بچێتە ئەو ژوورە، بەساغی نایەتـە دەرەوە، بـەڵام بـۆ ژنــان ئاسـاییە، چونکـە ئـەوان خۆیـان لـە ئەزەلـدا تـوخمی جنۆکەن."

لـەو کاتـەدا کـە بیرم لـەو قسانەی براکـانم دەکردەوە، هێندەی تـر تــرس دای گــرتم و هــەموو گیـانم وەکــوو شەقشــەقە دەلــەرزی، لــەناکاو دەســتێک تونــد دەســتی گــرتم، ڕاچڵــەکیم، فاتمــە بــوو، بەهێواشی پێی وتم، "مەترسە."

بە تووڕەییەوە خۆم لێ ڕاپسکاند و ویستم دەستم لـە دەستی دەر بهێنم، ئەوەندە توند دەستی لە دەستم هەڵپێکابوو، لێم نەدەبووەوە، چەند جارێک نەڕاندم بەسـەریدا و پێم وت، "دەستم بـەر بدە و وازم لێ بهێنە، هەمووی خەتای تۆیە من لێرەم."

زۆر تاریــک بــوو، چــاو چــاوی نــەدەبینی، تارمــایی جنۆکــە و خێوەکـانیش، لـە چواردەورمــان ورتــەورتیان بـوو، بــەو خــوای گەورەیـە، خۆم بـە گوێی خـۆم گوێم لێیـان بوو، براکـانم هـەموو ڕاسـتیان دەکـرد، لـە ترسـان خـۆم بێـدەنگ کـرد و چـاوم تونـد نووقانـد، بـەڵام تارماییـەکان لەپێش چاومـدا هـەر ون نـەدەبوون، فاتمـە دەسـتی ڕاکێشـام و بـەدوای خۆیدا بردمـی بۆ نـاو قووڵایی ژوورەکە، من هیچم نـەبینی و کوێرانـە دوای ئـەو کـەوتم، جارجار قـاچم لـە کەرەستەی نـاو ژوورەکـە هەڵدەکـەوت، دیـار بـوو فاتمـە ڕاهاتبوو بەو تاریکییە، باش بەبیرم دێت، کە لـە کۆتـایی ژوورەکـە، لەناو ئەو تاریکییەدا، بەگاگۆڵکێ و پاشان بە سکەخشکێ لـە نێوان

ئەو هەموو گوێنییانەوە بردمی، پاشان لە کونێکی بەرتەسکەوە، کە بەئەستەم پێوەی دەچووین، لەپێشدا وام دەزانی لێوەی دەچینە دەرەوە، بەڵام کاتێک بەدوای یەکدا کرم ئاسا خۆمان کرد بەو کونەدا، لەودیو دیوارەکەوە ژوورێک بوو، من و فاتمە بە پێوە بەئەستەم جێگەمان تێیدا دەبووەوە، لە نێوان بەردی دیوارەکانیەوە، رووناکی دەهاتە ژوورێ، فاتمە خۆی لێ نزیک کردمەوە و دیسان بەهێواشی پێی وتم، "مەترسە، هیچ مەترسە."
لە سووچێکی ژوورەکەدا، دوو پارچە دار ڕاستوچەپ بەیەکەوە بەسترابوون و پارچەیەک گوێنیی بەبەردا کرابوو، لە داهۆڵی ناو کێڵگەی جووتیارەکان دەچوو، لەو دەمەدا، فاتمە دەستی دایە و وتی، "ئەوەیش بووکەکەمە، ناوی عومەرە."
ناوی باوکمی لێ نابوو، لەوێوە باش گوێمان لە پیاوەکانی باوکم بوو، لەگەڵ یەکتری دەدوان، کزکز دەنگی مۆسیقاش دەهات، بۆ یەکەم جارم بوو گوێم لە دەنگی مۆسیقا بێت، چونکە لەماڵەکەی ئێمەدا، تەنانەت ڕادیۆشمان نەبوو، براکانم دەیان وت، "باوکم لە ژوورەکەی خۆی نەک ڕادیۆ، بەڵکوو تەلەڤزیۆنیشی هەیە."
بەڵام کەسمان دڵنیا نەبووین، کە ئایا ڕاستە یان درۆ. باوەڕ بکە مارتن، بە خوای گەورە، نەک تەنها بۆ جاری یەکەمم بوو ئەو ڕۆژە گوێم لە دەنگی مۆسیقا بێت، بەڵکوو بۆ جاری یەکەمیشم بوو، گوێم لە فاتمە بێت بەئاسایی بدوێت و قسەم لەگەڵدا بکات، بەس دایکم لە فاتمە تێدەگەیشت. فاتمە تەنها لەبەر خۆیەوە، وەکوو شێت دەدوا و بەردەوام گۆرانی دەگوت، هەر زوو براکانم ڕێنماییان کردم، کە ئەگەر بمەوێت ببم بە پیاو، پێویستە لە ژنان دوور بکەومەوە، نە بیاندوێنم و نە هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکەم،

کاتێـک پیاوەکـانی بـاوکم بێـدەنگ بووبـوون، ئەوسـا دەنگـی ڕادیۆکەیانمان باشتر دەبیست، ئەو ڕۆژەیش بۆ یەکەم جارم بوو گوێم لە دەنگی ئوم کەلسوم بێت، ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام فاتمە بوو، کە هەموو گۆرانییەکەی لەگەڵدا دەگوتەوە، ئەو دەنگە ناسک و منداڵانەی خوشکەکەم، تێکەڵ بەو دەنگە بەسۆزەی ئوم کەلسوم دەبوو، ئێستایش دەنگیان لەناو گوێمدا دەزرینگێتەوە، بە خوای گەورە، وەکوو ئەوەی بە دەنگیان مەستیان کردبم، نازانم کەی و چەندێک لەوێدا خەوم لێ کەوتبوو. فاتمە ئەو ڕۆژە بۆ یەکـەمین و دواجاریشـی بـوو، بمـدوێنێ و تەنانـەت گـوێم لـە دەنگیشی بێت.'

لە کاتێکدا سەلیم پشتی تێ کربووم، تاوێک بوو بێدەنگی دای گرتبوو، ئینجا هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و هەردوو دەستی بڵند کرد و بە زەلیلییەکەوە لەبن لێوەوە چپاندی، 'خوایە بمبەخشە، خوای گەورە لێم خۆش ببە و بە گەورەیی خۆت بمبەخشە.'

خۆم پێ ڕانەگیرا و هەستام لێی نزیک بوومەوە و لە شانیەوە ڕاوەستام، لێم پرسی، 'بۆچی دوایین جار بوو گوێت لە دەنگی بێت؟ ئەی پاشان؟'

'ئەوە دوایی بۆت باس دەکەم، پەلەت نەبێت.'

'هیچ پەلەم نییە، خۆ ناتوانم لەدەستت هەڵبێم!'

'لە خودا بەزیاد بێت، خوای گەورە تۆی بە خەڵات بۆ من ناردووە.'

بە پێکەنینێکەوە لێم ڕوانی، 'کەواتە تۆ و خواکەی تۆ هۆکارن، کە من لێرەم؟'

بە سووچێکی دەمی، نیوەزەردەیەکی کرد و وتی، 'بەڵێ، بەڵێ، وایە ئەی بەراز.'
لە چاوی یەکترمان ڕوانی و هەردوو دامانە قاقای پێکەنین، بەدەم پێکەنینەوە، سەلیم وتی، 'گوێم لێ بگرە، با ئەوەیشت بۆ باس بکەم، کە چۆن لە چوار ساڵیمەوە چوومە بەر خوێندن.'

سەلیم بەرامبەرم هەڵوێستەیەکی کرد و لەبەر خۆیەوە وتی:
'دەزانیت مارتن، ئەو ڕۆژانەم باش لەبیرە، کاتێ چوار ساڵان بووم، بۆ یەکەمین جار لەگەڵ براکانم چووم بۆ مزگەوتی دێی تەل عومەر بۆ وانەی قورئان خوێندن. ئەو ڕۆژە بۆم نەبوو دەست بدەم لە کتێبی قورئانی پیرۆزەوە، مامۆستاکەمان بەدرێژایی ئەو ڕۆژە ڕێنمایی کردین، کە چۆن دەستنوێژ بگرین و خۆمان خاوێن ڕابگرین و بەرەوانی نوێژەکانمان بکەین. من ئەو ڕۆژە بێدەنگ لە ڕیزدا دانیشتبووم و گوێم لە مامۆستاکەمان گرتبوو، بەڵام ڕۆژانی دوایی، کاتێک دەستمان کرد بە خوێندنەوە و نووسین، پاش مانگێک و دووان و سیان، ساڵێک تێپەڕی و من هەر فێری خوێندنەوە و نووسین نەبووم. زۆر جاران مامۆستاکەم لەگەڵم بەشەڕ دەهات، لەماڵەوەیش لەلایەن باوکمەوە فەللاقە دەکرام و زۆر جاریش بێبەش دەبووم لە نانی ئێوارە، براکانیشم خێرا ناتۆرەی سەلیمی تەمەڵیان بەسەردا بڕیم.
ئەوسا باوکم هەموو جارێک پێی دەوتم، "شەرم دەکەم کوڕی وەکوو تۆم هەیە."
ئیتر خۆیشم سەرزەنشتی خۆمم دەکرد، باوەڕم وا بوو منداڵێکی تەمەڵم و ناتوانم فێری نووسین و قورئان خوێندنەوە ببم، هەتا

ئەو ساڵانەی لە قاهیرە دەژیام، بۆم دەر کەوت چاوم زۆر کزن، بەڵام ئەوکات پێم وا بوو هەمووان وا دەبینن و ئەو دونیایە لە پێشچاوی هەموو مرۆڤایەتیدا، هەر وا تەڵخ و دێز دەنوێنێ، لە خوێندنیش پیتەکانم بۆ لەیەک جیا نەدەکرانەوە و هەموو تێکەڵ دەبوون بەسەر یەکتریدا، لە ترسا دەمم تەتەڵەی دەکرد و بە هەڵە پیتەکانم دەخوێندەوە.'

'ئەی کە ئەوەندە ئاستی بینینت لاواز بوو، کەسێک نەبوو دەرک بەو کێشەیەت بکات؟'

'نەخێر، هەر زوو بە تەمەڵ و بێمێشک لە قەڵەمیان دام و ساڵانێکی دوورودرێژ، هەموو ڕۆژێک لەسەری سزا دەدرام.'

'ئەی چۆن فێری خوێندنەوە و نووسین بوویت؟'

'ئەوسا لە مزگەوت، بە هەموومان قورئانێکمان لە پێش بوو، هەرگیز من بۆم نەبوو دەست لە قورئانەکە بدەم و نزیکی بکەومەوە، ئەوەی لەو ساڵانەدا فێری بووم، نوێژکردن بوو، لەگەڵ چەندین ئایەتی قورئان، لەدوای مامۆستاکەمانەوە ئەوەندەمان دەوتنەوە، تاوەکوو لەبەرمان دەکرد، ئەوەی ڕاستی بێت، مارتن، لە لەبەرکردندا لە هەموویان زیرەکتر بووم.

پرسیت چۆن زانیم چاوم کزن؟ ئەوە زۆر دواتر، وا بزانم تەمەنم بیست ساڵ بوو، کاتێک لە قاهیرە بووم، لەگەڵ کوڕێکی خەڵکی ئەسکەندەریە پێکەوە ژوورێکمان بە کرێ گرتبوو، کوڕێکی قبتی، ناوی ئادەم فوئاد بوو، ئەو کوڕە شەو و ڕۆژ خەریکی خوێندنەوە بوو، داوای لێ کردم، کە کتێب بخوێنمەوە، کاتێک پێم وت، نازانم بنووسم و بخوێنمەوە، سەیر بوو بەلایەوە، ئینجا ئادەم کاغەز و قەڵەمی هێنا و بەبیانووی ئەوەی هەر هیچ نەبێت فێرم بکات چۆن

ناوی خۆم بنووسم، کاتێک ناوی نووسیم لەسەر کاغەزەکە ئەوەندە لێی چوومە پێش، لووتم خستبووە سەر کاغەزەکە، ئادەم پێی وتم، "تۆ چاوەکانت کزن؟" ئینجا ئەم چاویلکەیەی بۆ هێنام، کە لەو ڕۆژەوە، تا ئەمڕۆ، لەچاومدایە، ئادەم لە باوکیەوە ئەم چاویلکەیەی بۆ جێ مابوو. کاتێک چاویلکەکەی دامێ و لەچاوم کرد، بە خوا مارتن، نازانم چۆنت بۆ باس بکەم، ئەو ڕۆژە خۆشترین ڕۆژ بوو لە ژیانمدا، باوەڕ بکە، لە سەرەتاوە تووشی سام و دڵگوشین بووم و بێدەنگ لە ئادەم و ناو ژوورەکەم دەڕوانی، پاش ئەوەی لەسەر کاغەزەکە سەیرێکی ناوەکەی خۆمم کرد، هەستام و بە ڕاکردن چووم بۆ بەردەمی پەنجەرەی ژوورەکە، ئەوسا من و ئادەم لە باڵاخانەیەک بووین لە زەمالیک لەسەر ڕووباری نیل، بۆ یەکەمین جارم بوو بەڕوونی ڕووباری نیلم بینی، خانوو و باڵاخانەکانی شاری قاهیرەم لە دوورەوە بۆ لێک جیا دەکرانەوە، بە خوای گەورە، نازانم چەندێک بوو لەپشتی پەنجەرەکەوە ڕاوەستابووم و لە شاری قاهیرەم دەڕوانی.

ئەوسا کە بەیەکجاری لەماڵەوە ڕۆیشتبووم و بڕیارم دابوو نەگەڕێمەوە. بەڵام لەدوای ئەو ڕۆژەوە کە ئەم عەینەکەم دەست کەوت، زۆر غەریبیی ماڵەوەمان و ئەو دونیا کۆنە تەڵخەم دەکرد، کە بەجێم هێشتبوو، حەزم دەکرد باوکم و دایکم و براکانم جارێکی تر ببینمەوە. مارتن، بەڵام بۆ زانیاریت، ساڵ زیاترم پێ چوو، تاوەکوو بە ڕەنگ و ڕواڵەتی ئەم دونیا نوێیەم ڕاهاتم، هەرچەندە ئێستایش غەریبیی وێنەی ئەو دونیا تەڵخەی ئەوسام دەکەم، لەدوای ئەو ڕۆژەوە، ئادەم بە دوو ساڵ فێری خوێندنەوە و نووسینی کردم.'

'پاش بیست ساڵ، ئەوجا فێری خوێندنەوە و نووسین بوویت؟'
'بەڵێ، ئەویش بە هێزی ئەم چاویلکە ئەفسوناویەی باوکی ئادەم.'
لەو دەمەدا، لەسەر قەراغی جێگەکەم دانیشتبووم، سەلیم هات لەتەنیشتمەوە دانیشت، چاویلکەکەی لە چاوی داگرت و خستیە سەر ڕانم و پێی وتم، 'فەرموو تۆیش تاقیی بکەرەوە.'

چاویلکەیەکی کۆنەی ڕەنگ ڕەشی قورس، لە چەند لایەکەوە شکابوو، دیسان بە لەزگە و چەسپ چاک کرابووەوە، سەلیم لێم هاتە پێش و لەژێر لێوەوە وتی، 'مارتن، دەی، چاویلکەکەم لەچاو بکە و تاوێک لەم دونیایەی من بڕوانە، بزانە چەند جیاواز دەیبینیت.'
چاویلکەکەم هەڵگرت و کردمە چاوم، بێجگە لە تارماییەکی لێڵ، هیچی ترم نەدەبینی، سەلیم بێ ئارام لێی پرسیم، 'ئێ، ئێ، بەلاتەوە چۆنە، چۆن دەبینیت؟'
'یەک پارچە بیابان، لێڵ، بگرە هیچ نابینم.'
'بەڕاست، پێم بڵێ، چۆن دەبینیت؟'
'سەلیم، ئەو چاویلکەیە زۆر بەهێزە بۆ چاوی من، لەوانەیە بۆ تۆ بشێت، بەڵام بۆ چاوی من دەست نادات.'
بە تووڕەییەوە سەیرێکی کردم و وتی، 'قسەی بێمانا دەکەیت. بێنە، بێنە چاویلکەکەم، هەی بەراز.'
بە پێکەنینەوە سەیرێکم کرد و پێم وت، 'بەداخەوە، ئەو چاویلکە ئەفسوناویەی تۆ، بۆ چاوی من ناشێت.'
چاویلکەکەم بۆ ڕاگرت و وتم، 'فەرموو، ئەوە چاویلکە ئەفسوناوییەکەت.'

سەلیم وشک بەرامبەرم ڕاوەستابوو، چاوی توند نووقاندبوو، وەکوو بیەوێت بیر لە شتێک بکاتەوە، ماتەمینی بە ڕوویەوە دیار بوو، ئینجا بێدەنگی دای گرت و ئەو ڕۆژە هیچی تری نە وت.

## ١٣

# تۆفان

له خەو ڕابووم، دەموچاوم له سەرمادا تەزیبوون، بەنیوه ناچڵی خەونێکم بیر دەهاتەوه. له بەئاگا هاتنەوەمدا، چەندین پارچەی دیمەنەکانی خەونێکم لێ ون بووبوو، تەنها شت کە بیرم دەکەوتەوه، ئەوەبوو کە له خەونمدا دەنگی دایکمم گوێ لێ بوو، 'مارتن، مارتن، خۆت کۆ بکەرەوه، دەڕۆین.'
تەنها ئەمەی پێ وتم، یان هەرئەوەندەم لەو خەونەم بیر دێتەوه، تاوێک لەسەر پشت لێی ڕاکشابووم و جار جار چاوم لێک دەنا و له خەیاڵمدا له پارچەکانی تری ئەو خەونەم دەگەڕام.
له دەنگی دەرگای ژووری زیندانەکەم ڕاچڵەکیم، وەکوو نەمەوێت دەسبەرداری ئەو گەڕانەم ببم، جووڵەم له خۆم بڕی و بێدەنگ چاوەڕوان بووم، هێشتا شەو بوو و سپێدەی نەدابوو، چاوم له تەپڵەی پۆلیسەکان بوو، کاتێک خۆیان کرد بە ژووردا، گوێم لێیان بوو لەگەڵ سەلیمدا کەوتنە گفتوگۆ، چاوەڕوانی ئەوه بووم، ئاخۆ کەی هێرش دەکەنە سەرم و دارکاریم دەکەن، لەسەر ئەوەی له

کاتی هاتنەژوورەوەیاندا، من هێشتا لەناو جێگەکەمدا بووم.
پۆلیسەکان، ئەو ڕۆژە تەنانەت بانگیشیان لێ نەکردم، دەرگایان بەدوای خۆیاندا داخست و ڕۆیشتن، بە سەرسووڕمانێکەوە ڕاست بوومەوە، لەسەر جێگەکەم دانیشتم، بینیم سەلیم، بە پێوە بێدەنگ ڕاوەستابوو، هێشتا لە دەرگای زیندانەکەی دەڕوانی، بانگم لێ کرد، 'سەلیم، هیچ شتێکی نوێ لەئارادایە؟'
سەلیم هیچ وەڵامێکی نەدامەوە، دیار بوو ئەوەندە چووبووە ناو قووڵایی خەیاڵیەوە، ئاگای لای من نەمابوو، لەسەر جێگەکەم دابەزیمە خوار و بینیم، چەندین قاپی پلاستیکیی سپی، کە لە فۆرمدا جیاواز بوون لە یەکتر، پڕ لە خۆراک لەسەر ئەرزەکە دانرابوو، دیسان بە سەرسووڕمانێکەوە بانگم لە سەلیم کردەوە، 'ئەوە چییە، چی ڕووی داوە؟'
سەلیم بە ساردییەکەوە ئاوڕی لێ دامەوە و وتی، 'ئەمڕۆ بیستوسێی مانگی حەوتە، ڕۆژی یادکردنەوەی شۆڕشەکەی ساڵی ١٩٥٢ە، یانی ڕۆژی سەربەخۆیی گەلی میسرە.'
'ناوی ئەو ڕۆژەم بیستووە، بەڵام نەمدەزانی ڕێکەوتی ئەمڕۆ دەکات.'
'زیاتر لە ٣٦٠ ڕۆژ لە ساڵێکدا، وەکوو جانەوەر کردەوەمان لەگەڵدا دەکەن، بەڵام بە یەک ڕۆژ لە ساڵێکدا، کە ڕۆژی هاتنەسەردەستەڵاتی خۆیانە، بە یادکردنەوەی ئەو ڕۆژە دوورە، دەیانەوێت ئێستای خۆیان پیرۆز ڕابگرن و بە ناو دڵمان خۆش بکەن، بە خوای گەورە شتێک نییە لە میسردا ناوی سەربەستی بێت، نەک بۆ من، کە زیاتر لە سی ساڵە بەندیان کردووم، بەڵکوو بۆ هەموو ئەو کەسانەیش، کە ئێستا لە جێگەی ئەوسای من، لە

کوچە و کۆڵانەکانی قاهیرەدا دەیگوزەرێنن، تەمەنا دەکەم خوای گەورە تۆڵەی ئێمەیان لێ بکاتەوە و ڕیسوایان بکات.'

بە سەرسوورمانێکەوە لێم ڕوانی و لێم پرسی، 'ئێ، ئەی ئێستا چی بکەین؟'

لەژێر لچ و لێویەوە زەردەخەنەیەکی بۆ کرم، 'نان دەخۆین، چی دەکەین، هەڵبەتە من و تۆ چیمان لە دەسەڵاتدایە.'

دوای ئەوەی هەردووکمان چەند جارێک بەدەوری قاپەکاندا سووڕاینەوە، لەسەر ئەرزەکە بەرامبەر یەکتر دانیشتین، سەلیم پرسیی، 'دەڵێم مارتن، تۆ شوکری خوا دەکەیت؟'

'کام خوا؟ ئەو خوایەی تۆ بەردەوام ناوی دێنیت؟'

'ئەی بەراز، خوا هەر خوایە، بۆ تۆ خوایەکی ترت هەیە باوەڕت پێی هەبێت، جگە لەو خوایەی من؟'

'خوا لای من تەنها وشەیەکە و ئەو وشەیەیش ئەبستراکتە.'

'شتی وا چۆن دەبێت.'

'بۆ نا.'

'لێت تێناگەم.'

'ئەو خوایەی تۆ ناوی دێنیت و باوەڕت پێیەتی، من نە پێشتر ناویم بیستووە و نە بە خزمەتیشی گەیشتووم، بەڵام خوایەکی قەشەنگی خۆم هەیە، کە بە هەموو تەمەنم بۆی ژیاوم و هەمیشە لە دڵمدا ئامادەیە.'

'مەبەستت لە ئافرەتە؟'

'بەڵێ، مەبەستم لە ئافرەتێکە.'

'خوای گەورە تۆبە، جا کەی ئافرەت شایانی ئەوەیە مرۆڤ وەکوو خوای خۆی هەژماری بکات، هەی مرۆڤی نەزان؟'

'ئەوە بۆچوونی منە.'

' ئەو ئافرەتە کێیە، تۆ دەیپەرستیت؟'

'دایکم.'

لەمەوە سەلیم سەری داخست و بێدەنگی کەوتە نێوانمان.

خۆراکەکەمان، برنج و مریشکێک بوو، کە لەناو پەتاتە و پیازدا کولاندبوویان، ئەوە بۆ ساڵێک دەچوو، بۆ یەکەمین جارم بوو خۆراکی وا بخۆم، بێدەنگ، سرتەمان لە خۆمان بڕیبوو، سەرسام، لە خەیاڵی خۆماندا نغرۆ بووبووین، خێرا خێرا چنگمان پڕ دەکرد و لە دەممان دەئاخنی. دوای ئەوەی دوادەنکە برنجمان لەناو قاپەکاندا ڕاو کردن و ڕووی قاپەکانمان لێسانەوە، سەلیم لەبەر خۆیەوە وتی، 'ئەم ڕۆژە، هەمیشە ڕۆژی ژن هێنانەکەی باوکمم بیر دەهێنێتەوە.'

بێدەنگ لێم ڕوانی و سەرم بۆ لەقاند، ئەو بەردەوام بوو، 'ئەو ڕۆژەی باوکم چوارەمین و دواهەمین ژنی خۆی تێدا هێنا و ئاهەنگمان بۆ گێڕا، ڕێکەوتی ئەم ڕۆژەی دەکرد، سێ ژنەکەی تریشی، هەر لەم ڕێکەوتەدا گوێزابوونەوە و ئاهەنگی بۆ گێڕابوون، ئەوسا تەمەنم شازدە ساڵێک دەبوو، ئەو ڕۆژە، بەیانی زوو، هێشتا خۆر نەکەوتبوو، لەگەڵ چوار برام بۆ شاری ئەسیوط بۆ کڕینی پێداویستی بەڕێ کەوتین، ئەوە بۆ جاری یەکەمم بوو لە دێکەی خۆمان دەر بچم و جێگە و شاری تر ببینم، بەڵام ئەو چوار برایەم، چەند جارێکی تر سەردانی شاری ئەسیوطیان کردبوو، ئەوەندە لە چواردەوری خۆمم دەڕوانی، چەند جارێک وەختەبوو ببم بەژێر ئوتومبێلەوە. یەکێک لە براکانم ناچار بوو قۆڵی لە قۆڵم بکات و لەگەڵ خۆیدا بمگێڕێ. لە گەڕانەوەماندا، لە

دەرگای باخەکەمانەوە بۆن و بەرامی بەھارات و گۆشتی کوڵاوم دەکرد، پاسەوانی بەردەرگاکەمان پێی وتین، "کوڕینە، فریا بکەون، ئاهەنگ و خۆشییە، خێرا بکەن، ئەگینا بەشتان نامێنێ."
'دەنگی دەهۆڵ و زوورنا دەهات، کاتێک گەیشتینە بەردەمی ماڵ، هەموو بە هەڵەداوان و بە ڕاکردن خۆمان کرد بە ژووردا، ژنان هەموو خۆیان گۆڕیبوو و لەو دەوروبەرە دەهاتن و دەچوون، براکانی ترم، هەموو لەمبەر و ئەوبەری هۆڵەکە ڕووخۆش و دەم بە پێکەنین ڕاوەستابوون و تاکوتەرا لەگەڵ یەک دەدوان، لە کۆتایی هۆڵەکە، باوکم لەسەر کورسییەکەی دانیشتبوو، سەرتاپا جلی سپیی پۆشیبوو، سەر و سمێڵی لێ ڕەش کردبووەوە و لە دوورەوە دەبریقایەوە، لە دەستە چەپیەوە، ئافرەتێکی سوور پۆش دانیشتبوو، لە شانی ئافرەتە سوور پۆشەکەوە، ئافرەتێکی لەچک بەسەر بوو، بێوچان لە هەموومانی دەڕوانی، لەچکەکەی ئەوەندە توند لەژێر چەناگەیدا گرێ دابوو، دەموچاوی سوور هەڵگەڕابوو، ئاوساو دەهاتە پێشچاو، چاوی زەق و گەورە دەر پەڕیبوو، باوکم بەردەوام مژی لە نێرگەلەکەی دەدا و دووکەڵەکەی دەکرد بەناو جەنجاڵیی ماڵەکەدا، لەو کاتەدا دایەگەورە هاتە بەردەممان و بە ڕوویەکی خۆشەوە پێی وتین، "هاتنەوە، کوڕەکانم، بەخێر بێنەوە، بڕۆن، بڕۆن دەی، پیرۆزبایی لە باوکتان بکەن، دەی خێرا بکەن."
بەگوێرەی تەمەنمان و بە ڕیز، بەناو ئەو جەنجاڵییەدا خۆمان گەیاندە بەردەمی بووک و زاوا، بە نۆرە لە بەردەمی باوکمدا نوشتاینەوە و دەستیمان ماچ کرد و پیرۆزباییمان لێ کرد، بووکێ لەژێر تارا سوورە تەنکەکەیەوە، چاوی زیتەی دەهات و یەک یەک لە ئێمەی دەڕوانی، لەژێر تاراکەیەوە دیار بوو، کیژۆڵەیەکی

منداڵکاری دەموچاو سپیکەلە بوو، هاوتەمەنی فاتمەی خوشکم بوو، یانی ئەوکات پێدەچوو تەمەنی سیازدە بۆ چواردە ساڵ بووبێت.
باوکم دەستی درێژ کرد بۆ لای ژووری چێشتخانەکە و بە ڕووخۆشییەکەوە پێی وتین، "کوڕەکانم، بڕۆن بۆ چێشتخانەکە، بە دڵی خۆتان شیرینی و خۆراک بخۆن، پاشان بەم بۆنەیەوە، ئاهەنگ بۆ باوکتان بگێڕن."
یەکێک لە ژنەکانی باوکم، لەو کاتەدا لەبەر دەممماندا قوت بووەوە، سینییەکی لەسەر دەست بوو، پڕ بوو لە مەسکەت و لوقم و گەزۆ و شیرینیی جۆراوجۆر، تا ئەو ڕۆژەیش، لە ماڵی ئێمەدا، تەنانەت لە جەژنەکانیشدا، نەماندیبوون و تاممان نەکردبوو، باوکم دیسان بانگی لێ کردین، "کوڕەکانم، بە دڵی خۆتان بخۆن، قابیلتانە و نۆشی گیانتان بێت."
پاش ئەوەی لەپێش چاوی باوکم بە ترس و لەرزێکەوە سەرو مەسکەتمان خستە دەممان، بێدەنگ بەدوای یەکتردا چووین بۆ چێشتخانەکە، بۆن و بەرامی خۆراک و خواردنەوە و هاڵاو و بۆنی بەهارات، ماڵەکەیان قانگ دابوو، چەندین مەنجەڵی گەورە لەسەر ئاگر بوون، دەیان سینی و قاپی گەورەی پڕ لە شیرینیی جۆراوجۆر، لەسەر مێز و ئەرزی چێشتخانەکە دانرابوو.
ئەو ڕۆژە باوکم زۆر دڵخۆش و بەکەیف دیار بوو، ڕووی خۆش بوو لەگەڵ هەمووماندا و یەک یەک بانگی دەکردین و دەستی بە سەرماندا دەهێنا و ئەملاولای ماچ دەکردین، دەمەوئێوارە، هەموو پێکەوە نانمان خوارد، ئەو ڕۆژە هەموو شتێک زۆر بوو، گۆشت و خۆراکی جۆراوجۆر ئامادە کرابوو، چەند پیاو و ژنی بێگانەمان

لەناودا بوو، وا بزانم کەسوکاری بووکێ بوون و لەگەڵ ئەو هاتبوون، جووتیارانی دێش، ئەو دوانیوەڕۆیە بەکۆمەڵ دەهاتن و وەکوو ئێمە بە سەردەستی باوکمدا نوشتانەوە و دەستیان ماچ کرد و پیرۆزباییان لێ کرد، پاشان لە بەردەرگا هەریەک لە جووتیارەکان، کیسەیەکی پڕ لە نوقڵ و شیرینیی وەر دەگرت و بەرەو دێ دەڕۆیشتنەوە.

ئەوسا ساڵێک زیاتر دەبوو، من لەگەڵ براکانمدا لە ژووری پیاواندا دەخەوتم و تەواو جیا بووبوومەوە لە دایکم و فاتمە، ئەو ڕۆژە، لە دەمەوئێوارەدا، چاوێکم بە ماڵەکەدا گێڕا بۆ فاتمە و دایکم، بەڵام لە هیچ جێگەیەک پێیان نەگەیشتم و تەنانەت لە ژوورەکەی خۆشیاندا نەبوون، ئەوەی ڕاستی بێت، زیاتر نەمپرسی و لەگەڵ براکانمدا سەرقاڵی خواردن و ڕابواردن بووین.

دوای نان خواردنی ئێوارە، ئاهەنگ گوێزرایەوە بۆ سەر سەکۆی بەردەمی ماڵەکە و ناو باخەکە، لەگەڵ براکانمدا، دەمانخوارد و لەگەڵ ژەنینی دەهۆڵ و زووڕناکەدا سەمامان دەکرد، دایە گەورەیش لەگەڵ بەربووکەکەدا، لە بەردەرگای ماڵەکەدا تاوێک بوو ڕاوەستابوون و قسەیان دەکرد، زۆری پێ نەچوو، دەنگی هەلهەلەی دایەگەورە و بەربووکەکە سەرنجی هەمووانی ڕاکێشا و هەموو گوێقوڵاخ بووین، لەو کاتەدا باوکم لە ماڵ هاتە دەر و گۆچانێکی بە دەستەوە و بەرەو گۆڕەپانی ئاهەنگەکە دەهات، خزمەتکارەکانیش لوولەی تفەنگەکانیان کردە ئاسمان و دەستیان کرد بە تەقەی خۆشی، باوکم گۆچانەکەی لە هەوادا با دا و لەگەڵ ڕیتمی دەهۆڵ و زووڕناکەدا، دەستی کرد بە سەما، تا درەنگانی شەو، هەموو بە چواردەوری باوکمدا خولاینەوە و سەمامان کرد.

لەو دەمەدا، گویم لە یەکێک لە براکانم بوو بە برایەکی ترمی دەوت، "سەد شوکور بۆ خوای گەورە، باوکمان جارێ بە بەریەوە ماوە و بەهێزە." هێندەی پێ نەچوو، بوو بە زاوا و ژنە تازەکەی کون کرد و کردی بە ژن!'

لەو کاتەدا قسەکانم بە سەلیم بڕی و لێم پرسی،

'چۆن، چۆن، پیاو، بەهێز، کونکردن!'

سەلیم بە سەرسوورمانێکەوە سەیرێکی کردم و وتی، 'تێناگەم لێت؟'

'مەبەستم، ئایا کونکردن یان بنپڕاندنی کچێکی لاوی تازە باڵقبووی تەمەن سیازدە یان چواردە ساڵ، گوایا تەنها بە کێری پیاوی بەهێز ئەنجام دەدرێت؟'

'ئەی چۆن.'

'زۆرینەی کچان لە سەردەمی تەمەنی باڵقبوونیاندا، خۆیان بە پەنجە ئەو پەردەیە دەدڕێنن، لە کاتی یاریکردندا یان لە ئەنجامی کەوتنیان، ئیتر بە هۆی هەر ڕووداوێکی ترەوە بێت، تێدەگەیت لە مەبەستم یان...'

'ئەی ئەو کچانە لە پاشەڕۆژیاندا تووشی لێپرسینەوە نابن؟'

'کام پاشەڕۆژت مەبەستە؟'

'مەبەستم، کە شوویان کرد، یان پاشەڕۆژ، پاشەڕۆژ، لە بەرامبەر خودادا.'

'تۆ پێت وا نییە کە، مەبەستم، کە هەر پیاو خۆی خودا و پاشەڕۆژیش بێت بۆ ئەو کچانە؟'

'استغفر الله العظیم!'

'بمبوورە.'

'ئاخ، مارتن، واز بێنە لەو قسە هیچوپووچانەت. یەکەم، من هەرگیز ژنم نەهێناوە و نازانم چۆنە و چۆن دەبێت، دووەم، ئەوە یاسای ژیانە و خوا دای ناوە، ئیتر پێویستە ئێمەی مرۆڤ پەیڕەوی بکەین.'

'مەرج نییە هەموو مرۆیەک پەیڕەوی ئەو یاساوڕێسایە بکات.'

'مارتن، ئەو باسە قسە زۆر هەڵدەگرێت، ئێستا بوارم پێ بدە باسی ڕووداوەکانی شەوی ئاهەنگەکە و ڕۆژی دوای ئەو شەوەت بۆ وەگێڕم.'

'ئێ باشە، بەردەوام بە.'

سەلیم وەکوو ئەوەی لەبەر خۆیەوە بدوێت، وتی، 'شەوی ئاهەنگی ژن هێنانەکەی باوکم، من و براکانم هەموو لەتاو ئازاری سکمان خەومان لێ نەکەوت، بەردەوام بە ڕێگەی ئاودەستەوە بووین، هەموو بەدوای یەکتردا ڕیزمان گرتبوو، تاکوتەرایش خۆیان لە ڕیزەکەدا بۆ پێ ڕانەدەگیرا و بەرەو دەرەوە هەڵدەهاتن و لە باخەکەمان دەستیان بە ئاو دەگەیاند.

ڕۆژی دوای زەماوەندەکەی باوکم، سەرلەبەیانی زوو، پێم وا بێت ئەو شەوە هەموو دوو کاتژمێر خەوتبووین، سەرلەبەیانیی ڕۆژی دوای ئەو شەوە، بەکۆمەڵ بەرەو مزگەوت بۆ نوێژی بەیانی بەڕێ کەوتین، مەلای مزگەوت، دوای نوێژ، کاتژمێرێک قورئانی بۆ خوێندینەوە و باسی ژیانی پەیامبەری بۆ کردین.

لە کاتێکدا ئێمە لە ژوورەوەی مزگەوتەکە چواردەورمان لە مەلا دابوو، لە حەوشەی مزگەوتتدا بوو بە هەرا و جەنجاڵی و شین و واوەیلا، مجەوری مزگەوتەکە بەهەڵەداوان خۆی کرد بە ژووردا و

چــوو بــۆ لای مــەلا و بــە گوێیــدا چپانــدی، مەلاکــەیش بــە شپرزەییەکەوە هەستایە سەر پێ و پێش مجەورەکە کەوت، مەلاکە بەدەم ڕێوە و لەبەر خۆیەوە پێی وتین، "کوڕینە تەواو، تەواو، هەموو بڕۆنەوە ماڵەوە و خواتان لەگەڵ بێت."

لە حەوشەی مزگەوتدا، چەندین کەس لەو دەوروبەرە بەکۆمەڵ و تاکوتـەرا ڕاوەستابوون، دەستەدەستە سـەریان لێـک نـابوون و ورتەورتیان بوو، کاتێ ئێمە گەیشتینە حەوشەکە، هەموو بێدەنگ بوون و لە ئێمەیان دەڕوانی، هەرچەندە ئەوەیش بەلای ئێمەوە ئاسایی بوو، چونکە ئێمەی کوڕانی ئاغا، لە هەر جێگەیەکەوە دەر دەکـەوتین، جووتیارەکـان سـەریان لـە ئاسـتماندا دادەخسـت و بێدەنگ دەبوون. کاتێک لە مزگەوت دەر چووین، بەڕێگەوە باس باسی خۆراک و زەماوەندەکەی ڕۆژی پێشوو بوو، لە ڕێگە، پێش ئەوەی بگەینە بەردەرگای باخەکە، جێبەکەی باوکم ڕووبەڕوومان دەهات و خێرا دای بەلاماندا، باوکم و دایکم و دایە گەورەمی تێدا بــوو، بــێ ئــەوەی لــە ئێمــە بــڕوانن، پـاش ئـەوەی تاوێـک بـە سەرسووڕمانەوە هەموو لە یەکترمان ڕوانی، یەکێک لە براکانم هەڵی دایە و وتی، "دەبێت کام لە جووتیارەکان لنگی جووت کردبێت و تۆپیبێت."

کاتێـک گەیشـتینە نـاو دەرگـای باخەکـە، یـەکێک لـە براکـانم لـە پاسەوانی ناو دەرگاکەی پرسی، "دەزانیت بۆچی باوکمان چوو بۆ گوند، ئایا چی ڕووی داوە؟"

پاسەوانەکە سەری ڕاوەشاند و لەوەڵامدا وتی، "پێم وا بێت دایکی مەلای مزگەوت مردووە."

ئێمەیش دەستمان کرد بە پێکەنین و گاڵتەکردن، یەکێک لە براکانم

وتی، "ئاوا، ئێمە وامان دەزانی دیسان شایی و ئاهەنگە، تومەس پیرێژنێک تۆپیوە."

لە ماڵەوەیش، هەموو لە چاوەڕوانیی بینینی ژنە تازەکەی باوکمدا بووین، بەڵام ئەو ڕۆژە، لە ژوورەکەی خۆی نەهاتە دەر، ئەو نیوەڕۆیە، هەموو بەدەوری سفەرەکەدا دانیشتبووین و پاشماوەی ئەو خۆراکە زۆرەی ڕۆژی پێشوومان دەخوارد، ژنەکەی تری باوکیشم، بێدەنگ بە ماڵەکەدا دەهات و دەچوو، هێشتا ئێمە لە نانخواردن نەبووبووینەوە، لەناکاو ماڵەکە تاریک داهات و دەرگا و پەنجەرەی ماڵەکە ڕەشەبا دەیدان بەیەکدا، لەپڕێکدا، لە دەرگای هۆڵەکەوە ڕەشەباکە خۆڵ و تەپوتۆزی کرد بە ژووردا، لە دەرەوە دەنگی گفەگفی ڕەشەبا دەهات، تا دەهات، زیاتر ماڵەکە تاریک دەچوو، زرموهووڕی دەرگا و پەنجەرەکان، هەمووانی بێزار کرد، چەند برایەکم سفرەکەیان بەجێ هێشت و دەستیان کرد بە داخستنی دەرگا و پەنجەرەی ماڵەکە، لە یەک ساتەوەختی کورتدا، تۆفان و هێزی ڕەشەباکە ماڵەکەی پڕ کرد لە تەپوتۆز و لمی بیابان، چاو چاوی نەدەبینی و هەموو بە یەکتردا دەدراین، هاتوهاواری ئێمە و قیژەقیژی ژنان و زرموهووڕی دەرگا و پەنجەرە و ناڵە و گرمەی تۆفانەکە، ماڵەکەی کرد بە قیامەت، باوبۆران هەموو ئاڕاستەکانی لێ ون کردین و لە بێدەسەڵاتیماندا، هەریەکە بۆخۆی لە قوشبنێکی ماڵەکەدا خۆی لێ گرمۆڵە کرد و بێدەسەڵات خۆمان حەشار دا. ئەو ڕۆژەم باش بەبیر دێت، بە خوا کەس بەتەمای خۆی نەبوو، هەموو وامان دەزانی کۆتایی دونیایە، لە ئایەت خوێندن و شایەتومان هێنان زیاتر، هیچ دەسەڵاتێکی ترمان نەبوو، لە سووچێکی هۆڵەکەدا خۆم لێ گرمۆڵە کردبوو، لە

عەزرەتدا توند هەردوو دەستم بە دەموچوماومەوە گرتبوو، لەدلی خۆمدا تۆبەم دەکرد و لە خودا دەپاڕامەوە. بەڕێکەوت ئەو ڕۆژە مەلای مزگەوت باسی ڕۆژی قیامەتی بۆ دەکردین، ئەو ڕۆژە مەلا دەی وت، "ڕۆژی قیامەت، ئەمڕۆ یان سبەی یان دوای ساڵێکی تر، لەوانەیشە پاش هەزاران ساڵی تر ڕوو بدات یان ڕوو نەدات، ئەوەیش خوای گەورە خۆی دەیزانێت."

نازانم چەندێک بوو لەوێدا بێهیوا لێی کەوتبووم، کاتێک تۆفانەکە کەمێک هێواش بووەوە و ماڵەکە تۆزێک ڕۆشنایی تێ کەوت، بە ترس و لەرزێکەوە سەرم هەڵبڕی و بە چواردەوری خۆمدا ڕوانیم، بینیم چۆن ماڵەکە دار و دیواری بەسەر یەکدا ڕووخابوو، یەک یەک براکانم لەناو تەپوتۆز و لەژێر دار و پەردووی دیوار و دەرگا داڕووخاوەکاندا دەهاتنە دەر، ساڵی چەند جارێک تۆفان و خۆڵبارین لەو هەرێمەی ئێمە ڕوویان دەدا، بەڵام بە تەمەنی باوکیشم، ڕەشەبا و تۆفانی لەو شێوەیە ڕووی نەدابوو. سەرسام، تاوێک لە جێگەی خۆمەوە لە ماڵەکەم ڕوانی، بینیم چۆن دەرگای ژوورەکەی باوکم و دەرگای سەرجەم ژووری نهێنییەکان، ڕەشەباکە لە گرێژنەوە دەری هێنابوون، بە خوای گەورە، بەبێ ئەوەی بە هانای کەسەوە بچم، تاوێک بە بەردەمی ژوورەکاندا گەڕام و یەک یەک لێم ڕوانین، بەڵام هێزی ڕەشەباکە، هەموو ژوورەکانی کردبوو بە وێرانە و پڕ بوون لە لم و تەپوتۆزی زەردی بیابان و بەئەستەم دەبینران، وێنەی باوکم و باپیرەم، کە بەگەورەیی لە چوارچێوە گیرابوو و بە دیواری هۆڵەکەدا هەڵواسرابوو، تێک شکابوو و لەو ناوەدا کەوتبوو، من و براکانم بە سەر و چاوی خوێناوییەوە لەو دەوروبەرە، لەژێر دار و

پەردووی ماڵە وێرانەکەدا زەلیل و کەنەفت لە یەکترمان دەڕوانی و بەرامبەر دەرگا تێکشکاوەکەی ژوورەکەی باوکم، حەپەسابووین، لەبیرمان چوو بەتەنگ ئافرەتەکانەوە بچین، کە لەو ناوەدا ڕووت و نیوەگیان لێی کەتبوون، کاتێ ماڵەکە ئەهوەن و تەواو ڕووناک بووبووەوە، هەموو لە دەنگی باوکم ڕاپەڕین و کەوتینە خۆمان، خوای گەورە ئاگادارە، ئەوانەیشی بریندار بوون و قاچ و دەستیان شکابوو، زۆریان لە خۆیان کرد و هەوڵیان دەدا لە ڕووی باوکمدا ڕاست بە پێوە بوەستن، باوکم لە عەزرەتدا بە ماڵەکەدا ڕای دەکرد، ئێمەیش لە بێدەسەڵاتیماندا، نەماندەزانی چی بکەین، هەندێک لە براکانم بەدوای باوکمدا ڕایان دەکرد و دەگریان و بە چەپۆک لە سەری خۆیان دەدا، باوکم خێرا دەرگا شکاوەکانی بەئەمانەت بە ڕووی ژوورەکاندا گرتن، تووڕە لە هەموومانی دەڕوانی، کاتێک بینیی ژنەکانی یەک یەک لەو ناوەدا لەژێر تەپوتۆزدا کەوتبوون، پەلاماری هەر کامیانی دەدا، نیوەگیان و ڕەشەباکە جلوبەرگی لەبەریدا دادڕیبوو، باوکم هێندەی تر بێزاری دای گرت و بە گۆچانەکەی دەستی، کەوتە لێدانی هەرکەسێک، کە لێوەی نزیک بووایە، بە دەستەکەی تریشی، لە جلکە شڕە دەگەڕا، تا بەسەر ئازای ڕووتەوەبووی ژنەکانیدا بدات، دایە گەورە بەدەم گریان و ناوی خوا هێنانەوە، یەک یەک پەلی ژنەکانی دەگرت و بۆ ژووره وێرانەکان کێشی دەکردن، باوکم بە تووڕەییەوە هاواری لێ کردین، "بڕۆنە دەرەوە، هەی ناپیاوینە، لە بەرچاوم ون بن هەی بەچکە سەگەکان."

بڕوا بکە براکەم، یەکێک بە پێی خۆی و تاکوتەرایش بە گاگۆڵکێ و سکەخشکێ، هەموو بە پەلەپڕوزێ ڕووە و دەرەوە هەڵاتین، من

یەکەم کەس بووم خۆم گەیاندە دەرەوە و خۆم دەرباز کرد.
کاتێک گەیشتمە بەردەمی ماڵەکە و ڕوانیم ئەو تۆفانە ج ئاسەوارێکی وێرانەی لەدوای خۆیەوە جێ هێشتبوو، باخەکەمان بەدەگمەن داری وەستاوی تێدا مابوو، ئەو ناوە یەک پارچە بووبووە بەشێک لە بیابان، لە کاتێکدا بەسەرسامی لە چواردەوری خۆمم دەڕوانی و هێشتا چاوم پڕ بوو لە فرمێسک، دایکم لەناکاوێکدا دەستی گرتم، لێم نزیک بووەوە و پاش ئەوەی بە ترسێکەوە بە چواردەوری خۆیدا ڕوانیی، بە دەنگێکی تێکشکاو و گریاناوییەوە وتی، "سەلیم، سەلیم، فاتمەیان کوشتووە."
ڕاچڵەکیم و تەزوویەکی سارد بە لەشمدا دەهات و دڵم داخورپا، دەستەونەزەر لە جێگەی خۆمدا وشک ڕاوەستام، نازانم لەو دەمەدا چی بە خەیاڵمدا دەهات، خوا ئاگادارە، ڕێک لەویا، وەختەبوو دڵم لە لێدان بکەوێت، نازانم ترس و پەشۆکانی ئەو تۆفانە شوومە بوو، یان ئەوە بوو کە دوای چەندین ساڵ بوو، بۆ یەکەمین جارم بوو دەستم بەر دەستی دایکم بکەوێت، یان هەواڵی مردنی فاتمە بوو.
بە هەرحاڵ، لەو دەمەدا دایەگەورەم لەناو دار و پەردووی دەرگا و پایە ڕووخاوەکانەوە هاتە دەرەوە و بانگی لێ کردین، "دەی کوڕینە، وەرن هاریکاریی باوکتان بکەن."
باوەڕ بکە مارتن، لەو دەمەدا هێزێک، بێ خواستی خۆم، قاچەکانیان پێ جووڵاندم و لەوەدا بووم هەنگاو بەرە و لای دایە گەورەم هەڵنێم، ویستم خۆم لە دەستی دایکم ڕاپسکێنم و دوای براکانم بکەوم بۆ ژوورەوە، تا بە هانای باوکمەوە بچم و بتوانم دڵی باوکم ڕازی بکەم، بەڵام دایکم ئەوەندە بە ڕقەوە دەستی لە

مەچەکم هەڵپێکابوو، نەمتوانی خۆمی لێ قوتار بکەم، بەبیرم دێت، دایکم بەتوورەیی و بە دوو چاوی پڕ لە فرمێسکەوە، بەدوای خۆیدا ڕووەو دەرگای دەرەوەی باخەکە ڕایکێشام، لەبەر خۆیەوە، دایکم وەکوو لەگەڵ خۆیدا بدوێت، "تەرمەکەی لە مزگەوتە و کچەکەم بێناز لەوێ کەوتووە، تاوێکی تر دەیشۆن و دەیپێچنەوە و لە چاڵی دەنێن، تۆیش دوای باوکە زاڵمەکەت دەکەویت و ساویلکانە دەچیت بە دەنگی ئەوەوە!"

باوەڕم پێ بکە مارتن، لە کاتێکدا ناچار بەدوای دایکمدا دەڕۆیشتم، خەم و خەفەتێک لەناو دڵمەوە، وردە وردە بە دەمارەکانی لەشمدا بڵاو دەبووەوە و تا دەهات، بێزار و توورەی دەکرم، بەدرێژایی ئەو ڕێگەیە، لە بیرکردنەوەدا بووم لەو ڕووداوانەی لە چەند کاتژمێری ڕابردوودا ڕوویان دابوو، دایکم لەبەر خۆیەوە بەردەوام دەگریا و دەنووزایەوە و زووزوویش لەبەر خۆیەوە دەی وت، "وەی فاتمە گیان، کچە جوانەمەرگەکەم، خوا تۆڵەی تۆ لەو زاڵمانە بسەنێت."

تاکوو دەهات، هەنگاوەکانی خێراتر دەکرد، بگرە تاوتاو ڕای دەکرد و ڕووەو گوندەکە بەدوای خۆیدا ڕای دەکێشام، بەئەستەم ئاسەواری شەقامە قیرتاوکراوەکەمان دەبینی، هەموو ئەو ناوە، یەکپارچە بووبوون بە بیابان و لم دای پۆشیبوو، کاتێک گەیشتینە نزیکی گوندەکە، بینیم چۆن ئەو تۆفانە ماڵی جووتیارەکانیشی بەسەر یەکتردا ڕماندبوو، دووراو دوور دەنگی نزا و گریانیانم دەبیست.

تا لەناو دێکە نزیک دەبووینەوە، ئاسەواری وێرانەکەم زیاتر دەبینی، چووینە ناو دێکە و لە مزگەوتەکە نزیک بووینەوە،

جووتیارەکـان هـەموو، بـە گـەورە و بچووکـەوە، لـەوێ بـوون، تاکوتـەرا دەگریـان و شـین و ڕۆڕۆیـان بـوو، هـەموو ڕەنگزەرد و تەپوتۆزاوی و سەروگوێلاکخوێناوی دیار بوون، دەرگا و دیواری مزگـەوت ڕووخـابوو، ئـەو بـەردە مەڕمـەڕەی بەپـێش دەرگـای مزگەوتەکـەوە هەڵواسـرابوو، نـاوی باپیرەمی لەسـەر بـوو، بـاوەڕ بکە، ئاسەواری لەو ناوەیشدا نـەمابوو، منـارەی مزگەوتەکە بەلادا هاتبوو، دایکم هێشتا دەستی بـەر نـەدابووم، بێ ئـەوەی سـڵاو لـەو حەشـاماتەی بـەردەمی مزگـەت بکـات، خـۆی کـرد بەنێوانیانـدا و ڕاستەوڕاسـت ڕووەو مردووخانەکـە چـوو، مردووخانەکـە دوو بەش بوو، بەشـی پیاوان و ژنـان جیـا کرابوونـەوە، نـاو حەوشـەی مزگەوتەکە چەند کەسێکی لێ بوو، مردووخانـەکە، ئـەو جێگەیـەی سەردەمانێک ئێمە چاوشارکێمان تێدا دەکرد، چەند پیاو و ژنێک لە بەردەمیـدا ڕاوەسـتابوون و لەگـەڵ یـەک دەدوان، کاتێـک ئێمـەیان بینی، هەموو بێدەنگ بوون و خێرا خۆیان خستە لاوە، دیار بوو لە ژووری مردووخانەی پیاوانیش، تـەرمی مـردووی لـێ بـوو، دایکم سڵاوی لەوانیش نەکرد و خۆی کرد بە بەشی ژناندا. لـە ژوورەوە، سـێ مـەیت دانرابـوو، کـە هەرسـێکیان بـە قوماشـی سـپی داپۆشرابوون، دایکم بەلای دووانی یەکەمیاندا هـەنگاوی نـا و لای دوایین تەرم، کە جیاوازتر لـە دووانەکەی تر لەسـەر تاتەشـۆرەکە دانرابـوو، هێشـتا خـوێن لەملاولایـەوە، لـە تەختـەی تاتەشـۆرەکە دەچـۆڕا، خوێنەکـەی تـا سـەر گـونجی ئـاوەڕۆی مەیتخانەکـە چۆڕاوگەی بەستبوو، دایکم دەستی منی بەر دا و لەپڕێکدا دەستی کرد بـە هـاوار و گریـان و بـە چەپۆک بـە سـەری خۆیدا دەکێشـا، ئـەژنۆکانی بـە ڕاسـت و چـەپی مەیتەکـەدا داهێشـت و بەسـەر

تاتەشۆرەکەدا نوشتایەوە، خامە سپییەکەی لەسەر دەموچاوی لا دا، بینیم، دەموچاوێکی هەڵئاوساو و تێکشکاو و خوێناوی، لە ڕاستیدا نەمناسییەوە، چونکە شێوەی ئاسایی فاتمەی پێوە دیار نەمابوو، ڕاستتر، نەمدەتوانی لە سیمای تێکشکاوی بڕوانم، لە دڵی خۆمدا وتم، "دەبێت ئەم تۆفانە چەندێک کەسی تری وەکوو فاتمەی کردبێتە قوربانی؟"

تاوێک بوو حەپەساو و بێدەنگ، لەتەنیشت دایکمەوە ڕاوەستابووم، لە ناخمەوە گریانێک قوڵپی دەدا و بێزاری و تووڕەبوونێکیش ڕێیان پێ نەدەدام بگریم و فرمێسکەکانم بڕژێنم، ئەوسا بە نەنگیم دەزانی بگریم، هەموو گیانم کەوتبووە سەر ئارەق و دەلەرزیم، دیار بوو لە عەزرەت ئەو گریانە بەکوڵەی دایکمدا بوو. دوو ژنی سپی پۆش بە هەڵەداوان خۆیان کرد بە ژووردا، خێرا دەستیان دایە باڵی دایکم و هەڵیان ساندە سەر پێ و لە تەرمەکە دووریان خستەوە، یەکێک لە ژنەکان وتی، "بە فەرمانی ئاغا، کەس بۆی نییە تەرمەکەی ببینێت و دەبێت زوو بنێژرێت."

ژنی دووەم هەڵی دایە و وتی، "ئێمە چاوەڕوانین خوێنەکەی وشک بکات، تاوەکوو بتوانین لە تابووتێکی بنێین، ئەوە چەند کاتژمێرێکە چاوەڕوانین، بەڵام بەردەوام خوێنی لەبەر دەڕوات، لە قەبرستانەکەی پشت ئاواییشەوە گۆڕی بۆ هەڵکەندراوە."

لەو دەمەدا نەمتوانی بیر لەوە بکەمەوە، ئاخۆ بۆچی فاتمە لە قەبرستانەکەی پشت ئاوایی دەنێژرێت، قەبرستانەکەی پشت ئاوای، تەنها جێگەی مردووی جووتیارەکان بوو، دوو سەد ساڵ دەبوو مردووانی خێزانی ئاغا، لە حەوشەی پشتەوەی مزگەوت دەنێژران، ئەوەی ڕاستی بێت، ئێستایش لەو نهێنییە تێنەگەیشتم،

دیار بوو ئەوەیش بە فەرمانی باوکم بوو، بۆچی فاتمەی بە مردوویش بێبەری کردبوو، نازانم بۆچی؟ تاوەکوو ئێستایش، لێی تێنەگەیشتووم.
دایکم، پاش ئەوەی جارێکی تر چووەوە بۆ لای تەرمەکەی فاتمە، بەسەر یەکێک لە ژنەکاندا دانەوییەوە و دەستێکی خستە سەر دەموچاوی خوێناویی فاتمە و بە دەنگێکی گریاناوییەوە وتی، "خوای گەورە تۆڵەی تۆ لەو زاڵمانە بکاتەوە، کچە ئازیزەکەم، بە خوای گەورەت دەسپێرم، ماڵئاوا، ماڵئاوا."
دایکم ڕاست بووەوە و بەدەم گریانەوە هاتە بەرامبەرم و قووڵ لە چاومی ڕوانی، "بە خوای گەورەت دەسپێرم، کوڕەکەم."
پاشان ڕووی لێ وەرگێڕام و بە ڕاکردن لە مەیتخانەکە چووە دەرەوە، بە خوا لەویادا لە دایکم تێنەگەیشتم، ئاخۆ بۆچی ماڵئاوایی لە من دەکات، دوای ڕۆیشتنی دایکم، تاوێک بوو لە شوێنی خۆم وشک ڕاوەستابووم و لە دوو ژنەکەم دەڕوانی، کە لەو کاتەدا خەریکی پێچانەوەی تەرمەکەی فاتمە بوون، ئینجا یەکێک لە ژنە مردوو شۆرەکان، ڕووبەرووم هات و بە تووڕەییەوە کردمیە دەرەوە.'

سەلیم تاوێک بوو بێدەنگی دای گرتبوو، بەرامبەر پۆرترێتی سەر دیوارەکە دەستەونەزەر ڕاوەستابوو، وەکوو بیر لە شتێک بکاتەوە، لەسەر جێگەکەمەوە غەمگین لێم دەڕوانی.

پاش تاوێک بێدەنگی، سەلیم ئاوڕی دایەوە و ڕووی تێ کردم و وتی، 'مارتن، دەزانم ئەو بە سەرهاتەی بۆم باس کردیت، زۆرێک

لە ڕووداوەکانی گرانن و ئازاربەخشن، بەڵام ئەوە ڕاستییەکانن و تۆ یەکەم کەسیت دەیانبیستیت. لەدوای ئەو ڕۆژەوە، دایکم سەری خۆی هەڵگرت، تاوەکوو ئەمڕۆیش، هیچ هەواڵێکی نازانم، هەرچەندە ئەوسا باوکم و براکانم زۆر بەدوایدا گەڕان، بەڵام هیچ سۆراغێکیان بۆ نەکرا.

بەبیرم دێت ئەوسا، ڕۆژێک دوای ئەو ڕووداوانە، دایە گەورە وتی، "خوای گەورە ئێمەی خۆش دەوێت، کە ئەو دوو بەڵایەی لە کۆڵ کردینەوە." مەبەستی لە دایکم و فاتمە بوو.

لەدوای ئەو ڕۆژەوە، لە ماڵەکەدا جێگەم پێ لێژ بوو، ژنان هەر بە کوڕی ژنە هەڵگیراوەکە بانگیان دەکردم. چەند مانگێک دوای ئەو ڕۆژە، لەگەڵ یەکێک لە براکانم بەشەڕ هاتم، بەبیرم نایەت شەڕەکەمان لەسەر چی بوو، وابزانم بێی وتم، "تۆ کوڕی ئەو ژنە بەرەڵڵا و بێکەسە سەماکارەی خەڵکی قاهیرەیت، کە باوکم لەبەر خاتری خودا، لەخۆی گرت و تۆبەی پێ کرد و مارەی کرد، بەڵام ئەوە دیسان هەڵهات و ئێستا بزانە لەکوێ دەستی کردۆتەوە بە بەرەڵڵایی خۆی."

لە ڕاستیدا مارتن، تاکوو ئەو ڕۆژانەیش نەمزانیبوو، گوایا دایکم خەڵکی قاهیرە بووە و پێشتر لە یەکێک لە کلوپە شەوانەکاندا سەماکار بووە، چەندین جاری تر لەسەر دایکم، بێڕەحمانە تانەیان لێ دام، چەند جارێک گوێم لێ دەبوو، دایە گەورەم فاتمەی بە شەیتانە بچکۆلەکە ناو دەبرد، خوا ئاگادارە مارتن، لە شەرمان وەختەبوو دەتوامەوە، لە ناچاریمدا، سەرم دادەخست و خۆم بێدەنگ دەکرد.

ئەوسا لە یەکێک لە براکانم بیست، گوایا فاتمە لە یەکەم شەوی

چوونەناوپەردەیدا، ڕازی نەبووە مێردەکەی سواری ببێت، ئیتر ئەویش کوشتوویەتی!"

برایەکی ترم وتی، "لە تۆفانەکەدا، ماڵی مێردەکەی بەسەریدا ڕووخاوە."

ئایا فاتمە چۆن مرد، لە ڕاستیدا، تا ئێستایش ڕاستییەکەیم نەزانی.'

سەلیم هات لەسەر جێگەکە، لەتەنیشتمەوە دانیشت و دیسان وتی، 'دەزانی مارتن، لەدوای ڕۆژی تۆفانەکە و مردنی فاتمە و سەرهەڵگرتنی دایکمەوە، ماڵەکەمان هەر بەوێرانەیی مایەوە، نەک تەنها خانوو و باخەکەمان گۆڕابوو، ژنەکان و براکانیشم ڕەفتاریان لەگەڵ یەکدا و بەتایبەتی لەگەڵ مندا وەکوو جاران نەبوو.'

## ١٤

# نیگار

لـه حەوشـەی بەندینخانەکـەدا، لـە لەتـە خشـت و وردەبـەردی ڕەنگاوڕەنـگ دەگـەڕاین، لـە گیرفانمـان یـان لـە دەممانـدا دەمانشاردنەوە و دزەمان پێ دەکرد بۆ ژوورەکەی خۆمـان، بەو مەبەسـتەی لەسـەر دیـواری ژوورەکـەمان، نیگـاری پێ بکێشـین، مانگی جارێک بۆ یەک کاتژمێر لە نیوەڕوانێکی گەرمدا، بە جیا لە زیندانییەکانی تر دەیانکردینـە بـەر ئـەو خۆرە گەرمـە، پۆلیسـەکان نەیاندەهێشـت بچینـە بـەر سـێبەری دیوارەکـان، سـەلیم بەدرێژایـی ئـەو کـاتژمێرە بێوچـان بـەو گوڕەپانـەدا دەگـەڕا، گـەرمیی تیشـکی خۆرەکە ئەوەندە بـەتین بـوو، هەسـتم دەکرد جلـە شینەکەی بـەرم بەسەر پێستمدا تواوەتەوە، هـەر لـە سـەرەتاوە سـەلیم ئامۆژگـاریی کردم، کە پارچەجلێک لـە سـەرمەوە بئـاڵێنم، هـەتا تیشـکی خۆرەکە ڕاستەوخۆ لـە سـەرم نـەدات، هـەموو سـەروگوێلاکم ئارەقیـان پێدا دەهاتە خوار، پێدەچوو پێوانەی گـەرما لـەو ڕۆژانـەدا، دەوروبـەری پەنجا پلەی سەدی بووبێت.

ئەوسا لەگەڵ سەلیم، جگە لە پۆرتریتەکەی فاتمە، هەرچوار دیواری ژوورەکەمان پاک کردبووەوە و دیسان نیگارمان لەسەر کێشانەوە، ئەو ڕۆژانە پۆلیسەکان کەمتر سەردانیان دەکردین و دوو ڕۆژ جارێک خۆراکیان پێ دەداین، ئێمەیش لە برساندا یان دەخەوتین، یان نیگارمان لەسەر دیوارەکان دەکێشا.

لە یەکێک لەو ڕۆژانەدا، قەرەوێڵەکەمان ڕاکێشابووە ناوەڕاستی ژوورەکە، تا بتوانین لەسەر ڕووی هەرچوار لای دیواری ژوورەکە نیگار بکێشین، پاش پاککردنەوەی لادیوارێک و سەرتاپا ڕەنگی زەرد و سوور کردنی، ئێمە دەمانویست دیمەنی بیابانێکی لەسەر بکێشین، کە ژوورەکەمان بەسەریدا بڕوانێت، درەنگانی شەو تەواومان کرد، ئینجا هەردووکمان چووینە سەر قەرەوێڵەکە و بەرامبەری دانیشتین و لێمان دەڕوانی. نیگارەکە، هەرچەندە پارچەیەک بوو لە بەتاڵی، بە جۆرێک بوو، هەستمان دەکرد ئەولایەی دیواری ژوورەکە ڕووخاوە و بە هەنگاوێک دەتوانین پێ بنێینە ناو ئەو بیابانەوە، بەڵام هەستێکی لا دروست کردبووین، هەردووکمان بەرامبەری بێدەنگ بووبووین و سەرسام لێمان دەڕوانی. لەناو ئەو بێدەنگییەدا، سەلیم بەدەم بیرکردنەوەوە وتی، 'مارتن، ئەم وێنەیە بیابانی سینام بەبیر دێنێتەوە.'
پاش تاوێک بێدەنگی، سەلیم سەری بەلادا خست، وەکوو بیەوێت لە بیابانەکەدا، لە فۆرمێک یان هەرشتێک بگەڕێت، وردەوردە لە خەیاڵی خۆیدا نغرۆ دەبوو، تاوێکی پێ چوو، پاشان هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و دیسان وتی، 'تۆ هیچت بیستووە دەربارەی جەنگی یونی ساڵی ١٩٦٧؟'

'بەڵێ، پێم وا بێت ناوی ئەو جەنگەم بیستووە.'

'زیاتر بە جەنگی شەش ڕۆژە ناسراوە، بەڵام ئێمە ئەوسا پێمان دەوت جەنگی جوولەکە، دوای کۆتاییهاتنی ئەو جەنگە، لەگەڵ باوکم و برایەکمدا چووین بۆ سۆراغی براکانم، کە ئەوسا سیان لە براکانم، لەو ساڵانەدا سەرباز بوون و لەو جەنگەدا بەشدار بوون، بەو بیابانەدا لە شەرم شێخەوە بەڕێ کەوتین تا سەر سنووری ئیسرائیل، بەڵام دوای مانگێک گەڕانمان، هیچ هەواڵێکیانمان دەست نەکەوت و ناچار بۆ ماڵەوە گەڕاینەوە، ئەوسا سێ مانگێکی پێ چوو، تا هەواڵیانمان پێ گەیشت، دوو برام لەو جەنگەدا کوژران و ئەوی تریان بریندار بوو، بریندارەکەیان لە نەخۆشخانەی سەربازی بوو لە ئیسماعیلیە. ئەو برایەم کە بریندار بوو، دوای شەش مانگێک، بە جیبێکی سەربازی گەیاندیانەوە ماڵەوە، دەست و قاچێکی لەدەست دابوو، براکەم خۆی ئاوای بۆ گێڕاینەوە، "لەو هەرێمەی ئێمەی لێ بووین، کە زیاتر لە دە هەزار سەرباز بووین، چاومان بە سەربازێکی جوولەکە نەکەوت، لە دەمەو بەیانییەکی زوودا، دەیان فڕۆکەی جەنگی لەناکاو بۆردومانیان کردین و لە چاو ترووکانێکدا ئەو بیابانەیان لێ کردین بە دۆزەخ."

براکەم ئەوسا باسی لە هەزاران کوژراو و بریندا دەکرد، بەڵام دەزگاکانی سەربازی، ئەو ڕاستییەیان شاردەوە. ئەوەی زۆر میزاجی باوکم و خێزانەکەی ئێمەیان شێواند، کوژران و برینداربوونی براکانم نەبوو، بەڵکوو ئەو یاسایانە بوون، کە لە ساڵی ١٩٥٢دا، لەسەر ڕێکخستنی خاوەنداریتیی زەویوزار دەر چووبوون، ساڵانێکی زۆری پێ چوو، تاوەکوو لەو هەرێمەی ئێمەدا جێبەجێ کران، بەگوێرەی ئەو یاسایە، جووتیارەکان هەموو

دەبوون بە خاوەنی زەویوزاری خۆیان و باوکم تەنها ئەو چەند هێکتارەی بۆ دەمایەوە، کە بە چواردەوری ماڵەکەمانەوە بوو، ئەویش هیچ بەروبومێکیان نەبوو، تاکوو ئەو خێزانە گەورەیەی ئێمەی لەسەر بژیێت. چەند مانگێک دوای جێبەجێکردنی ئەو بڕیارە شومە، باوکم بڕیاری دا کوڕەکانی لە نووسینگەی کار لە شاری ئەسیوط بۆ کرێکاری ناونووس بکات، ئەوەی ڕاستی بێت، هیچمان دەستڕەنگین نەبووین و پێشتر هیچ کارێکمان پێشتر نەکردبوو، پاش دوو حەفتە، لەگەڵ چەند برایەکمدا لە شاری ئەسکەندەریە ناومان بۆ کرێکاری دەر چوو، ئەو ڕۆژەی بەڕێ کەوتین بۆ ئەسکەندەریە، زیاتر لە دوو سەد گەنج دەبووین، هەموو خەڵکی ئەسیوط و دەوروبەری بووین و حەوت پاسمان پڕ دەکرد، ئەوسا لە ئەسکەندەریە بەدرێژایی سەدان کیلۆمەتری کەناری دەریای ناوەڕاست، هاوینەهەواری نوێ دروست دەکران، دەیان کەمپ ئامادە کرابوون بۆ ئەو کرێکارانەی لە تەواوی میسرەوە هاتبوون، کەمپەکانیش لەو بیابانە وشک و گەرمەدا بوون، لەبەر زۆریی کرێکارەکان، خاوەن کارەکان هەقێکی زۆر کەمیان بە کرێکار دەدا، زۆر جاریش ناچاریان دەکردین بە هەمان کرێی ڕۆژێک، شەوانیش کاریان بۆ بکەین.

پاش شەش مانگ کرێکاری و دەردەسەری و نەخۆشی، بۆ یەک حەفتە بۆ ماڵەوە گەڕاینەوە، خوا ئاگادارە مارتن، هەموو شتێک لە ماڵەکەماندا گۆڕابوو، زیاتر لە نیوەی داری باخەکەمان وشک بووبوون، هەریزی بەر ماڵەکەیشمان، لە بێئاویدا زەرد هەڵگەڕابوو، لە هەمووی ناخۆشتر ئەوەبوو، کە بیستمان ژنە تازەکەی باوکم ڕەدووی یەکێک لە پاسەوانەکانی باوکم کەوتووە

و کەس نەیدەزانی بۆ کوێ چووبوون، ژنە تازەکەی باوکم، ناوی فەریدە بوو، باوکم بە ژنبەژن هێنابووی، لەگەڵ هاوڕێیەکی خۆیدا، کە ئەویش ئاغا و هاوتەمەنی خۆی بوو. مارتن، مەبەستم لە ژنبەژن، یانی فاتمە شووی کردبوو بەو کابرا ئاغایە و ئەویش کچەکەی خۆی بە باوکم دابوو.'

'چۆن، تێناگەم؟'

'ژنێک بە ژنێک، یانی گۆڕینەوە، ئەوە بۆ وا چاوەکانت داچڕیوون، بەراز، دەڵێی یەکەم جارتە شتی وا دەبیستیت! بە هەرحاڵ، واز لەوە بهێنە، ئەوسا فەریدە تەمەنی، وەک فاتمە، سیازدە بۆ چواردە ساڵێک دەبوو، کچێکی کورتەبالای لاوازی ڕیوەڵە بوو، وەکوو فاتمە، بێدەنگ بەردەوام بە ماڵەکەدا دەهات و دەچوو. ئەوەی ئەوسا منی زۆر بێزار کردبوو، ئەو دووبەرەکی و جیاکارییە بوو، کەوتبوونە نێوان ئەندامانی خێزانەکەمان، براکانم و دایکیان بێڕێزانە ناوی باوکمیان دەهێنا، هەر خێزانە بە جیا بۆ خۆی بەشێکیان لە ماڵەکە داگیر کردبوو، چێشتخانە و هۆڵی ماڵەکە کرابوون بە چەندین بەشەوە و دیواریان لەنێواندا دروست کرابوو، باوکم دەرگای ژوورەکەی لەسەر خۆی داخستبوو، کەس نەیدەزانی ماوە یان مردووە. لەو ڕۆژانەدا، چەند جارێک بەدزیی هەمووانەوە چوومە بەردەرگای ژوورەکەی و پاش ئەوەی بە ترس و لەرزێکەوە چەند جارێک لە دەرگام دا، بە دوودڵی و ترس و لەرزەوە بانگم لێ کرد، هەتا ئەمڕۆیش، بەداخەوەم کە هیچ وەڵامێکی نەدامەوە، خوا ئاگادارە ویستم ببینم و ئەو پارەیەی بە کرێکاری پەیدام کردبوو، بیکەمە دەستیەوە، ویستم تاوێک لە چاوی بڕوانم و تەنها جارێک ئەویش لێم بڕوانێت، بمبینێت، کە

وەفام بۆی هەیە و ئاواتەکەیم هێناوەتە دی، بووم بە پیاو، ئا، ئا، تەنها ئەوەندە، ویستم باوکم بمبینێت، کە بووم بە پیاو.

داخی گرانم، هەوڵەکەم بێهوودە بوو، بگرە جیاواز لە هەرکاتێکی دی، لە ماڵەکەدا هەمووان وەک غەریبەیەک کرداریان لەگەڵدا دەکردم، دوای چەند ڕۆژێک گەڕانەوەم لە کرێکاری، بڕیارم دا لەگەڵ براکانمدا نەچمەوە بۆ ئەسکەندەریە، ڕۆژێک لەو ڕۆژانە، ڕێگەی گوندی تەل عومەرم گرتە بەر و لەوێوە چووم بۆ شاری ئەسیوط، لە ئەسیوط، سواری شەمەندەفەر بووم بۆ قاهیرە، بۆ دوایین جار هەموویانم بۆ هەتاهەتایە بەجێ هێشت.'

'بەڕاست، یانی تا ئەمڕۆیش، هیچکام لە کەسوکارت نەدیونەتەوە؟'

'نەخێر، ئەو ساڵانەی لە قاهیرە ژیام، بەردەوام چاوم بۆ دایکم دەگێڕا، بەڵام بەداخەوە، نەمبینییەوە، خوای گەورە ئاگای لێیە، ڕۆژێک بەسەرمدا تێنەپەڕیوە، بیر لە باوکم و دایکم و بەتایبەتییش فاتمە نەکەمەوە.'

'ئەی دێهاتییەکی وەکوو تۆ، چۆن بەتەنیا ژیانت گوزەراند، لە شارێکی گەورەی وەک قاهیرەدا؟'

'زیاتر لە سێ ساڵ، وەکوو منداڵ، شەوانە دەگریام و دەکڕووزامەوە، ئەوەندە غەریبیی ماڵە کۆنەکەمانم دەکرد، بەردەوام هەستم دەکرد نەخۆشم و دەوای دەردم تەنها گەڕانەوەمە بۆ ناو کەسوکارم و ماڵە کۆنەکەمان، هەر ئەوەیش بووە هۆی ئەوەی بە ماددەی هۆشبەرەوە گیرۆدە ببم.'

'بەڕاست؟'

'بەڵێ، چەندین ساڵ تەواو لە ژیان بێ هیوا بووبووم، بەڵام بە هۆی چەند کەسێکەوە، کە لەسەر شەقامەکانی قاهیرە بووبوون بە

هاوڕێم، توانیم جێگە و کارم دەست بکەوێت و واز لەو بەڵایە بهێنم، لەدوای ئەو کارەمەوە، کە پاککردنەوەی یانەیەکی شەوانە بوو، بەداخەوە، تەنها سێ مانگێکی خایاند، پاشان دیسان بێکار و بێجێگە مامەوە، چونکە ئەو دوو هاوڕێیەم، کە جێگەیان کردمەوە و کاریان بۆ دۆزیمەوە، ناویان دەر چوو بۆ سەفەر و چوون بۆ سعودیە بۆ کرێکاری، دوای ڕۆیشتنی ئەوان، منیش چاوم لێ کردن و لە زۆربەی نووسینگەکانی قاهیرە، ناوی خۆم بۆ سەفەر تۆمار کرد، بەڵام هەرگیز ناوم نەهاتەوە، زۆری پێ نەچوو بوومە هاوڕێی ئادەم، خاوەنی ئەم چاویلکەیەم، لای خۆی جێگەی کردمەوە و فێری نووسین و خوێندنەوەیشی کردم، پێشتر بۆم باس کردیت، لە ڕاستیدا هەر ئەویش ڕێنمایی کردم خۆم فێری زمانی ئینگلیزی بکەم و کاری ڕێبەری، بۆ ئەو بێگانانەی دێنە قاهیرە، بکەم، ئادەم کەسێکی زۆر لێزان و زیرەک بوو، بەڕاستی زۆر شتی لێوە فێر بووم.'

سەلیم سەری داخست و دەموچاوی نایە نێوان هەردوو ئەژنۆکانیەوە، پاش تاوێک بێدەنگی، دەستی کرد بە گریانێک، کە هەموو گیانی پێوەی دەلەرزی، بە جۆرێک، لەسەر قەرەوێڵەکە بەر بووەوە و ئەژنۆکانی داهێشتنە سەر زەوییەکە، ئەوەندە بەقووڵی دەگریا، هەناسەی لەسەر سنگیدا توند دەبوو، بەدەم گریانەوە، زووزوو قووڵ دەکۆکی، وەکوو بڵێی ئازارێکی سەختی هەبێت، بەردەوام دەستی بەسەر سنگ و شانەکانیدا دەهێنا، ئەو دیمەنە کاری تێ کردبووم و ماسولکەکانی لەشم گرژ بووبوو، لە ناخمەوە بێزارییەک شەپۆلی تووڕەبوونێکی بۆ ڕوخسارم دەهێنا،

بێ ئەوەی هەستی پێ بکەم بینیم دڵۆپی چەند فرمێسکێکم بەسەر ڕوومەتەکانمدا غل بوونە خوارەوە، دانەویمەوە بەسەر سەلیمدا و دەستێکم بە شانیدا هێنا، نەمتوانی بەدیار سەلیموە ڕابمێنم، هەستام و لەژێر دۆشەکی جێگەکەمدا کەرەستەی نیگارکێشییەکەم دەرهێنا، کە تەنها چەند لەتە خشتێکی سوور و زەرد بوو، چوومە بەرامبەر پۆرترێتەکەی فاتمە و دەستم کرد بە تۆخکردنەوەی هێڵەکانی. من لە سەلیم بێئاگا مابووم و سەرنجم لەسەر هێڵە شێوێندراوەکانی دەموچاوی فاتمە ڕاگرتبوو، بە دەستێک توند شانی گوشیم و وتی، 'وامەکە.'

بێ ئەوەی ئاوڕی لێ بدەمەوە، لەبەر خۆمەوە وتم، 'بۆچی نا؟'

دیسان سەرشانی گوشیم و توند وەری گێڕام بەلای خۆیدا، بە توورەییەوە نەڕاندی بەسەرمدا، 'حرام علیک، بە ڕەوای نابینم، تێدەگەیت لێم، لەبەر خاتری خوا و ڕۆحیانەتی فاتمە.'

'ئەوەندە ترسی ئەو خوایەت لە دڵدایە، هیچ شتێک بە خۆت ڕەوا نابینیت.'

چاوی لێ زیت کردمەوە و ئارەق لە ڕووی دەچۆڕا، زووزوو لێوی دەگەست و دەستی خۆی دەگووشی، هەموو گیانی لە عەزرەتدا دەلەرزی، چەند جارێک شانی هەڵتەکاند، بێ ئەوەی بتوانێت هیچ بڵێت، پاڵێکی پێوە نام و وەلاوەی نام، لەپی دەستی بە ڕقەوە هێنا بە ڕوخساری پۆرترێتەکەی فاتمەدا، پاش ئەوەی تەواو دیسان شیواندی. چاوە تەڕەکانی داخست و بە کووڕەکووڕ خۆی گەیاندە سەر قەرەوێڵەکە و ڕاکشا و بێدەنگ خۆی گرمۆڵە کرد.

هێزی توورەبوونێک لە ناخمدا، هەموو گیانمیان بە گەرمی ئارەقی

خۆی خوساند، تاوێک لەنێوان سەلیم و پۆرترێتەکەی فاتمەدا وشک ڕاوەستام، دەمویست تێبگەم، پرسیاری زۆرم لە سەلیم هەبوو، بەڵام ئەو ئەوەندە تێکشکاو و زەلیل دیار بوو، نەمتوانی، وشەیەک چییە، ڕووبەڕووی بیدرکێنم.

لە کاتێکدا لەولای پۆرترێتەکەی فاتمەوە دەستم کرد بە کێشانی نیگارێکی نوێ، چاوێکم هەر لەسەر دەم و چاوە شێوێندراوەکەی فاتمە بوو، نیگاری سروشتێکم لە خەیاڵدا بوو، سروشتێک، کە ڕۆحم ئاشنا بوو بە ڕەنگ و فۆرم و هێڵەکانی، پێشتر بیرۆکەی وام بە خەیاڵدا نەهاتبوو و کارم لەسەر نەکردبوو، هونەر نەبوو بەلامەوە، وێنەی سروشتێک، هاوشیوەی خۆی، دووبارە بکەمە، بە هونەرم دەزانی، ڕەنگ و پارچەکانی ئەو سروشتە بکەم بە کەرەستەی کارەکانم و بە توانای خەیاڵم تێکەڵیان بکەم.

دایکم هەموو جارێک دەی وت، 'کاتێک دەست دەکەم بە کارێکی نوێم، دەمەوێت ئەوەندە وزەی تێدا بەکار ببەم، تا تەواو خۆم لە وزە، لە خەیاڵ بەتاڵ بکەمەوە، بە جۆرێک، کە بێهێز و کەنەفت لە بەردەمی کارەکەمدا بکەوم، هەتا ڕۆژی دواییش، بێئاگا بم لەوەی ئاخۆ ڕۆژی پێشوم چیم کردووە و چ تابلۆێکم کێشاوە.'

ئەوسا ئەوەندە غەریبیی ئەو سروشتەی هۆڵەندام دەکرد، ڕێگر بوو لەبەر تواناکانی خەیاڵمدا، هەر بۆیە نیگاری ئەو سروشتە، وەکوو خۆی لە ئازارەکانی ئەو، سامیان لە بەندیخانەکەم دەکردەوە.

ئەو پاش نیوەڕۆیە، سەلیم لەسەر جێگەکەی، بەدەم گریان و هەنسک هەڵکێشانەوە، خەوی لێ کەوت، لە دەماوەدەمی ئەو ئێوارەیەدا، نیگاری سروشتی هۆڵەندام تەواو کرد، تاوێک بوو

بێدەنگ بەرامبەری ڕامابووم، بە خەیاڵ بەناویدا پیاسەم دەکرد، دەنگی سەلیم لە خەیاڵەکەمی دابڕیم و گێڕامیەوە بۆ ناو ژووری زیندانەکە، نەختێ خاو بووبۆوە، تامی دەمی کەمێ گۆڕابوو، لەسەرخۆ وتی، 'مارتن، زۆر بەلامەوە جوانە.'

سەلیم لەسەر قەرەوێڵەکەوە هاتبووە سەر ئەژنۆکانی و سەرسام لە نیگارەکەمی دەڕوانی، پاش ئەوەی هات و لەلای شانمەوە ڕاوەستا، لێی پرسیم، 'بۆ ڕەنگی لە بیابان دەچێت؟'

'ئەوە هۆڵەندایە، ڕاست دەکەیت، ڕەنگی بیابانی گرتووە، بۆ زانیاریت، سەلیم، ڕووناکی خولقێنەری ڕەنگەکانە، ئەو ڕووناکی و بەهێزیی تیشکی خۆرەی لێرە هەیە، کاریکی وای کردووە، کە ئەو دیمەنی هۆڵەندایەی من کێشاومە، هاوشێوەی بیابان بێت، هەوڵ بدە خۆت بە خەیاڵ فۆرم و هێڵەکانی ڕەنگ بکە.'

'چ ڕەنگێک؟'

'هەر ڕەنگێک بێت، کە خۆت بەلاتەوە جوان بێت، دەزانیت سەلیم، تیشکی خۆر کاتێک لەو پەنجەرەیەوە دەدات لە ڕووی ئەو دیوارە، بۆ نموونە، ڕەنگی ئەو بیابانەم زەردباو کردووە، ئەوە خۆی لە بنەڕەتدا هەموو ڕەنگێکی تێدایە، جگە لە ڕەنگی زەرد، بەڵام شەوقی ڕەنگی زەرد دەداتەوە و ئێمە وەکوو زەرد دەیبینین، بێگومان کاریگەریی تیشکی خۆر و ڕووناکی، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگۆڕێت، هەر بۆیە ڕەنگەکانیش گۆڕانکارییان بەسەردا دێت، دەزانیت سەلیم، لە دوو سەد ساڵی ڕابردوودا، زۆرێک لە هونەرمەندە شێوەکارەکانی ئەورووپا، بەتایبەتی لە وڵاتانی ترەوە بۆ نیگارکێشان هاتوون بۆ هۆڵەندا، چونکە ڕووناکی و تیشکی خۆر زۆر تایبەت دەیگرێتەوە و ڕەنگەکان

جیاوازتر دەنوێنن و گونجاوە بۆ ئەو مەبەستە.'

'ڕەنگ هەر ڕەنگە و ڕەنگی ئەو دنیایەیە، کە خوای گەورە خولقاندوویەتی، هەر ئەو خوایەیش دوو چاوی بە من بەخشیوە، کە بیانبینم.'

'کام چاو؟ ئەگەر ئەو چاویلکەیەی ئادەم نەبووایە تۆ نەک ڕەنگ، بەڵکوو ئەو دنیایەیش کە خواکەت بۆی خولقاندووین، نەتدەبینی.'

'نا نا، نەفام، خۆ من کوێر نیم.'

سەرم بۆ لەقاند و بە پێکەنینێکەوە لێم ڕوانی، سەلیم پرسیی، 'مارتن، لە کێوە فێری نیگارکێشان بوویت؟'

'لە دایکمەوە.'

'بەڕاست، دایکت؟'

'بەڵێ، دایکم هونەرمەندی شێوەکارە.'

'ئەی باوکت.'

'باوکم، من تەنها کوڕی دایکمم.'

'تێناگەم، یانی باوکی خۆتت نەبینیوە، مردووە، یان، چۆن؟'

'گوێ بگرە سەلیم، ئەوە تۆ چەندین جار پرسیاری باوکمت لێ کردم، نازانم چۆنت بۆ باس بکەم، کاتی خۆی لە تاقیگەیەک، لە نەخۆشخانەی شاری ئەمستردام، چەند دڵۆپێک شەهوەت لە مندالانی دایکمدا دەنێژن، بەو شێوەیە دووگیان دەبێت و پاش نۆ مانگ، منی دەبێت، خۆیشی نازانێت ئەو شەهوەتە لە کام پیاو گیراوە.'

سەلیم چاویلکەکەی لە چاوی داکەند و دەستێکی بە دەموچاویدا هێنا و بە سەرسامییەکەوە وتی، 'خوای گەورە تۆبە، باوەڕ ناکەم بەراستت بێت، تۆ یاری بە ئەقڵی من دەکەیت.'

'بەڵێ، بەڕاستمە، بەو شێوەیە بووە، هەڵبەتە ئەوەیش هەڵبژارنی دایکم بووە، نەک من، بەڵام هەردەم ئەو مافەم بەو ڕەوا بینیوە و هەرگیز سەرزەنشتم نەکردووە، ئەوسا کە منداڵ بووم، پرسیارم زۆر لێ دەکرد، پاشان کە گەورە بووم، تێگەیشتم.'

'یانی، یانی تۆ، بمبوورە کە وا دەڵێم، یانی تۆ زۆڵیت؟'

'زۆڵ، زۆڵ، چەند وشەیەکی بێمانایە...'

١٥

## برسێتی

لەنێوان شیشە ژەنگاوییەکانەوە، کە دیمەنی بیابانەکەیان لە پێشچاوماندا لەتلەت دەکرد و بێباکانە ڕێگەشیان بە بای شەوانیش دەدا بەئاسانی ژووری زیندانەکە پڕ بکەن لە سەرما و شنێی خۆیان، لەگەڵ سەلیم بێهیوا و برسی، بێدەنگ لێی کەوتبووین.

چەند مانگێک بوو، زۆر کەم خۆراکیان پێ دەداین و بەلوعەی ژوورەکەیشمان ڕۆژ نا ڕۆژێک تەنها یەک کاتژمێر ئاوی پێدا دەهات، دەمبینی چۆن جەستەمان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دادەڕزا. پۆلیسەکان بەدەگمەن سەردانیان دەکردین، هێندەیان خۆراک پێ دەداین، کە نەمرین، بەڵام هەموو شەو و ڕۆژێک، مردنمان بە چاوی خۆمان دەبینی، برسێتی بە جۆرێک کاری تێ کردبووین، هاوشیوەی ئاژەڵێک بیرمان دەکردەوە، زۆر جار بەگاگۆڵکێ بە زەویی ژوورەکەدا لە وردەنان دەگەڕاین، هەستی بۆنکردنمان ئەوەندە تیژ بووبوو، دەمانزانی لە باڵاخانەی بەندیخانەکەدا چ

خۆراکێک دەخورێت، بە چاوی کراوەوە خەونمان بە خواردنەوە دەبینی و لەگەڵ سەلیم، تەنیا باسی چێژی خوادنمان دەکرد.

لە برساندا ماسوولکەکانمان پووکابوونەوە و ڕاستەوخۆ پێستمان بە ئێسقانەکانمانەوە نووسابوو، لە بێ ڤیتامینیدا، فۆرمی لەشمان تێک چووبوو، قژمان دەرووتایەوە، ددانەکانم دەئێشان و پووکم ئەوەندە ئاوسابوو بە بەردەوامی ناو دەممیان پڕ دەکرد لە خوێن و زەرداوی خۆیان، هێزی ئەوەم تێدا نەبوو بتوانم بۆ سەر جێگەکەم سەر بکەوم، لەتەنیشت سەلیمەوە لێی کەوتبووم، لەو ڕۆژانەدا، دوو پۆلیس لە دەمەوبەیانیدا لەخەو ڕایان پەڕاندم، هێشتا چاوم هەڵ نەبڕیبوو، کە ئەوان بە جووت باڵەکانیان توند گرتبووم، بەدوای خۆیان، بە زەوییەکەدا بۆ دەرەوەی ژووری زیندانەکە کێشیان کردم، ئەژنۆم لە زەوییەکە دەخشا، بێ ئەوەی هەست بە ئازاریان بکەم، بردمیانە ژوورێک و لەسەر کورسییەک دایان نام، ژوورەکە مێزێک و کورسییەکی تریشی تێدا بوو، خۆم لەسەر کورسییەکە بۆ ڕاگیر نەدەکرا، ناچار بووم پاڵ بدەمەوە و خۆمی لێ درێژ بکەم و سەرم بنێمە سەر قەراغی پشتەوەی کورسییەکە.

پاش تاوێک بێدەنگی، یەکێک لە پۆلیسەکان لەپشتمەوە و ئەوی تریان بەرامبەرم ڕاوەستابوو، پۆلیسەکان دەستیان کرد بە قسەکردن لەگەڵ یەکتردا، هەر چەند هەناسەیەکی پێ چوو، کابرایەکی درێژی ڕەقەڵەی سەر سپیی سمێ ڵبۆزی لوت زل، کە سەیری دەموچاویم دەکرد، لەپێشدا لووتیم دەبینی، خۆی کرد بە ژووردا و هاتە بەرامبەرم و ڕاوەستا، بە ئینگلیزییەکی ڕەوان لێی پرسیم، 'چییە، چی ڕووی داوە، بۆ نەساغیت؟'

بە بێزارییەکەوە لێم ڕوانی و پێم وت، 'وام زانی بۆ لێپێچینەوە منتان بۆ ئێرە هێناوە، نەساغیکەیشم، ئەوە خۆتان هۆکارین.'
پێش ئەوەی وەڵامم بداتەوە، هەردوو پۆلیسەکەی کردە دەرەوە و دەرگای ژوورەکەی داخست، خۆی بە سەرما نوشتانەوە و بە دەنگێکی نزم، 'من لە پۆلیس و ئەفسەری لێپێچینەوە دەچم، ئەی کوێریت ئەو چاکەتە سپییەی بەرم نابینیت، من پزیشکم، پزیشک، هەی بێمێشک.'
پێش ئەوەی وەڵامی بدەمەوە، شانی گرتم و لەسەر کورسییەکەم ڕاستی کردمەوە، چاکەتە شین و چڵکنەکەی لەبەرمدا داماڵی، گوێگری پزیشکییەکەی کردە گوێی و دەستێکی بە سنگمەوە و بە دەستەکەی تری، کە گوێگرەکەی لەناو بوو، لە ڕاست و چەپی پشتمی خشاند و دانا، داوای لێ کردم پڕ بە سییەکانم هەناسە هەڵبمژم و هەناسە بدەمەوە، لە کاتێکدا لە پشکنینم تەواو بوو، چاکەتەکەی لەبەر کردمەوە و لەبەر خۆیەوە پرسیی، 'دەزانیت تۆ لەکوێیت؟'
'بەڵێ، لە کاولەیەک، بە ناوی وڵاتی میسر.'
'نەخێر، تۆ بە هەڵەدا چوویت، وڵاتی میسر بوونی نییە، باشتر وایە بڵێیت، بەندینخانەیەک لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لە مەبەستم تێدەگەیت؟'
'نەخێر.'
'دەزانیت، ئێمە هێندەی خۆمان بە عەرەب دەزانین، نیوەهێندە سۆزمان بۆ بە میسریبوونی خۆمان نییە، ئەوەیش کێشەی هەموو دانیشتووانی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و دونیای عەرەبییە، پانتاییەکی بەرفراوانمان لەسەر ئەم گۆی زەوییە داگیر کردووە،

پانتاییەک، کە مرۆڤەکان تەنها بۆ مردن تیایدا دەژین، نەک بۆ ژیان، ئەو ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستەی ئازای ئەندامی جەستەی پڕیەتی لە ئازاری ئەو جەنگە پیرۆزانەی هەزاران ساڵە، بگرە تاکوو ئەمڕۆیش، هەر بەردەوامن.'

تاوێک بێدەنگ بەرامبەرم ڕاوەستابوو و لێی دەڕوانیم، لەناو چەکمەجەی مێزەکەیدا، بوتڵێک ئاوی دەرهێنا، کورسیی پشتی مێزەکەی هێنا و لەبەرامبەرم دانیشت، لە گیرفانێکیدا، چنگێک حەبی زەردباوی دەرهێنا و دەستی بەرەو ڕووم ڕاگرت، ئینجا بە دەستەکەی تریشی، بوتڵە ئاوەکەی دامێ و بە ڕووخۆشییەکەوە وتی، 'ئەو حەبانە بگرە، حەبی ڤیتامینن، ئێستا دانەیەکیان بخۆ و ئەوانی دیکە قاییم هەڵگرە.'

کاتێک بوتڵە ئاوەکە و حەبەکانم لێ وەر گرت، بێ ترس و دوودڵی، دەنکێک حەبم لەنێو دەمم نا و دوو قومم لە ئاوەکە دا، ئاوەکە خوێن و لینجاوی ناو دەم و قوڕگمی لەگەڵ حەبەکەدا بۆ ناو گەدەم ڕاماڵی، ماسوولکەکانم دەستیان کرد بە لەرزین، لە کاتێکدا جارێ هەستەکانم مەستی چێژی ئاوەکە بوو، پزیشکەکە لێی پرسیم، 'ئایا پێیان وتوویت بە چ تاوانێک بەند کراویت؟'

شانم لێ هەڵتەکاندن و نەمدەزانی چ وەلامێکی بدەمەوە، ئەو دیسان وتی، 'تۆ بە بڕیاری دادگای باڵای قاهیرە بەند کراویت، لە کاتی بڕیاردانی دادوەریشدا، خۆت ئامادە بوویت، یانی چی دەڵێیت نازانم؟'

'بەڵێ، بۆ دادگایەکیان بردم، بەلام نازانم کام دادگا بوو، لەو بە ناو دادگایەیش، هەموو لێدوانەکان بە زمانی عەرەبی بوو.'

'بۆ تۆ و ئەوانەی لە هاوڕەگەزی تۆن، لە یاسای میسردا دوو

شێوە سزاتان پێ دەبڕێت، یان هەڵواسین، یان زیندانی هەتاهەتایی.'

'هاوڕەگەزی من؟ هۆڵەندیت مەبەستە؟ بۆ...'

'بە هەرحاڵ، تۆ بە دوو تاوان سزا دراویت، یەکەم، سەر بە دەزگای نهێنیی مۆسادی ئیسرائیلیت، دووهەم، فەلەستینییەکت کوشتووە.'

سەرم ئەوەندە قورس بووبوو، ملم توانای ڕاگرتنیم نەمابوو، پێڵووی چاوم، بێ ویستی خۆم بەری بینینمیان دەگرت، دەمویست وەڵامی بدەمەوە، بەڵام بیرم کردەوە، کە پێشتر ئەوانەم هەموو بیستبوو، بەڵکو تەنها داواکارییەکم هەیە، ئەویش قونسوڵخانەی هۆڵەندام بۆ ئاگادار بکاتەوە، بەوەی من لێرەم، بەڵام نازانم بۆ ڕام گۆڕی، بە ساردییەکەوە پێم وت، 'نازانم باسی چی دەکەیت.'

هەستایە سەر پێ و بەرامبەرم دەستی کرد بە گەڕان، لەبەر خۆیەوە وتی، 'من، لە ساڵی ١٩٦٦دا، وەکوو سەربازی برینپێچ، لە جەنگی دژی جوولەکە بەشدار بووم.'

لەپڕێکدا قسەکانی بڕی و بەرەو ڕووم هات، لەپێشمدا نوشتایەوە و بە تووڕەییەوە قۆپچەی چاکەتە سپییەکەی ترازاند و سنگی لێ ڕووت کرد، تاڵی تووکە لوول و سپییەکەی سەر سنگی، کە لە قژی سەری درێژتر و چڕتر بوو، بە سەری پەنجەکانی تاڵە مووەکانی لا دان و لەسەر تەختی لای ڕاستی سنگی، ئاسەواری برینێکی کۆنی نیشان دام و وتی، 'سەیر بکە، سەیر بکە، ئەوەتا، دەیبینیت، ئەوە ئاسەواری گوللەی تفەنگی جوولەکەیە، ئەوسا من وەکوو شێر، هەر وەکوو شێر، لەو جەنگەدا بەشدار بووم، گیان لەسەر دەست بە خوێنم بەرگریم لە نیشتمانەکەم کرد، بە داخەوە،

ئـەو جەنگـەمان بـە جوولەكـە دۆڕانـد. دەزانیـت بـۆچی دۆڕایـن؟ چونكـە زۆرینـەمان، تێدەگـەیت لـێم؟ زۆرینـەمان نـەهاتبووین بـۆ ئـەوەی بـەرگری لـە میسـر بكـەین، نـەخێر، بـەڵكو زۆرینـەمان هـاتبووین بـۆ جیهـاد، جیـاوان، زۆر جیـاواز لـە مـن و هـاوبیرانم، ئەوان هاتبوون تا لەو جەنگە پیرۆزەدا بەشدار ببن، هاتبوون بۆ ئـەوەی بكـوژرێن بـە دەسـتی جوولەكـە، تـاوەكوو بەهەشـت بـە خوێنیـان بكـڕن، ئـەو نامرۆڤانـەی هـیچ هیوایـەكیان بـە ژیـان، بـە مرۆڤایـەتی، بـە وڵات نییـە، بـەڵكوو هـەموو كـار و كردەوەكیـان لەپێنـاوی پـاش مردنیانـە، پاشـەڕۆژ، پاشـەڕۆژ، وەكوو خۆیشـیان زۆر دڵنیـا بن لێی، ئەوانـە، مـن نـاوم لـێ نـاون بەهەشـت دزەكان، تێدەگـەیت لـێم، بەهەشـت دزەكـان، ئـەوان هۆكـار بـوون كـە ئێمـە چەندین جار بە جوولەكە دۆڕاین.'
پاش ئەوەی هاتەوە بەرامبەرم و لەسەر كورسییەكەی دانیشتەوە، بـەردەوام بـوو، 'كاتێك قوتـابی بووم، لـە هـەموو سـەرهەڵدانەكانی ئەوسادا بەشدار بووم، زیاتر وەكوو كەسێكی ڕۆشنبیری لیبراڵ، خەونم بە میسرێكی سەربەخۆی دیموكراتـەوە دەبینی، بـاوەڕ بكـە، ئێمـە هـەموو سـەرهەڵدانەكانمان جۆش دا، ئێمـە دەنـگ و ڕەنـگ و هێـزی ئـەو سـەرهەڵدانانە بـووین، سـەرەنجام، چەنـد دەسـتە و كەسـێك بـە خواسـتی خۆیـان مانـای ڕاسـتەقینەی شـۆڕش و سەرهەڵدانەكانیان گۆڕی و لە چوارچێوە گرت، هـەر لـە سـەرەتاوە جمال عبد الناصر خۆی بەتەنها هەموو بڕیارەكانی دا و ئەو ڕێگر بـوو لـە بـەردەم پـەیڕەوكردنی دیموكراتیدا، بە پیرۆزكردنی ناسر لەبەرامبـەر ئـەو سـەركەوتنانەی بەدەسـتی هێنـابوون، زۆر گـران لەسەر ئێمەی خەڵكی میسر كەوت، ئەگەر لـە سـەرەتای شۆڕشی

ساڵی ١٩٥٢دا حورمەتی دیموکراتیی تێدا بپارێزرایە، ئەوا کەسی شیاو لە جێگە و پۆستی شیاودا دادەنران، مەبەستم، ئەگەر سیاسییە بەتواناکانی پارتە جیاوازەکانی ئەوسا بێکار نەکرانایە و لە بەڕێوەبردنی وڵاتدا بەختیان بەر بکەوتایە، چونکە ئەو سیاسییانە دەستیان هەبوو لە سەرکەوتنی شۆڕشدا، ئەگەر ئێستا لە سەرئەنجامی ئەو شۆڕشە بڕوانین، ئەوا تێدەگەین ئەوسا جمال عبد الناصر چ ناهەقییەکی بەرامبەر بە گەلی میسر کرد.'

زیاتر لە کاتژمێرێک پزیشکەکە قسەی بۆ کردم، برسێتی و بێهێزیم بە جۆرێک بە خۆیانەوە خەریکیان کردبووم، زووزوو ئاگام لە قسەکانی ئەو نەدەما و نەمدەتوانی بەردەوام گوێیان لێ بگرم، هەرچەندە هەوڵم دەدا چاوم کراوە بێ و بێوچان لێی بڕوانم و جارجاریش سەرمی بۆ بلەقێنم، ئەوەی زیاتر لە خەیاڵمدا مابێت، لە کۆتاییدا وتی، 'دەمێکە چاوەڕوانی ڕۆژێکی وەکوو ئەمڕۆم، ڕۆژێک، کە هەموو گەلی میسر بە یەک دەنگ هاوار بکات ئیتر بەسە، ئەمڕۆ لە سەرجەم شارەکان، بەتایبەتی لە قاهیرە، زیاتر لە ملیۆنێک کەس دژی دەسەڵات، دژی سیاسەتی دەسەڵاتێکی چەقبەستووی دیکتاتۆری ڕۆژهەڵاتی، ڕژاونەتە سەر شەقامەکان، خۆپیشاندەران مانیان گرتووە و بوێرانە داوای گۆڕینی دەسەڵات دەکەن، دوای شەست ساڵ، ئەوە بۆ یەکەمین جارە، گەلی میسر، هەشتا ملیۆن مرۆڤ، دوای شەست ساڵ، لە نیوسەدە زیاتر بێدەنگی و قبوڵکردنی هەژاری و ژێردەستەیی، دەنگی لێوە بێت و داوای مافەکانی خۆی بکات، شەست ساڵ، تەمەنێکە!'

زووزوو بە قوڵی چاکەتەکەی ئارەقی ناوچەوانی دەسڕی، دەنگی

گۆڕا و تاوێک پشتی تێ کردم و چەند جارێک بە دەستی دەموچاوی هەڵگلۆفت، زۆری پێ چوو، تاوەکوو بەسەر خۆیدا زاڵ بوو، بە دەموچاوێکی تەڕەوە ئاوڕی لێ دامەوە و لێی پرسیم، 'پێم بڵێ، سەلیم چۆنە؟'

'تاوەکو منیشتان هێنا بۆ ئێرە، مابوو!'

'مردن بەو ناوێرێت، خەمی سەلیمت نەبێت، پێش ئەوەی تۆ بێیت بۆ ئێرە و لەو ژوورەدا ببیت بە هاوەڵی، ئەو زیاتر لە بیست جارێک هەوڵی خۆکوشتنی دابوو، ئەوە ماوەیەکە بێدەنگە، من و ئەو، پاش ئەو هەموو ساڵەی پێکەوەژیان لەم کاولەیەدا، وەکوو دوو مارمێلکەی پیری ئەم بیابانەمان لێ هاتووە.'

بێحەوسەڵە لێم دەڕوانی، چەند جارێک ویستم قسەکانی پێ ببڕم و داوای لێ بکەم بمگەڕێننەوە بۆ ژوورەکەم، لەو کاتانەدا بە حەژمەتێک دەرگای ژوورەکە کرایەوە و بەڕێوەبەری بەندینخانەکە لەناو دەرگاکەوە بانگی لە پزیشکەکە کرد و پاشان بە پەلە پەل لێی دا ڕۆیشت، لەو کاتەدا کابرای پزیشک چەند وشەیەکی ئاراستەی پۆلیسەکان کرد، کە هێشتا لەودیو دەرگاکەوە ڕاوەستابوون، پۆلیسەکان بەدەم قسەکردنەوە، ئەملاولایان لێ گرتم و دەستیان نایە بنباڵم و بە نیوە هەڵگرتن و ڕاکێشان، گەیاندمانەوە ژوورەکەم، سەلیم لەودیو دەرگای ژوورەکەوە، وەکوو چاوەڕوانم بووبێت، قنج ڕاوەستابوو، یان وەکوو پیشەی هەمیشەیی، دەیزانی کەی پۆلیسەکان دەگەنە بەردەرگای ژوورەکەمان، پۆلیسەکان لەودیو دەرگاکەوە و لە بەرپێی سەلیمدا دایان نام و لێیان دا ڕۆیشتن، بە گاگۆڵکێ و سکەخشکێ خۆم گەیاندە سەر جێگەکەم، سەلیم چەند جارێک لەسەر یەک پرسیی،

'بۆ ئەوەندەت پێ چوو؟'

ئەوەندە لەسەر ئەو کورسییە ڕەقە دانیشتبووم، لەتاو ئازاری ئێسقانەکانی قنگم و پشتم، نەمدەزانی چۆن وەڵامی سەلیم بدەمەوە، بە بێزارییەکەوە وتم، 'ئەو پزیشکە ئەوەندە درێژ دادڕە.'

'ئەوە بە من مەڵێ، خۆم چاکی دەناسم، ئەو کافری بێدینە.'

دەستم کرد بەگیرفانی چاکەتەکەمدا و هەندێک لە حەبەکانم دەرهێنا، دەستم بەرەو ڕووی سەلیم ڕاگرت، پێم وت، 'پزیشکەکە ئەو حەبانەیشی دامێ.'

سەلیم بە دوو پەنجەی دەنکێکی لێ هەڵگرتن و خستیە دەمی و وتی، 'باوەڕ بکە مارتن، من لەوەتەی لێرەم، پێم وا بێت زیاتر لە دە کیلۆم لێ خواردووە، هەرجارێک دەچم بۆ لای ئەو سەگبابە، دوای چەند کاتژمێرێک چەنەبازی و قسەی قۆڕ، لە شێوەی باوکێکدا چنگێک لەو نوقڵانەیش دەکاتە گیرفانمەوە.'

'هەواڵیشتی پرسی.'

'وەک سەگ بتۆپێت، ئەو سەگبابی بێباوەڕەی منافقە.'

'باسی سەرهەڵدان و ئاڵۆزیی باری سیاسیی دەکرد.'

'لەکوێ، لە هۆڵەندا؟'

شانێکم دادایە سەر جێگەکە و خۆم وەر گێڕایە سەر لا، لەبەر خۆمەوە وتم، 'هۆڵەندای چی، لێرە، لە میسر.'

'سەرهەڵدانی چی، باوەڕ بەو کابرایە مەکە، ئەو بێمێشکە ئێستایش خەون بە پەنجا ساڵ لەمەوبەرەوە دەبینێت.'

'تۆ بڵێیت ئەم کەمتەرخەمییەی پۆلیسەکان، پەیوەندیی بەوەوە نەبێت.'

'الله أكبر، تەنها بە کاتژمێرێک و دوو دەنک حەب، چاک مێشکی

تێک داویت، ئەو بە هەزاران کاتژمێر چەنەی بۆ من داوە، یەک زەرە چییە کاری تێ نەکردووم. کەمتەرخەمیی پۆلیسەکانیش، ئەوە بە بڕیاری بەڕێوەبەرە، دیارە پارەی پێویستە، ئەو دزە.'

'کارتێکردنی چی، ئەوە تۆ باسی چی دەکەیت، باوەڕ بکە لە بێزاریی گیانی خۆمدا، گوێم لە نیوەی قسەکانیشی نەبوو.'

'باشتر.'

'لێشی پرسیم بۆ نەساغیت، چۆن ئەو زانیویەتی نەساغم.'

سەلیم سەیرێکی کردم و پێکەنی، 'من بە پۆلیسەکانم وت، کە تۆ لە سەرە مەرگدایت.'

سەیرێکی سەلیمم کرد و پێکەوە دامانە قاقای پێکەنین، ئەو ئێوارەیە، کاتێک پۆلیسێک خۆراکی بۆ هێناین، خۆراکەکە جیاواز و دوو هێندەی ڕۆژانی پێشوو دەبوو، لەگەڵ سەلیم، بێدەنگ لە یەکترمان دەڕوانی، ئەو شەوە وەکوو شتێکم بیر کەوتبێتەوە، دیسان گەڕامەوە سەر قسەی پزیشکەکە و لە سەلیمم پرسی، 'تۆ بڵێی ئەو پزیشکە ڕاست بکات، گوایا لە تەواوی میسر خۆپیشاندان بێت، وەکوو ئەوەی ئەو باسی لێوە دەکرد، زیاتر لە ملیۆنێک خۆپیشاندەر لە شاری قاهیرە مانیان گرتووە و داوای گۆڕینی دەسەڵات دەکەن.'

'دەزانیت چی، مارتن؟ تێرمان خواردووە و خەمی ورگمان نەماوە، بۆ دەمەتەقێ و کات بەسەربردنی ئەم شەومان، باسی ئەو پزیشکە سەگبابەیش خراپ نییە، لە بێدەنگی باشترە.'

'ئەگەر وا بێت، بەو شێوەی پزیشکەکە باسی لێوە دەکرد، یانی ئەگەری گۆڕینی دەسەڵات لە ئارادایە.'

'یا حبیبي، گوێ لە من بگرە، تکایە، تکایە، تکایە، ملیۆنێک

خۆپیشاندەر لەم وڵاتە، بە دوو پۆلیس بەریان پێ دەگیرێ و بە شەق بێت یان بە قسەی خۆش، ڕازییان دەکەن و دەیاننێرنەوە بۆ ماڵی خۆیان.'

لە چاوی سەلیمم ڕوانی، پێش ئەوەی من قسە بکەم، ئەو وتی،

'دەڵێم، مارتن، تۆ لە مردن دەترسییت؟'

'زۆریش.'

'یانی حەزت دەکرد نەمر بوویتایە؟'

'نەخێر، خواستی نەمری، ئەوپەڕی خۆپەرستییە، کە دەڵێم لە مردن دەترسم، مەبەستم ئەوەنییە، تەمەنا دەکەم ئەوەندە بژیم، تا چاوم بە چەند کەسێکم بکەوێتەوە.'

'مەبەستت دایکتە؟'

'بەڵێ، بەتایبەتی دایکم.'

لەمەوە بێدەگ بووین و هەریەکەمان بە ڕێگەی خۆی کەوتینە ناو گۆمی خەیاڵی ڕابردوومانەوە و تا خەومان لێ کەوت، یەکتریمان نەدواند.

## ١٦
# یاساغ

دەستبەسەرکردنم لەنێوان ئەو چوار دیوارەدا، بە جۆرێک وروژاندبوومی و کاری لە هەستەکانم کردبوو، شەوان خەونم بەو خۆراکانەوە دەبینی، کە ئەوسا دایکم لێی دەنان، ڕۆژانە ماتەمینی دای دەگرتم و وێنەی ناتەبا و غەریب بە ڕۆحم لە خەیاڵمدا دەر دەکەوتن، گوێم لە سروەی با بوو، پێش ئەوەی لە بیابانەکەوە هەڵبکات و نەسیمی خۆی بە ڕووی بالاخانەی بەندینخانەکەدا بدات، شەوانە وەک بزن کاوێژم دەکرد، بەو چێژانەوەی لە ڕابوردوومدا بەر زمانم کەوتبوون، بە خەیاڵ و لە خەونەکانمدا، لەگەڵ کارمن لەبەر ڕۆشنایی مانگدا بەڕووتی لە بیابانەکەدا لێک دەئالاین، لەدوای ڕەحەتبوونمان، بەدرێژایی شەو بێدەنگ لە ئەستێرەکانمان دەڕوانی. بەیانییانیش لە عەزرەت بۆنی شەهوەت و ئارەقی لەشم بەئاگا دەهاتمەوە، بە جۆرێک، ژووری زیندانەکەم پڕ دەکرد لە بۆن و بەرامی خەونەکانم.

بەبیرم دێت، سەلیم بەیانییەک لەو بەیانییانە بانگی کردم، 'چییە

مارتن، دیسان خەوی تەڕت بینیوە؟ بەڕاستی ئیرەییت پێ دەبەم، بەبیرم نایەت کەی بۆ دواجار خەونم بینیبێت.'

بەدرێژایی ئەو ڕۆژە، سەلیم لەسەر جێگەکەی پاڵ کەتبوو، لەبەر خۆیەوە گۆرانیی دڵتەنگی دەچڕی و جارجار هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشا.
پۆلیسەکان ئەو بەیانییە بۆ پشکنین نەهاتن، لەسەر جێگەکەم دانیشتبووم و لە پەنجەرەکەوە لە بیابانەکەم دەڕوانی، ئەوەندە هێزم تێدا نەبوو، تا بانگێک لە سەلیم بکەم و بەیانی باشێکی لێ بکەم.
لە بیرکردنەوەدا بووم، بەڵکوو کارێک بکەم ئەو بێدەنگییەی نێوانمان بشکێنم، ئەوەی لەو دەمەدا لێم دەڕوانی، دیمەنی دووبارە و چۆڵی بیابانەکە بوو، ئەو دیمەنەی پەنجەرەکە بووبوو بە چوارچێوە بۆی، هەمان دیمەنی ڕۆژەکانی پێشوو، ڕۆژانە بە خەیاڵ خۆم ڕەنگم پێ دەدا، ڕەنگێک، کە هەستی بینینم غەریبی دەکرد.
لەسەر جێگەکەی خۆمەوە بانگم لە سەلیم کرد، 'گوزەران چۆنە؟'
لە بەر خۆیەوە و بە دەنگێکی تێکشکاو، 'مفیش حاجة.'
وەڵامێک، سەلیم لەوپەڕی بێزاریدا لەگەڵ مندا بەکاری دەهێنا، دوای ئەوەی لەسەر قەرەوێڵەکە دابەزیمە خوار، بینیم سەلیم لەسەر دەم لێی کەوتبوو، چاویلکەکەی لەتەنیشتیەوە دانابوو، پاش ئەوەی لەلایەوە دانیشتم، لێم پرسی، 'ئەوە چییە؟'
بێ ئەوەی لێم بڕوانێت، لەبەر خۆیەوە، 'مارتن ئازارم زۆرە، لەجیاتی میز و گوو، خوێنم لەبەر دەڕوا، هەست دەکەم هەموو

ئەندامەکانی ناو لەشم دارِزاون و بوون بە خوێن، دەترسم دواساتی ژیانم بێت، ڕۆحم لە جەستەی ماندوو و دارِزاومدا بێزارە، ڕۆح کێشەکەم، ئیزرائیل، بەڕێوەیە بۆ لام.'

'ئەوە تۆ باسی چی دەکەیت، تەنها مێروولە دەتوانێت ئەو هەستەیان هەبێت، ئێمەی مرۆڤ ئەوەندە پەیوەندیمان لەگەڵ ڕۆحی خۆماندا بەهێز نییە، هەتا بزانین کەی دواساتی ڕۆح دەرچوونمانە لە جەستەمان. مێروولەکان پێش مردنیان، دەنگێک لە جەستەیانەوە دەر دەچێت، ئەوەیش مانای ئەوەیە ژیان تەواو، لە کاتی بیستنی ئەو دەنگەدا، جەنگاوەرەکان دێن و لاشەی ئەو مێروولەیە بۆ دەرەوەی شارەکەیان دەبەن.'

'هەی بەراز، ئازار کوشتمی، تۆ باسی چیم بۆ دەکەیت؟ مێروولەی چی و شتی چی!'

'باسی ئەوەت بۆ دەکەم، کە وەکوو مرۆڤ بیر بکەیتەوە و لە مانای مردن بڕوانیت.'

سەلیم بەدەم گریان و هەنسک هەڵکێشانەوە، 'دەترسم، زۆر دەترسم، کە لاو بووم، لە جەنجاڵیی کوچە و کۆڵانەکانی قاهیرەدا، خوا و ئیمانم لێ ون بوو! ئاخ، چۆن نەفامانە ئەم دونیا و ئەو دونیایشم لەدەست خۆم دا.'

'سەلیم، تۆ چاوەکانت پڕن لە ترس و گومان، باوەڕێکیش لە ترس و گومانەوە سەرچاوەی گرتبێت، درۆکردنە لەگەڵ خودی خۆتتدا، تۆ بێ ئەوەی باش بیری لێ بکەیتەوە، قسە و ڕەفتاری ئەوانی تر دەجوویتەوە، دەزانی چی سەلیم، دڵنیا بە من و تۆ و فیلێک و مێروولەیەک و بەکتریایەک، وەک یەک بەشمان پێ دەبڕێت و یەک خوامان هەیە، یەک پاشەڕۆژ چاوەڕوانمانە، ئەویش تەنها مردنە.'

سەلیم بەدەم گریانەوە لێم ڕاپەڕی و ڕاست بەرامبەرم هاتە سەر چۆک، بە تووڕەییەوە وتی، 'مارتن، نامەوێت گوێم لەو قسە بێمانایانەت بێت، دەمت دابخە و بێڕێزی مەنوێنە، هەی بەراز.'

دەستی بە قەراغی قەرەوێڵەکەوە گرت و لەپێشمدا چاکەتەکەی لەبەر خۆی داکەند و پانتۆڵەکەی تا سەر ئەژنۆکانی هێنایە خوار، لەبەر خۆیەوە وتی، 'سەیرێکم بۆ بکە، بزانە بۆ ئەوەندە ئازارم دێت و بەردەوام خوێنم لەبەر دەڕوات؟'

لە کونی پاشەڕۆیەوە و بەدرێژایی بڕبڕەی پشتی، تا سەر ناوشانی، بووبوو بە برین و خوێن و زەرداویان لێ دەچۆڕا، داوام لێ کرد لەسەر جێگەکەی لەسەر دەم ڕابکشێت، پارچەیەک سابوونی سەوزمان هەبوو، کە چەند مانگێک پێش ئەو ڕۆژە، سەلیم لە پزیشکەکەی وەر گرتبوو، ویستم سابوونەکە لەبەر بەلوعەکەدا تۆزێک تەڕ بکەم، بەڵام بەلوعەکە لە قوڕگی من و سەلیم وشکتر بوو، ئەوسا ئەوەم بەبیردا هات، کە میز چەندێک کاریگەریی لەسەر برین هەیە و پاکی دەکاتەوە، بەڵام سەلیم ئەوەی قبوڵ نەکرد، هەردووکمان چەند تفێکمان لە سابوونەکە کرد، پاشان لە برینەکەی سەلیمم هەڵسووی، بە قێز و بێزێکەوە، زووزوو هێڵنجم دەدا. تەڕایی هەردوو دیوی سابوونەکەم لە برینەکانی سەلیم هەڵسووین، لەو دەمەدا، لە دەنگی کردنەوەی دەرگاکە ڕاپەڕیم، چوار پۆلیس بە شپرزەییەوە خۆیان کرد بە ژووردا و ڕاستەوخۆ پەلاماریان داین و باڵبەستیان کردین، دیار بوو ئێمە بێئاگا بووین، پۆلیسەکان لە دەللاقەی سەر دەرگاکەوە، تاوێک بوو لێیان ڕوانیبووین.

ئەو ڕۆژە، بەڕووتی لە ژوورێکی تاکەکەسی کرام، پێم وا بێت

سەلیمیش هەمان دەردی منی لێ بەسەر هات.
ژوورێک، کە پانتاییەکەی تەنها مەترێک دووجا بوو، یەکپارچە بۆیاخی ڕەش کرابوو، بێ پەنجەرە، ئەوەی تۆزێک هەوای بەو ژوورە تەنگەبەرە دەدا، تەنها ژێر دەرگا ئاسنەکە بوو، هەر لە ڕێوە بۆنی پاشەڕۆ سنگیان گرتم، سەتڵێکی ڕەش لە سووچێکەوە دانرابوو، پڕ بوو لە پاشەڕۆ، بە بەرزیی زیاتر لە شەش مەترێکەوە، گڵۆپێکی ڕەشتاڵە دەگڕا، کە ئەویش بەر شەپۆلی ڕەنگی ڕەش کەوتبوو، سنووری ڕووناکییەکەی چەند مەترێک تێپەڕیان نەدەکرد، دوو ڕۆژ لەو ژوورەدا مامەوە، لەو دوو ڕۆژەدا، یەک جار چاوم لێک نا و خەوم لێ کەوت، کاتێک بەخەبەر هاتمەوە، بە چواردەوری خۆمدا پەلەقاژێم بوو، دەستم دەکوتا، هەستم دەکرد لە هەوادام، هەموو گیانم نیشتبووە سەر ئارەق و هەناسەم توند بووبوو، هەستم بە سییەکانم دەکرد، کە چۆن لەسەر سنگمدا هەڵئاوسابوون، خێرا دەم و لووتم بە درزی ژێر دەرگاکەوە نا و چەند قومێک هەوام هەڵمژی، لە خەیاڵی خۆمدا وتم، 'ئەمە ئەو ژوورە تاکەکەسییانەن، کە سەلیم باسی لێوە دەکرد.'
یەکەمین جارم بوو ڕێگەم تێیان بکەوێت، بەڵام سەلیم سەدان شەو و ڕۆژی تێیاندا بەسەر بردبوون.
کاتێک پۆلیسەکان بردمیانەوە بۆ ژوورەکەی خۆم، چاوم هێندە ئازاری دەهات، تەنها گڵۆپی ژووری زیندانە تاکەکەسییەکەم دەبینی، دوو ڕۆژێکی پێ چوو، تاوەکوو بەرچاوم ڕووناک بووەوە و توانیم بەرپێی خۆم ببینم. لەو ڕۆژانەدا، کوڕێکی لاوی چاکەت و پانتۆڵ لەبەری ڕێکپۆش، لەگەڵ دوو پۆلیس خۆیان بە

ژوورەکەمدا کرد، نە سلاوی لێ کردم و نە خۆی پێ ناساندم، ئەوەندە لێم هاتبووە پێشەوە، هالاوی گەرمی هەناسەی دەیدا بە ڕوومدا، چاوی دابچڕی و بە دەنگێکی بەرز و بە زمانی ئینگلیزی پێی وتم، 'نێربازی، ڕەفتاری وا قێزەون لێرە وەکوو تاوان دەبینرێت، لە ڕۆژانی داهاتوودا، لێپێچینەوەتان لەگەڵدا دەکرێت، تۆ مارتن سەلەمۆ، لەگەڵ سەلیم عومەر، سزای گران دەدرێن.'

## ١٧

# ماڵی خەونەکانم

دەستم لە دەستی دایکم هەڵپێکابوو، لەسەر کەناری دەریا، پێکەوە بە پێی پەتی پیاسەمان دەکرد، شەپۆلی ئاوەکە تاوتاو تەڕایی خۆی بە ڕووی پێیەکانماندا دەدا، شنەبایەکیش هاڵاو و گەرمی و سوێراوی لە دەریاکەوە دەهێنا و دەیدا بە ڕووماندا، دایکم نەیدواندم و منیش مەست و سەرسام بووم بەوەی دەستم لەناو دەستیدا بوو، بێدەنگ لەتەنیشتیەوە دەڕۆیشتم.

کاتێک لەو خەوەم بەئاگا هاتمەوە، هەستم بە گەرمی و بۆنی میز دەکرد، کاتێ چاوم هەڵبڕی، بینیم سێ پۆلیس بەسەرمەوە ڕاوەستابوون، میزیان بە دەموچاو و شان و ملمدا دەکرد، ڕاپەڕیم و لەسەر جێگەکەم خۆم لێ ڕاست کردەوە، بێ ئەوەی هیچیان پێ بڵێم، ئەوانیش سێقۆڵی دایانە قاقای پێکەنین و یەک یەک بە بەتانییەکەم پاشماوەی میزەکەیان سڕی و زنجیری پانتۆڵەکانیان داخستەوە، بەدەم پێکەنینەوە، ژوورەکەیان بەجێ هێشت و دەرگاکەیان بەداوی خۆیاندا داخست.

حەفتەیەک بەسەر جیاکردنەوەم لە سەلیمدا تێپەڕیبوو، هەستم بە تەنیایی دەکرد، بێ سەلیم، تەنیایی دەستی نابووە بینەقاقام، بە جۆرێک غەریبیم دەکرد، کە بەردەوام لە دەرگاکەم دەڕوانی و چاوەڕوانی بووم.

ئەو ڕۆژەی پۆلیسەکان بە گەرمی و سوێراوی میزەکانیان بەئاگایان هێنامەوە، جلوبەرگەکانم هەموو داکەندن و بەسەر قەراغی پەنجەرەکەمدا دان، بەدرێژایی ئەو ڕۆژە، بەدیار بەلوعەکەوە هەڵکووڕ مابووم، چاوەڕوان بووم بەڵکوو پڕ بە چنگم ئاوی پێدا بێت و سەر و گوێلاکم لە بۆنی میز پاک بکەمەوە. لە دەماودەمی ئێوارەدا بوو، لە کاتێکدا گوێم نابوو بە دەرگای ژوورەکەوە، گوێم لە هاتوهاواری بەندکراو و پۆلیسەکان دەگرت، ورشە ورشی بەلوعەی ژوورەکەم، پڕ بە قورگی فووی لە ئەرزەکە دەکر، دەستم لەبەریدا پان کردەوە و پاش چەند هەناسەیەک، ئاو ڕژانە ناو لەپی دەستمەوە، بەدرێژایی ئەو شەوە، بەلوعەکە ئاوی لێ نەبڕا، بەتانی و دۆشەک و جلەکانم شۆردن، ئینجا ناچار بووم چەند کاتژمێرێک بەڕووتی بەرمە سەر.

ڕۆژی دوای ئەو ڕۆژە، پۆلیسەکان نەهاتن بۆ پشکنین، دەماودەمی ئێوارە، جیاواز لە ڕۆژانی پێشوو، لە پەنجەرەی سەر دەرگاکەوە دەستێک قاپێک خۆراکی بۆ ڕاگرتم.

ئەو ڕۆژە بێدەنگییەکی ترسناک باڵاخانەی بەندینخانەکەی داگرتبوو، لە نیوەی شەوی دوای ئەو ڕۆژەدا، وەکوو کاتژمێری سفر دیاری کرابێت، لە دەنگی تەقینەوەیەک ڕاچڵەکیم، هەستام و لەپشتی دەرگاکەوە خۆم مەڵاس دا، گوێم گرت، لە هەموو

لایەکەوە هاتوهاوار بوو، دەنگی بەریەککەوتنی ئاسن و بەرد و دار دەهات، پێدەچوو شریخەی تەقەکان لەودیو دەرگای ژوورەکەی منەوە بووبێت، زۆری پێنە چوو، لەژێر درزی دەرگاکەوە ژوورەکەم پڕ بوو لە بۆکرووز و دووکەڵێکی خنکێنەر، ناچار بووم پارچە جلێکی کۆنی سەلیم تەڕ بکەم و لە دەم و لووتمەوە بیئاڵێنم، چوومە سەر قەرەوێڵەکە و لەپێش پەنجەرەکەدا دانیشتم، بەردەوام چاوێکم لەسەر دەرگاکە بوو، ئاخۆ کەی دەکرێتەوە و نهێنیی ئەو ڕووداوانەم لا ئاشکرا دەبێت، ئەو نائارامییە، بەدرێژایی ئەو شەوە بەردەوام بوو. لەو کاتانەدا بیرم لەو ڕووداوانە دەکردەوە، کە پێشتر سەلیم باسی لێوە کردبوون.
سەلیم ڕووداوێکی ئەو بەندیخانەیەی ئاوا بۆ گێڕامەوە:
'دە ساڵێک پێش ئێستا، هەموو بەندەکراوەکانی ئەم بەندیخانەیە مانمان لە خواردن گرت. ئەو مانگرتنە، نزیکەی مانگێک بەردەوام بوو، دەیان بەندکراو لە ژوورەکانیاندا لە برساندا مردن، کاتێک ئێمە بڕیاری بەتاڵکردنەوەی مانگرتنەکەمان ڕاگەیاند، ئەوسا بەڕێوەبەری بەندیخانەکە بڕیاری دا سزامان بدات، سزاکەیشی ئەوە بوو، کە حەوت ڕۆژ خۆراک لە هەموو بەندکراوە مانگرتووەکان ببڕێت، ئەوسا مانگرتووەکانیش ناچار بوون، گۆشتی لەشی هاوڕێ مردووەکانیان بخۆن.'
گوێم لێ بوو لە ڕاڕەوی بەندیخانەکەدا و لەودیو دەرگای ژوورەکەمەوە، دەنگی ڕاکەڕاکە بوو، دەنگی لێدانی دەرگا و پەنجەرەکان، تا دەهات، زیادیان دەکرد، بە جۆرێک، هەستم دەکرد لەودیو دەرگای ژووری زیندانەکەمەوە، شەڕ و پێکدادان بوو، لە دەستی ڕاستمەوە، هاوار هاواری بەندکراوەکانم گوێ لێ بوو، بە

ناوازه و بە کۆرس، بێوچان الله أکبر، الله أکبریان بوو، لەلای ڕاستیشەوە، دەنگی میلهێنانەوە و تەقەکانم دەبیست، بە جۆرێک، جگە لە هەستی بینینم کە دەرگا ئاسنەکە ڕێگر بوو لەپێشیدا، دەمزانی لە بەندینخانەکەدا چی ڕووی داوە، ژوورەکەم پڕ بووبوو لە بۆنی ئاگر و باروت و خوێن، چاوەڕوان بووم ئاخۆ کەی دەرگای ژوورەکەم والا ببێت و منیش لەگەڵ بەندکراوەکانی تری ناو بەندینخانەکەدا بەشدار بم، بەشدار بم لە نارەزایی دەربڕین، بەلام گومانێک خەریک بوو ڕۆحمی دەخوارد، گومانێک، لە غەریبیمەوە سەرچاوەی گرتبوو، بە جۆرێک هێزی لە پێکانم بڕیبوو، جومگەی هەستی مرۆڤانەمی دەکرۆژت، لە هەمان کاتدا بەردەوام لە بیرکردنەوە و پلان داناندا بووم، ئەوی ئەوسا بە خەیاڵمدا دەهات و بە خۆمم دەوت، 'تۆ بڵێیت هێزێکی توورە لە دەستەلات، دابێتی بەسەر ئەم بەندینخانەیەدا و داروبەردی ئەم کاولەیە لە ڕەگوڕیشەوە تێک بدات، یان پێدەچێت دیسان مانیان گرتبێت، تۆ بڵێیت ئەوەندە نامرۆڤ و جیاواز خواز بن منیان لەو مانگرتنە بێبەش کردبێت و ئەو خۆپەرستانە تەنها سەربەستییان بە خۆیان بوێت، لەوانەیشە یەکێک لە بەندکراوەکان لە پۆلیسێک هەڵگەرابێتەوە و پەلاماری دابێت، بەو کردارەی، دەستەلاتی توورە کردبێت.'

سێ ڕۆژ بوو، ڕووداوەکان بەردەوام بوون، ئەو سێ ڕۆژە پۆلیسەکان نەهاتن و خۆراکیان پێ نەدام، ئەوەی جێگەی سەرسووڕمانم بوو، بەلوعەکە بەردەوام ئاوی لەبەر دەڕۆیشت، ڕووداوەکان برسێتییان لەبیر بردبوومەوە، ژوورەکەیشم قانگ

درابوو بە دووکەڵ و بۆکڕووزێکی خنکێنەر، ناچار پارچە جلێکم تەڕ دەکرد و لە دەموچاومەوە پێچا، لەسەر جێگە بەرزەکە، دەموچاوم خستە نێوان شیشی پەنجەرەکەوە، ئەوەندە دووکەڵ لە ژوورەکەدا بوو، لە نهۆمی سەرەوەی قەرەوێڵەکەوە، دەرگای ژوورەکەم نەدەبینی، لە پەنجەرەکەیشەوە، جگە لە بیابانەکە، هیچی ترم لێوە دیار نەبوو.

ڕۆژی چوارەم، هەوای ژوورەکەم لە دووکەڵ و بۆکڕووز پاک بووبووەوە، بەردەوام گوێم لە دەنگی بەندکراوەکان بوو، بانگیان دەکرد و دەرگا ئاسنینەکانیان دەکوتا، ئەوندە برسیم بوو، توانای بینینم کز بووبوو، ئەژنۆم بە ڕاست و چەپدا دەنوشتانەوە، پاش ئەوەی تاوێک لە پۆرترێتەکەی فاتمەم ڕوانی، هێزم دایە بەر خۆم و لەو دەوروبەرە چەند پارچە خشتێکم دۆزینەوە و خۆم بە دیواری لاشانی فاتمەدا هەڵپەسارد و دەستم کرد بە تۆخکردنەوەی، لەسەر شانەکانیەوە، ئەو چارشێوە ڕەشەم لەبەریدا پاک کردەوە، کە لەپێ دەستی سەلیم بەسەریدا کێشابوویان، سنگ و مەمکەکانیم دیسان ڕووت دەر خست، پێڵوی چاویم ڕەش کرد و لێو و لێویم ڕەنگی سوور کرد، ئاراستەی ڕوانینیم گۆڕی بۆ سەر جێگەکەم، پاش ئەوەی لە بێهێزیمدا خۆم پێ ڕانەگیرا و لە زەوییەکەدا تاوێک لێی کەوتبووم و لە پۆرترێتەکەم دەڕوانی.
لەپڕێکدا بە خەیاڵ گەڕامەوە بۆ ڕۆژانی سەردەمی منداڵیم و هێزێکی نادیاریش لە ناخمدا هێنامیە سەر چۆک و بە لەتە خشتەکانی ناو دەستم، نیگارێکی لەسەر زەویی ژوورەکە پێ

کێشام، نیگاری ناو خەیاڵەکانم، ئەو خەیاڵەی بەدرێژایی تەمەنم، سەرقاڵی تاوتوێکردنی بووم، بگرە زیاتر لە هەرکاتێکی تر، تامەزرۆی کێشانی نیگارێکی لەو شێوەیە بووم، ئەوسا لەسەر زەویی ماڵەوەمان و قوتابخانە و گەڕەک، خوویەکی سەیری سەردەمی منداڵیم بوون، هەرچەندە کاتێک گەورە بووم، ئیتر ڕەنگ و فۆرمی ئەو خەیاڵەم لەسەر ئەرز نیگار نەکرد و گوێزامەوە بۆ سەر کەنفاس و سەر ڕووی دیوارەکان، ئەو ڕۆژە لەناو ئەو هەموو دوودڵی و برسێتی و کێبەرکێیەم لەگەڵ وەیشوومەدا، بەدرێژایی ئەو ڕۆژە، لەسەر ڕووی ئەرزی ژووری بەندینخانەکە سەرقاڵی کێشانی ئەو نیگارە بووم، دەمەوئێوارە، کاتێک هەستم دەکرد ئیتر ناتوانم هێڵی بۆ زیاد بکەم و کاری من تەواو، بە هێزی دواوزەم، خۆم گەیاندە سەر جێگەکەم و لەوێوە لە فاتمەم دەڕوانی، نیگارەکەی لەسەر زەوییەکە کێشابووم، دڵنیاییەکیان بە دڵ و دەروونمدا دەهێنا، ئەو نیگارەی ماڵێک بوو، ماڵێک، کە بەرهەمی خەیاڵی چەندین ساڵم بوو، ماڵی نێو خەونەکانم، ماڵێک بوو بەم شێوەیە، "لە خەیاڵمدا، بەتەواوی وڵاتدا گەڕام، سەرجەم شار و دێهات و دارستان و کەناری ئاوەکان چووم، ئاخۆ کوێ گونجاوە، دوای زیاتر لە ساڵێک گەڕان و بیرکردنەوەم، پارچەیەک زەویم لە نزیکی دەریا هەڵبژارد، چەندین هێکتار بە چواردەوریدا چۆڵەوانی. نە ماڵێک، نە دارێک، نە بەرزاییەکت نەدەبینی، لەوێ، لەو زەوییەدا، ماڵێکم دروست کرد، دیوارەکانی لە شووشە، یانی ماڵێک پڕ لە پەنجەرە، دەرگاکانی قوماشی ڕەنگاوڕەنگ، بە دیوارەکانیدا لەجیاتی گڵۆپ مۆمدانم پێدا هەڵواسیبوو، ماڵێک، کە تەنها بە شەوقی مۆم ڕووناک دەبووەوە،

یەک نهۆم و تەنها مێزێک و دوو کورسی و چەندین شووشەی شەرابی تێدا بوو، لەگەڵ دوو پەرداخی ڕوونی مل درێژ. ڕاڕەوی ماڵەکەم ئەو هەڵماتانەم تێدا ڕاخستبوو، کە لە سەردەمی منداڵیمدا بۆ ئەو مەبەستە کۆم کردبوونەوە. پڕ لە تابلۆ و وێنەی ئەوسا و ئێستام، یانی ماڵێک، هاوشێوەی وێنەی ناو خەون و خەیاڵەکانم.

لە تەواوبوونی ماڵەکەمدا لە بیرکردنەوەی ئەوەدا بووم، ئاخۆ کێ بانگهێشت بکەم بۆ سەر خوانی خۆم، کێ شایانی ئەوە بێت، پێی بنێتە ناو ماڵی خەونەکانمەوە، لەگەڵ کێدا شەوێک، تەنها شەوێک بەسەر بەرم، لەگەڵ کێدا پێکێک شەراب نۆش بکەم. تەمەنێکم بەتەنیا گوزەراند، هێشتا هەر لە هاوەڵێک یان ئازیزێک دەگەڕام، لەو ڕۆژەوەی کارمنم ناسیوە، دەتوانم بڵێم، ئەو ڕۆژەی کارمن وەکوو سرووەی بایەک هاتە ناو ژیانمەوە، سات و ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژە، هەزاران جار لە خەیاڵمدا دووبارە بوونەوە، ئێستایش بێگومان ئەو، تەنها لەگەڵ ئەودا، من بەختەوەرترین مرۆڤی ئەم سەر زەوییەم، کێ هەیە خەونەکانی وەکوو من هاتبێتنە دی، ئەو پۆرترێتە لەچوارچێوە نەگیراوەی هەمیشە لە پێشچاومە، ئەو ڕوخسارەی ئەو، تاوێک لە چاوە ڕەش و قژە لوولەکەیم ڕوانی، تاوێک بە خەیاڵ دەستم بە قژ و لاملی ڕووتیدا هێنا، تاوێک سەرتاپا خۆم لە جەستەی ڕووتی هەڵسووی، پاشان دەستی ئازارەکانیم لەناو دەستم نا و بەدوای خۆمدا بەرەو ڕووی ماڵەکەمم برد.

ئەو شەوە، لەوە دەچوو لەگەڵ ئەودا دوا بەختم بێت، لەبەر ڕووناکیی مۆمەکاندا دەستم لەناو دەستی ناو توند لەئامێزم گرت، لێوم بەسەر ڕوومەتیدا هێنا و ڕۆحیم بە تەڕیی هەوەسم ئاو دا،

پێکەوە لەگەڵ دەنگی نەغمەی شنەبایەکی دەریاکە، پێیەکانمان بەدوای پێی یەکدا دەخشاندن و خۆمان لە باڵای یەکتری ئاڵاندبوو. تا نیوەشەوێکی درەنگ، بێ ئەوەی هیچمان وشەیەک چییە بیدرکێنین، خۆمان با دا و سەمامان کرد."

## ١٨

# ژەنگ

دەمزانی لەکوێم و بۆچی لەوێم، بەلام ڕووداوەکان بەرە و کوێم دەبەن و چەندی تر دەمێنمەوە، بێئاگا بووم.
پێش سپێدە، لە خەو ڕابووبووم، هێشتا ئاسەواری خەیال و خەونەکانی دوێنێ شەوم تاوتوێ دەکرد، کەمێک سەرم وەلا نا و چاوم بڕییە یەکێک لە شیشەکانی پەنجەرەکە، لە سەرەوە بۆ خوار، تا بۆیەکەی بەری کۆتایی پێ دەهات و دامێنی ژەنگاویی دەستی پێ دەکرد، وەکوو ئەو ژەنگە بە دامێنیدا ڕژابێت، نیگام لەسەر پریشکی ژەنگێک ڕاگرت، ئەوەندە بە سەرنجەوە لێم دەڕوانی، وەکو بمەوێت هەموو وەلامی پرسیارەکانم لەوێدا ببینمەوە، نازانم بۆ لەو خالە ڕادەمام، پێدەچێت ئەوسا لە ڕووی ژەنگ هەلاتووی ئەو پارچە ئاسنەوە، ژەنگی ناخی خۆمم پەی پێ بردبێت.
لە دەنگی لێدانی دەرگای ژووری زیندانەکەم ڕاپەڕیم، پاشان لەناکاو دەللاقەی سەر دەرگاکە والا بوو، دەستێک پارچە

بەتانییەکی گڕاوییی لێوە فڕێ درایە ژووری، پاش چەند هەناسەیەک دۆشدامانم، هێزم دایە بەر خۆم و بەتانییە گڕاوییەکەم ڕاکێشایە بەر بەلوعەکە، کە هێشا بەخوڕ ئاوی لەبەر دەڕۆیشت. پاشان چەند جارێک بانگم کرد، ' یاناس حرام علیکم!'

ئەو دێڕەی بەردەوام لە سەلیمم دەبیست، لە کاتی بێزاری و تووڕەبوون و تەنگانەیدا، بەردەوام دووبارەی دەکردەوە، بیرم لەوە دەکردەوە، ئاخۆ چۆن بتوانم ئەو دەللاقەیەیی سەر دەرگاکە بگرم، کە لە دیوی دەرەوە دادەخرا، ویستم قەرەوێڵەکەم ڕاکێشمە بەردەمی دەرگاکە و بینێم بەبەر دەللاقەکەوە، بەڵام هەرچەندێک هێزم لە خۆم کرد، هێزی ئەوەم تێدا نەبوو، نەمتوانی تەنانەت قەرەوێڵەکەیش لە جێگەی خۆی بجووڵێنم، ناچار بووم ڕام گۆڕی و پاشماوەی بەتانییە سووتاوەکەم لوول کرد و لە گونجی ئاوەڕۆکەم ئاخنی، بەلوعەکە ئەوەندەی ئاو پێدا دەهات، زۆری پێ نەچوو ئاو گەیشتە دامێنی دەرگا ئاسنەکە، بە مەبەستی ئەوەی ئەگەر دیسان ئاگریان فڕێ دایە ژووری، بکەوێتە ناو ئاوەکە، بە هەمان شێوەی ڕۆژی پێشوو، چەند پارچە جلێکم تەڕ کرد و چووم لە قاتی سەرەوەی قەرەوێڵەکە دانیشتم، بە جۆرێک، کە لە پەنجەرەی سەر دەرگاکەوە دیار نەبووم، بەردەوام چاوێکم لە دەللاقەی سەر دەرگاکەم بوو. کاتێک بۆ جاری دووەم لە دەللاقەی سەر دەرگاکەوە کەسێک دەموچاوی خۆی نیشان دام، دیار بوو زۆری لە خۆی دەکرد، تاوەکوو ناو ژوورەکەم ببینێت، لێم ڕوانی، ڕیشنێکی سەر قژاویی گەنم ڕەنگ، لەو دەمەدا گوێم لێ بوو چەند کەسێک لەبەر دەرگاکەمدا لێدوان و مشتومڕیان بوو، یەک یەک دەموچاویان دەخستە ناو دەللاقەکە و لە

ژوورەوەیان دەڕوانی، ڕوخساری ئەوانەی لێمەوە دیار بوون، هیچیان لە پۆلیسەکان نەدەچوو، چونکە لە ماوەی ئەو ساڵەدا، پۆلیسێکم نەبینیبوو ڕیشی هەبێت و قژی دریژ بێت، دڵنیا نەبووم لەوەی ئاخۆ خۆم بشارمەوە لێیان یان بانگیان لێ بکەم و پێیان بڵێم، 'منیش لێرە بەند کراوم و تکایە دەرگاکەم بشکێنن و ڕزگارم بکەن.'

لەو دەمەدا، بێهوودە لە خۆمم دەپرسی، 'لە چی دەترسم، تۆ بڵێی ئەمانە لە پۆلیسەکان بێبەزەییتر و نامرۆڤتر بن؟'

گوڕم دایە بەر خۆم و لەسەر قەرەوێڵەکە دابەزیم، بە ترس و لەرزێکەوە، دوو مەترێک لە دووریی دەلاقەی سەر دەرگاکەوە ڕاوەستام، ئەوەی ئەوسا لەو پەنجەرە بچووکەوە بینیم، چەندین دەموچاوی گەنم ڕەنگ و ڕەشتاڵە و تووکن بوون، هەموو دەموچاوەکان تووڕە و بێزار دیار بوون، لە کاتێکدا ئەوان هێشتا لەگەڵ یەکتری سەرقاڵی قسەکردن بوون، لە خەیاڵمدا چەند دێڕێکم ئامادە کردبوو، تا پێیان بڵێم، نازانم بۆ ڕام گۆڕی و لەناکاو ڕووی دەمم کردە دەلاقەکە و پڕ بە قوڕگم هاوارم لێ کردن، 'یا ناس ساعدني.'

لە کاتێکدا گوێیان لە دەنگم بوو، هەموو شڵەژان و ڕوویان تێ کردم، مۆن و دڵڕەق دیار بوون، چاویان ئاگری لێ دەباری، زووزوو لە دەلاقەکەوە پڕ بە دەمیان تفیان ڕووبەڕووم دەهاویشت و بە دەنگی بەرز و قەهرەوە هاواریان لێ دەکردم، چەند هەنگاوێک گەڕامە دواوە، لە بێئاگاییم و بێهوودەییمدا، خۆم لەسەر قاچەکانم بۆ ڕانەدەگیرا، ڕووی دەمیان لە دەلاقەکە دەکرد و دەیاننەڕاند، 'الله ئەکبر، الله ئەکبەر.'

بێ خواستی خۆم، زووزوو لەبەر خۆمەوە و بە دەنگی بەرز ڕووی دەمم تێ کردبوون و هاوارم لێ دەکردن، 'یاناس حرام علیکم، یاناس حرام علیکم!'

ئەوەی بە دەستیاندا دەهات و بە دەللاقەکەوە دەچوو، دەیان هاویشتە ژوورێ، ژوورەکە بستێک زیاتر ئاوی تێ هاتبوو، بەبیرم نایەت، کە چی بوو لە دەللاقەکەوە تێیان گرتم و بەر سەرم کەوت، گێژ بووم و لەوەدا بووم بکەوم، لە ناچاریدا هەردوو دەستم بە شانە ڕووتەکانی فاتمەوە گرت، کاتێک دەموچاوم لەسەر سنگی گەرمی ئەو بوو، بینیم چۆن خوێن ڕژان بەسەر سنگ و مەمکە ڕووتەکانی فاتمەدا و دڵۆپ دڵۆپ چۆڕانەوە بەسەر ورگی ڕووتیدا و تکانە نێو ڕانەکانی.

لە شێوەی ئاژەڵێکی بریندار دا، چەند جارێک بەدەوری خۆمدا سووڕامەوە، وەک بمەوێت لەدەست مردن هەڵبێم، لە چواردەورم، لە دەرگایەک یان لە کونێک دەگەڕام، ویستم خۆم بگەیەنمە سەر قەرەوێڵەکە و خۆم لەژێر بەتانییەکەمدا بشارمەوە، یان خۆم بهاوێژمە ناو ماڵی خەونەکانم، ئاو دابووی بەسەریدا و هێلکارییەکانی کاڵ کردبوونەوە و بەئەستەم لە بەرپێمدا و لەسەر زەویی ژوورەکە ئاسەواری مابوو، بە ترس و لەرزێکەوە هەردوو لەپی دەستم بە دیوارەکەوە گرت و بێئاگا لە چواردەورم، بێوچان دڵی خۆم دەدایەوە و بە خۆمم دەوت، 'ئەو دڕندانە دەرگا ئاسنەکەیان بۆ ناشکێندرێ و هەرگیز ناتوانن بێنە ژوورێ.'

بە دوایین دڵۆپە وزە، کە لە لەشمدا مابوو، هێزم دایە بەر خۆم و چاوم لە ڕوخساری فاتمە بڕی، تەنها ئەوەندەم بەبیر دێت، لەناکاوێکدا دەرگای ژوورەکەم خرایە سەر پشت، ڕامابووم لە

چاوی فاتمە و هەستم پێ کرد، لە هەناسەیەکدا چواردەورم پڕ بوو لە تارمایی و هاتوهاواری ئەوان، لە یەک ساتەوەختی کورتدا، لە خۆم و لە چواردەورم بێئاگا بووم.

## ١٩

# فاتمە

ئەو ڕۆژە چی ڕووی دا؟ دوای ئەوەی بەرامبەر پۆرتریتەکەی فاتمە ڕاوەستابووم و لە چاویم دەڕوانی، بەئاستەم بە خەیاڵمدا دێت، کاتێک لەناو تەڕیی زەویی ژوورەکەمدا بریندار و کفت و پرزە لێبڕاو کەوتبووم، ئەوەی نەمدەویست ڕادەستی ببم و باوەڕی پێ بێنم لەو ساتەدا، مردن بوو، بۆچی تا دواهەناسەم سەرسەختانە بەرەنگاری دەبوومەوە؟ چەند جارێک پێش ئەو ڕۆژەیش، ساردوسڕیی مردنم لە جەستەی تێکشکاومدا هەست پێ کرد، گومانم لەوە نییە، کە لەو ڕۆژانەوە لە جەستەی مندا مردن هێلانەی کردبێت، ئەو ڕەگی مردنەی لەژێر ناوی شێرپەنجەدا لە تەمەنی سی ساڵییەوە خۆی هاویشتبووە نێو مۆخی ئێسقانەکانی لەشی دایکمەوە.

یادەوەرییەکانی ئەو ڕۆژە، وەک خەونێک، تاریک و ڕوون، نازانم لەژێر چ ناوێکدا تۆماریان بکەم و چ ناوونیشانێکیان بدەمێ، ئیتر بەم شێوەیە لە خەیاڵمدا تۆمارن:

'لە نادیارەوە ترپەی پێکانم دەبیست و سییەکانم لە بۆکڕووزی لاشەی مرۆڤی سووتاو پڕ بووبوون، جەستەی کەنەفت و پەککەوتەی خۆمم بینی، چەند جارێکیش گوێم لە دەنگی دایکم بوو، لە جێیەکی نادیارەوە بەردەوام بانگی لێ دەکردم، "مارتن، مارتن، ئازیز بەئاگا بە، بەئاگا بە."

کێ بوو لە ئامێزی گرتبووم، سەرمی خستبووە سەر ڕانەکانی خۆی و ئاوی بە دەموچاومدا دەپرژاند؟ پێش ئەوەی چاوم هەڵببڕم هەستم بە بەرکەوتنی جەستەی گەرم و نەرمی دەکرد.

نازانم ئەو ڕووداوانە خەون بوون یان ڕاستی، یان تەنها ترسم بوو لە مردن، کە بێ پرسی ژیان، چەند ڕۆژێک بوو بەناو باڵاخانەی بەندینخانەکەدا دەگەڕا، کاتێک چاوم هەڵبڕی ڕوخساری فاتمەم بینی، لە ئامێزی گرتبووم و بە سەرمدا نوشتابۆوە، بە جۆرێک ڕوخساری لێم نزیک کردبووەوە، بۆن و گەرمیی هەناسەی دەیاندا بە ڕوومدا، بە چ زمانێک و بە چ تۆنی دەنگێک دواندمی، تەنها هێندەم لە خەیاڵدا ماوە، کە فاتمە پێی وتم، "ڕۆحی من بۆ خاتری سەلیم لێرە قەتیسە، دوای ئەو هەموو ساڵە لە تەنیایم، تەنها تۆ توانیت هەست بە بوونی من بکەیت، ئەم ساتە و بەیەکگەیشتنمان، تەنها بەڕێکەوت نییە، بەڵکوو زیاتر لە چارەماندا نووسراوە."

باڵێکم توند لە ناوقەدی ئاڵاندبوو، پێستی نەرم و گەرمی، لەژێر زبریی پێستی پەنجەکانمدا یەکتریان لە ئامێز گرتبوو، بە جۆرێک، کە قورساییان لەسەر زەینم کرد و گوشاریان بۆ هێنام، هەتا لەشم لەگەڵ گەرمیی لەشی ئەودا ڕاهات، لە ئارەقی خۆمدا خوسام، پێیەکانم لە هێزێک دەگەڕان، تا جەستەی گرانم لەسەر

خۆیان ڕابگرن، ماسوولکەی پێیەکانم گرژ کردبوون و توند لە ڕووی ئەرزەکەم دەخشاندن، تەزوویەکی سارد، کە لە شەرمەوە سەرچاوەی گرتبوو، بەردەوام دڵمی دەلەرزاند.

نازانم چەندێک بوو بە گومانەوە لێم دەڕوانی، سەرنجم لە بیلبیلەی چاوی دابوو، دەمێ بوو شەو و ڕۆژ لێم دەڕوانی و پێی ئاشنا بووبووم، بەردەوام ترسێک تەنگی بە ڕۆحم هەڵدەچنی و لە عەزرەتدا زیاتر لێی نزیک بووبوومەوە، دەموچاوم ژەندبووە گەردنی، قژە لوول و ڕەشەکەی بەسەر ڕوومدا پەخشان بووبوو، گوێم لە زرموهووڕی دڵم بوو، خێرا خێرا خۆی دەکێشا بە قەفەسەی سنگمدا، منێکی زەلیل وەک بێچووە چۆلەکەیەکی زامدار، کە لە دواساتەکانی ژیانی خۆی دڵنیا بێت و مردنی بە هەموو بێمانابیەکەوە قبوڵ کردبێت. پڕ بە سییەکانم بۆنیم هەڵمژی، سات لەدوای سات، چاوم توانای بینینی زیاتر دەبوو، لەشم، تا دەهات، زیاتر وزەی تێ دەهات، عەزییەکی سووری تەنکی لەبەردا بوو، شان و سنگی تاکوو نزیکی سەر گۆی مەمکەکانی ڕووت بوو، دەست و پەنجەی لە خەنەگیراو، چاوی کلڕێژ کردبوو، لەوە زیاتر نەیدواندم. تا دەهات، زیاتر خۆی پێوە دەنووساندم، جارناجارێ ماسوولکە سست و مردووەکانم تەزوویان پێدا دەهات، هەستم دەکرد تەوژمی خوێن لە دڵمەوە بە شادەمارەکانمدا بێوچان شەپۆلیان دەدا، وەک منداڵێک لە باوەشی گرتم و ڕووەو دەرەوەی ژووری زیندانەکەی دەبردم، چاوم بۆ پۆلیسەکان و ئەو پیاوە ڕیشن و تووڕانە گێڕا، کە چەند ڕۆژێک بوو بەردەرگایان پێ گرتبووم، بێ ئەوەی بتوانم تەنها وشەیەک چییە بیدرکێنم، یان جۆرێک لە ناڕازیبوونم بەرامبەری دەر ببڕم. بەناو ئاگر و

دووکــەڵێکی خنکێنــەردا، بــە ڕاڕەوەکانــدا بردمــی، بــێ ئــەوەی لەملاولای خۆی بڕوانێت، بێباک بەسـەر تـەرمی چەندین پۆلیس و بەنـدکراودا هـەنگاوی نـا، چەنـد ڕاڕەوێکـی بـڕی، بینـیم سـەرجەم دەرگای ژوورەکـان لەسـەر پشـت بـوون و گڕ و شـاڵاوی ئاگریـان لێوە دەهاتنە دەر، لەو دەوروبەرە، بەندکراوەکانم بینی، پۆل پۆل و تاکوتــەرا بەرامبــەر یــەک ڕاوەســتابوون و دانیــان لــە یــەک جیــڕ دەکردەوە، لە دەرگـای دەرەوە، پیـاوە ڕیشـن و تووڕەکـان، هـەموو بــە تفەنگــەوە ڕاوەســتابوون و دەســتیان بــە ڕیشــە چڵکــن و دێزەکانیانـدا دەهێنـا، بـێ ئـەوەی لـە ئێمـە بـڕوانن، لەگـەڵ یـەکتردا سەرقاڵی قسەکردن بوون، بێدەنگ بەلایاندا گوزەرمان کرد، لەپێش باڵاخانــەی بەندینخانەکــە دەیــان کــەس بــە چۆکـدا هــاتبوون و تورەکەی ڕەشیان بە سەردا کرابوو، دەستیان لەدواوە بەسترابوو، کە بە جلە سەوزەکانیاندا دیـار بـوو، هـەموو پۆلیس بـوون، کاتێک گەیشتینە بەر ئەو دەرگا ئاسنە پێنج مەتر بـەرزەی دەکەوتـە نێوان ئــەو دیــوارە کۆنکرێتــەی بەدەوری باڵاخانــەی بەندینخانەکــەدا کێشرابوو، بینـیم پزیشـکەکە بە بـەرزیی دەرگاکەوە هەڵواسـرابوو، لاشـەی بێگیـانی لەگـەڵ شـنەی باکـەدا سـەمای دەکرد و لـە نـووکی هــەردوو پێیەکانییــەوە، بــەردەوام خوێنیــان لــێ دەچــۆڕا، بــە سـەرنجەوە تاوێـک لـێم ڕوانـی، تـاکوو لێـی دوور کەوتینـەوە و لـە چاوم ون بوو، ئینجا بە چواردەورماندا تا چاو بڕ بکات، ئەو دەریا زەردە لمینـە بـوو، کـە هێشـتا هـاڵاوی گـەرم و بـۆکرووزی ئـەو ڕۆژەی لێ هەڵدەستا، چەندین تەپۆڵکە و هـەوراز و لێژیمـان بـڕی، تاکوو تاریک داهات، بێدەنگ بێوچـان دەڕۆیشـتین، بێ ئـەوەی ئـەو هەست بە هیلاکی بکات یاخود ترپەی لێدانی دڵی خێرا ببێت.

ڕۆژ ئـاوا بـوو، شـەویش داهـات و ئێمـە هێشتا لـەو بیابانـەدا بـەردەوام بـەڕێوە بـووین، کاتێـک لـەناو خۆمـدا لـە دەرگـای خەیاڵـەکانمم دەدا، ئـەو جەسـتەی برینـدار و کەنـەفتمی لەبـەر ڕووناکیی مانگەکـەدا لەسـەر تەپۆڵکەیـەک لـم دانـا، تەپۆڵکەیـەکی گەڕۆک، کە پێدەچوو تازە بارگەی خۆی لەوێدا خستبێت، فاتمە ئەژنۆکانی لەسـەر لمی بیابانەکە دادان و بەردەوام بێ ئارام بە چواردەوریدا بە بیابانەکـەدا دەیڕوانـی، بێ ئـەوەی لێم بڕوانێت، دەستی لە دەستم هـەڵپێکا و بەردەوام سـەری پەنجەکانی لەسـەر پێستی دەستم دەجووڵاند.

لەبەر ڕووناکیی مانگدا، لە ڕوخسار و شان و سنگی ڕووتی ئەوم دەڕوانی، بینیم لەناکاو بزەیەک کەوتە سەر لێوانی و ماسوولکەی دەوری چـاوی گـرژ کـرد. کاتێـک سـەرم وەلاوە نـا و لـەژێر باڵەکانیـەوە هاوشـێوەی ئـەو لـە دوورم ڕوانـی، بینـیم تارمـایی ڕووناکی و چراخانێـک بـەرەو لای ئێمـە بـەڕێوە بـوو، جارجـار ڕووناکییەکان دەکەوتنە ئەودیوی ئەو گرد و تەپۆڵکانـەوە، کە بـا لـەو دەوروبـەرە بـە لمـی بیابانەکـە تاکوتـەرا دروسـتی کردبـوو، ڕووناکییەکان زۆر خێرا ڕووەو لای ئێمە دەهـاتن، هەسـتم کرد لە چەند هەناسـەیەکدا گەیشتنە بەر ئەو تەپۆڵکەیـەی ئێمـەی لەسـەر بووین و لەپێشماندا ڕاوەستان، کاتێک سـەرنجم لێ دان، هـەزاران مرۆڤی ڕەشپۆشی حیجابکار بوون، دڵنیا نەبووم لەوەی ئاخۆ ژنن یـان پیـاو، هەنـدێکیان چلۆسـکی گراوییـان بـە دەسـتەوە بـوو، تاکوتـەرایش دەف بـە دەسـت و بـەردەوام دەفـەکانی دەسـتیان دەکوتا، هەموو بەکۆرس گۆرانییان دەچڕی، گوێم لە فاتمە بوو، لەبـەر خۆیـەوە دەسـتی کـرد بـە نـووزە نـووز و لەگەڵیانـدا

تێکستەکانی ئەوانی دەگوتەوە:

"بوونی ئێمە
بوونمان لێرە
ژن، وەک مرۆڤ
وەک گیاندارێک
لەسەر زەوی، لەم دنیا
چاوەکانتان لێک مەنێن
پێکەوە لێرە، نەک لەوێ
بە جەستە لێرە، لەبەر خۆر
لێدانی دڵتان بژمێرن
لە دواترپەی بەئاگا بن
ترپەی دڵی مرۆڤێک
دواترپەی دڵی ژن
لێرە، لە بیابان، لەبەر خۆر"

دەنگیان ئەوەندە لەلام غەمگین بوو هەستم دەکرد ئارامییان دەدا بە ڕۆحم، کزەبایەکی ساردیش برینەکانمی دەکزاندەوە و گەرمی و بێ ئارامیی لەشمی سارد دەکردەوە، بێئاگا بووم لەوەی بە چواردەورماندا و بە پانتایی ئەو بیابانە، پڕ بووبوو لە مرۆڤی ڕەشپۆشی حیجاب کار.

بەدرێژایی ئەو شەوە بێوچان دەفیان دەژەند و گۆرانییان دەچڕی و ئاهەنگیان دەگێڕا و سەمایان دەکرد، لە دەماودەمی سپێدەدا، لە یەک ئانوساتدا، تێکڕا حیجابەکانیان دادەکەند و بەڕووتی قیت ڕادەوەستان و هەموو لە ئاسۆیەکیان دەڕوانی، کاتێک هەموو

خۆیان ڕووت کردەوە، ئەوسا دڵنیا بووم ئەو حەشاماتە هەموو ئافرەت بوون، جەستەیان سپی، وەکو بەفرێک کە تازە باریبێت، لەوە دەچوو پێستیان هەرگیز ڕووناکیی نەدیبێت، چاویان وەک چاوی ئاژەڵێکی شەوگەڕ دەگرا، بێ ترووکان بەردەوام لە دووریان دەڕوانی، لەناکاو بێدەنگی دای گرتن، نە سریوەی با دەهات و نە دەنگی دەفەکان، بە ترس و دوودڵییەوە، چاوم پێدا دەگێران، چاوەڕوان بووم ئاخۆ ئەوان لە پێشچاوی ئێمە چ نمایشێک دەکەن، کاتێک لەو بیابانەدا بێدەنگی دەستی نابووە بینی هەموو شتێک، ئەوەی تەنها گوێم لێ بوو، ترپەی دڵی خۆم و فاتمە بوو.

لە کاتێکدا خۆر یەکەم تیشکی ڕووناکیی خۆی هاویشتە سەر ڕووی بیابانەکە، لە دوور گوێم لە دەنگی هەلهەلە بوو، زۆری نەبرد، هەموویان دەستیان بە هەلهەلە لێدان و هاوار و گریان کرد. کاتێک هەستم بە گەرمیی خۆرەکە کرد و چواردەورمانی بە تیشکی خۆی ڕووناک کردبووەوە، پێڵووی چاومیان ئازار دەدا، لەناکاو فاتمە بە هەردوو دەستی پڕی پێدا کردم و توندتر لەئامێزی گرتم، بە جۆرێک، وەکوو ئەو بزانێت ڕووداوێک یان کارەساتێک بەڕێوەیە و بیەوێت منی لێ بپارێزێت، بەردەوام لەو دیمەنانەم دەڕوانی، کە بەڕاستی لە پێش چاومدا نمایش دەکران، هەستم دەکرد لە خەیاڵمدا پێشتر دیمەنی ئاوام دیبێت، بەردەوام لە خۆمدا و لە ڕابردووم دەگەڕام.

دوایی بەبیرم هاتەوە، کە ئەو دیمەنانە هاوشێوەی دیمەنی ناو تابلۆ و سکێچەکانی سامان خدر بوون، دەیان تابلۆ، بەکۆمەڵ ئافرەت نیوەی جەستەیان بە حیجابی ڕەش داپۆشیبوو، نیوەکەی

تریان بەڕووتی لە بەر تیشکی خۆردا، بەکۆمەڵ ڕاوەستابوون و بێ ترس لە خۆریان دەڕوانی، ئەوە دەقاودەق ئەو دیمەنەیە، کە بە چاوی خۆم بینیم و پێشوەختیش گەنجێکی هونەرمەندی کورد بە خەیاڵ دەرکی پێ کردبوو، وەک خۆی نیگاری کێشابوون، یان پێدەچێت سامان خدر خۆی هاوشێوەی ئەو دیمەنەی دیبێت، دیمەنی خۆکوژیی بەکۆمەڵی بوونەوەرێک، دیمەنی بەکۆمەڵ خۆکوژیی ژن.

چیم بینی و چ دیمەنێکی چاوەڕواننەکراو بوو، ئەو حەشاماتی ژنە، لەبەر ڕووناکی و گەرمیی خۆرەکەدا، بۆکڕووز و دووکەڵیان لێ هەڵدەستا، نە ڕەنگی دووکەڵەکەم دەزانی چ ڕەنگێکە، نە ئەو بۆنەیش پێشتر بەر لووتم کەوتبوو، ئەوەی دەمبینی، دیمەنی خۆکوژییەکی بەکۆمەڵ بوو.

لە چەند هەناسەیەکدا، ئەو دەریای پڕ لە لاشەی ژنە، پێستی سپی و بلوورینیان زەرد هەڵدەگەڕا، وردەوردە دەسووتان و دەبوون بە خۆڵ، پانتایی ئەو بیابانە پڕ بوو لە ئاسەواری تەپۆڵکەی سووتووی بۆرباو، بێ ئاگاداری هەستەکانم چەند فرمێسکێک هاتبوونە ناو چاوم و لەوەدا بوون بڕژێنە سەر سنگی ڕووتی فاتمە، کە لەو دەمەدا سەری قورس و پڕئازارم لەسەر دانابوو، فرمێسکی ترس و بێئاگاییم بوو بەرامبەر بەو دیمەنانەی لە پێشچاوم نمایش دەکران؟ یان لە ئێستامدا ناتوانم تەواوی هێزی هەستەکانم لە قووڵایی یادەوەرییەکانی ئەوسامدا ڕابگرم و ئەو هەستەی ئەوسام، ئێستا بە نووسین بکەم.

لە ساتەوەختێکی کورتی دوای ئەو ڕووداوانەدا، کاتێک بیابان بێسرتە و خامۆش بوو، لە نادیارەوە بایەکی لەناکاو هەڵی کرد و

تەپۆڵکەی تەپوتۆزی سووتووی لاشەی ژنەکانی لەگەڵ خۆیدا ڕاپێچ کردن، من و فاتمە بێدەنگ و سەرسام لێمان دەڕوانین، ئینجا سەرێکی بەسەرمدا هێنایەوە و ڕوومەتی بە ڕووی تۆزاویمەوە نووساند و چپاندی بە گوێمدا، "پێکەوە ئاهەنگیان گێڕا، پێکەوە دوابڕیاریان دا."

ئینجا پەنجەکانی وەکو شانە بە قژمدا دەهێنا و زووزوو دەیچپاند بە گوێمدا، "بەئاگا بە، غەریب، بەئاگا بە، غەریب، بەئاگا..."

گەرمی تیشکی خۆرەکە، تا دەهات، زیاتر جەستەمی گەرم دادەهێنا، چاوەڕوان بووم ئاخۆ کەی دەسووتێم و سووتووی جەستەم تێکەڵ بە لمی ئەو بیابانە دەبێت.'

# ٢٠

# زیندووبوونەوە

ئەو دەمەی بەئاگا هاتمەوە، نەمدەزانی شەوە یان ڕۆژ، لەسەر جێگەیەکی گەرم و نەرم کەوتبووم، هەموو ئازای لەشم ئازاری دەهات، لەپشتمەوە تاکوو سەر هەردوو گردەکانی سمتم سڕ بووبوون و هەستم پێ نەدەکرد، بەناو تاریکی چواردەرمدا دەستم کرد بە هاوارکردن، پڕ بە قوڕگم بانگم دەکرد، بۆ ئەوەی دڵنیا بم لەوەی ئاخۆ کێ دێت بە هانامەوە.

گوێم لە دەنگی کردنەوەی دەرگایەک بوو، هێندە ڕووناکیی لێوە هاتە ژوورێ، خێرا لام ئاشکرا بوو کە لە ژوورێکدا، لەسەر جێگەیەک کەوتووم، زۆری نەبرد، چەند گڵۆپێکی سپی ژوورەکەیان پڕ کرد لە ڕووناکی، ئافرەتێکی کورتە بالای [illegible] ڕەشی ئەسمەری چاو زەقی سپی پۆش ڕووبەڕووم هـا[illegible] تاوێک لێی ڕوانیم، چەند وشەیەکی بە عەرەبی لەبەر خۆیەوە [illegible] زۆری پێ نەچوو، ئافرەتێکی تر بەدەم قسەکردنەوە خۆی [illegible]

ژووردا، لەگەڵ ئەوەی پێشوودا پێدەچوون دەستەخوشک بن، تا دەهات، گەرم دادەهاتم و بێ ئارامیم دڵی دەگوشیم، بە جلوبەرگی بەریانـدا و کەرەسـتەی نـاو ژوورەکـەدا، بـۆم دەر کـەوت، لـە نەخۆشخانەم و ئەو دوو ئافرەتەیش، پێدەچێت پەرستار بن.
بەتەنها لەو ژوورە سەرتاپا سپییەدا بووم، تەنها یەک پەنجەرەی لاکێشەیی تێدا بوو، پەردەیەکی سپی بە ڕوودا گیرابوو، پەردەکە ئەوەندە ئەستوور دیار بوو، بواری بە ڕووناکیی دەرەوە نەدەدا بێتە ژوورەکەم، بێجگە لە ڕەنگی هەردوو سەر دەستم، کە زەرد دەیاننواند و لەتەنیشتمەوە ڕاخرابوون، بۆردێک بە دیوارەکەی بەرامبەرمدا هەڵواسرابوو، بۆردەکە بە کارت و وێنە و پارچە کاغەزی ڕەنگاوڕەنگ داپۆشرابوو، وەکوو تر، هەموو شتێک لە ژوورەکەمدا ڕەنگی سپی بوو، هەموو گیانم مێروولەی دەکرد. ڕووناکیی ئەو گڵۆپە سپییانەی بە بنمیچی ژوورەکەوە دەگرپان، چاومیان ئازار دەدا و قورساییان لەسەر زەینم دەکرد و گوشاریان بۆ دەهێنام، ڕووم لە دوو پەرستارەکە کرد و لێم پرسین، 'من لەکوێم، تکایە پێم بڵێن، من لەکوێم؟'
یەکێکیان لێی ڕوانیم و بە ئینگلیزییەکی نیوە ناچڵ و بەدەم پێکەنینەوە وتی، 'تۆ نەخۆش، نەخۆش.'
دیسان لێم پرسییەوە، 'بۆچی، چی ڕووی داوە؟'
هەردووکیان پەنجەیان بۆ درێژ کردم و بە پێکەنینەوە و بە کۆرس وتیان، 'نەخۆش، نەخۆش، نەخۆشخانە، نەخۆشخانە.'
هەردووکیان قاقایان لێ دەداو بە دەنگی بەرز، بە عەرەبی دەدوان، بەردەوام بەدەورمدا دەهاتن و دەچوون، بێ ئەوەی لێم بڕوانن و چیی دی وەڵامی من بدەنەوە، ئەوسا ئەو دوو پەرستارە شتێکیان

بیر دەهێنامەوە، بەڵام نەمدەزانی مانایان چییە و چین و چۆن خۆیان هاویشتۆتە ناو خەیاڵی منەوە، هەردووکیانم بە جلە سپییەکانیانەوە هاوشێوەی دوو پۆلیس دەهاتنە پێشچاو، دەمزانی لە نەخۆشخانەم، بەڵام بۆچی و چۆن ڕێگەم کەوتۆتە ئەوێ، چاوم لێک نا و هەوڵم دەدا بیر بکەمەوە و تاوێک بە خەیاڵ بگەڕێمەوە ڕابردووم و سۆراغێک بکەم، ئازاری لەشم ئەوەند گوشاریان خستبووە سەر زەینم، توانای خەیاڵمیان ئیفلیج کردبوو. لەو دەمەدا گوێم لە دەنگێک بوو، بە هۆڵەندی دەدوا، خێرا چاوم هەڵبڕی و بە چواردەورمدا ڕوانیم، بێجگە لە دوو پەرستارەکە، کە هێشتا لای ڕاستمەوە ڕاوەستابوون و بێوچان لە گەرمەی قسەکردندا بوون، چاوم گێڕا، لەلای دەستی چەپمەوە، ژن و پیاوێک ڕاوەستابوون و لێیان دەڕوانیم، هەردووکیان پێکەوە بە زمانی هۆڵەندی وتیان، 'ڕۆژ باش.'
کابرایەکی سوورکاری سەرخڕی چاویلکە لەچاوی ڕەقەڵەی باڵابەرز، ئافرەتەکەیش نموونەی ژنی هۆڵەندی بوو، باڵای هاوشێوەی کابراکە بوو، دەموچاوێکی خڕ و قژێکی زەرد و کورت و گلێنەی چاوی سەوز، ئافرەتەکە لێم هاتە پێش و خۆی نوشتانەوە و بە دەنگێکی نزم وتی، 'ئێستا چۆنی؟ ئێمە هەموو تەمەنا دەکەین گوزەرانت باش بێت.'
لە کاتێکدا دەستێکی خستە سەر دەستم و ویستی بەردەوام بێت لە قسەکردن، من پێم وت، 'ئەوە حاڵی منە کە دەیبینن، ئێستا پێم بڵێن من لەکوێم و چەندێکە لێرەم؟'
کابرا هەڵی دایەوە و وتی، 'من هانس فان ڕاین، لەگەڵ هاوسەر و هاوکارم، مارتا فان ڕاین، کارمەندی باڵیۆزخانەی هۆڵەنداین لە

میسر، لەوەتەی تۆ لەم نەخۆشخانەیەیت، ئێمە بە جووت شەو و ڕۆژ لاتین، کەسوکاریشت ئاگادار دەکرێنەوە لە باری تەندروستیت، دڵنیا بە، بەزووترین کات سەردانت دەکەن، بۆ وەلامی پرسیارەکەیشت، ئەوە تۆ مانگ و نیوێکە لێرەیت، ئێرە نەخۆشخانەی السلامی نێودەوڵەتییە لە قاهیرە.'

'تکایە پێم بڵێ، بۆ ڕێم کەوتۆتە ئێرە، لە ڕاستیدا هیچم لەبیر نەماوە.'

هانس بەردەوام بوو، 'بەڕێزت، پێشتر چەند ڕۆژێک لە نەخۆشخانەیەکی شاری ئەسیوط بوویت، ئەوەی ئێمە زیاتر ئاگادار بین، تۆ لە بیابان هێرشت کراوەتە سەر و ڕووت کراویتەوە و هەوڵی کوشتنت دراوە، ڕێبوارێک لە بیابان ڕێکەوتی کردوویت و بەبرینداری تۆی گەیاندۆتە یەکێک لە نەخۆشخانەکانی ئەو شارە، لە ڕاستیدا ئێمە زیاتر درێژەی ڕووداوەکان نازانین.'

لەو دەمەدا، چەند کەسێکی تر خۆیان کرد بە ژووردا و دەوری جێگەکەیان تەنیم، کابرایەکی کورتەباڵای سەر سپی، لێم هاتە پێش و وتی، 'مارتن، من جێگری باڵیۆزی هۆڵەندام لە میسر، ئێمە هەموو چاوەڕوانی فەرمانی پزیشکین، هێندەی بزانین، توانای سەفەرت هەیە و سەفەرکردنت بۆ سەر تەندروستیت نابێتە کێشە، بەزووترین کات دەتگەیەنینەوە هۆڵەندا، گرنگ ئەوەیە تۆ ئێستا تەندروستیت بەرەو باشی دەچێت.'

جێگری باڵیۆز ئاوڕی لە هانس و مارتا دایەوە و دیسان وتی، 'هاوکارانم، هانس و مارتا، بەردەوام لە نزیکەوە ئاگادارت دەبن و هەموو پێداویستییەکت بۆ دابین دەکەن، وەکوو چۆن لە یەکەم ڕۆژەوە لێرە بە ئەرکی خۆیان هەڵساون و پێتەوە ماندوو بوون.'

جێگری باڵیۆز، پاش ئەوەی لەگەڵ ئەو چەند کەسەی لەگەلی هاتبوونە ژوورێ، کە هەموویان جلی سپییان لەبەردا بوو، پێدەچوو پزیشک یان کارمەند بن لەو نەخۆشخانەیە و بە عەرەبی لەگەڵ یەکدا دەدوان، لەوەدا بوو بڕۆن و ژوورەکە بەجێ بێڵن، جێگری باڵیۆز ئاوڕێکی لێ دامەوە و وتی، 'هیوای باشبوونت بۆ دەخوازم و بە نیازی دیدار.'

لەدوای ئەمەوە، هەموویان لە ژوورەکەم چوونە دەر و بەتەنیا بەجێیان هێشتم. کاتژمێرێک زیاتر دەبوو چاوم لێک نابوو و لە بیرکردنەوەدا بووم، بە ناوازە چەندین یادەوەریی پارچەپارچەم هاتنەوە یاد، بەلام هیچیان پەیوەندییان بە کات و ساتی ئەو ڕووداوانەوە نەبوو، بەڵکوو هەموو یادگاریی سەردەمی منداڵیم بوون. ئەوسا یادەوەرییەکم بەردەوام لە زەنگی دەرگای خەیاڵمی دەدا و ئەو شەو و ڕۆژە بەرۆکی بەر نەدەدام.

یادگاریی ئەو ڕۆژەی لەگەڵ دایکمدا بووم، تەمەنم چوار ساڵان بوو، خوو و پیشەی ڕۆژانەمان تەنها نیگارکێشان بوو، بەبیرم دێت، بەدرێژایی ئەو ڕۆژە دایکم گوێی لە موزیکی جاز دەگرت، دوایین دەنگی دابووە تەسجیلەکە، بە جۆرێک، هەموو کەرەستەی ماڵەکە لەگەڵ شەپۆلی دەنگی بەرزی موزیکەکەدا دەلەرزین، تاوێک نیگارمان دەکێشا و جارجاریش دایکم ناوبڕێکی وەر دەگرت، دەستی منی دەگرت و پێکەوە سەمامان دەکرد، پاش ئەوەی ماندوو دەبووین، بۆ بەرامبەر کەنفاسەکانمان دەگەڕاینەوە و دەستمان دەکردەوە بە نیگارکێشان. بەبیرم دێت، ئەو ڕۆژە من هەمان نیگاری سەر کەنفاسەکەی دایکمم دووبارە دەکردەوە،

شوێن دەستی ئەوم هەڵدەگرتەوە، ئەو چیی دەکرد، بەدوایدا دووبارەم دەکردەوە، جگە لەو دوو کەنفاسەی لەو کاتەدا کارمان لەسەر دەکرد، بە چواردەورماندا چەندین کەنفاسی ترمان لەسەر سێپاکان دانابوو، ئامادەمان کردبوو بۆ کاری داهاتوومان، ئەو ڕۆژە دایکم چەندین پارچە شۆکۆلاتەی کڕیبوو، بەدەم کارکردنەوە، بەردەوام خەریکی خواردنیان بووین، لەو دەمەدا، دایکم شێتانە پارچە شۆکۆلاتەکەی دەستی لە دەموچاوی خۆی هەڵسوی، بە جۆرێک، دەموچاوی تاوەکوو سەر مل و شانەکانی پێ سواخ دان، تاوێک بوو بەرامبەری ڕاوەستابووم و قاقام لێدەدا و بەپشتا دەکەوتم، ئینجا بەدەم پێکەنینەوە، پارچە شۆکۆلاتەکەی دەستم لە سەر و گوێلاکم هەڵسووی، تەنها چاومان بەدەرەوە بوو، تەنانەت لێو و ددانەکانیشمان ڕەنگی قاوەییان گرتبوو، لەپڕێکدا دایکم هەردوو دەستی بەرز کردەوە و بە دەنگێکی بەرز وتی، 'کوا شۆکۆلاتە نەما، حەزم لە شۆکۆلاتەیە، ئەی چی بکەم ئێستا، ئەی هاوار، چی بخۆم.'
به پێکەنینەوە سەیری منی کرد و دەستی بەرز کردەوە و دیسان وتی، 'ئەوەتا، شۆکۆلاتەکەی من، ئێستا دەیخۆم.'
پەلاماری دام و چەند زمانێکی هێنا بە ڕوومەتمدا، ئینجا لە دەستی هەڵهاتم و ئەویش دەم بە پێکەنینەوە، بە هۆڵەکەدا بەدوامدا ڕای دەکرد، نازانم چەندێکمان پێ چوو، تاوەکوو دوائاسەواری شۆکۆلاتەکەمان بە زمان لە ڕووی یەکتری لستەوە.'

دەنگێک لەو خەیاڵەی دابڕیم، پێش ئەوەی چاوم بکەمەوە، بۆنی یاسەمین دایان بە لووتمدا، کاتێک چاوم هەڵبڕی، پەرستارێکی

باڵابەرزی قژ ڕەشی چاو گەورە بەرەو لای من دەهات، مێزێکی تایە لەژێری بەدوای خۆیدا هێنا و لەلای جێگەکەمەوە ڕای گرت و سەرنجی لە دەموچاوم دا و زەردەخەنەیەکی بۆ کردم، پاش ئەوەی پەردەیەکی بە چواردەوری جێگەکەمدا گێڕا، چەرچەفەکەی لەسەر لا دام، بە پەڕۆیەکی تەڕ، لە تەوقی سەرمەوە تا نووکی پێیەکانمی پاک کردەوە، چاوم لێ نە دەترووکاند و ئەویش ناوبەناو لێی دەڕوانیم و زووزوو زەردەیەکی بۆ دەکردم، بەردەوام ئازای لەشم لەژێر دەستیدا دەیان زیراند. کاتێک تەواو بوو، لە ڕۆیشتندا بوو بانگم لێ کرد و سوپاسم کرد، بێ ئەوەی وەڵامم بداتەوە، دیسان زەردەخەنەیەکی بۆ کردم و لێی دا ڕۆیشت.

ڕۆژی دوایی بەئاگا هاتمەوە لە دەنگەدەنگ و جەنجاڵیی ناو ژوورەکەمدا، نە برسیم بوو نە تینوو، دیار بوو لە ڕێگەی ئەو حەب و دەرزییانەوە ئەوەندە دەرمانیان ڕژاندبووە گەدە و خوێنمەوە، ئیتر پێویستم بە خواردنی نان و ئاو نەبوو.

جێگری باڵیۆز لەبەر پەنجەرەی ژوورەکەمدا لەگەڵ دوو پزیشکدا ڕاوەستابوو، مارتا و هانس خەریکی کارت و کاغەز هەڵواسین بوون بە بۆردی سەر دیوارەکەی بەرامبەرمدا، ئەوەی سەرنجمی لەسەر ئەو بۆردە ڕاگرت، ئەوە بوو کە چاوم لە ڕۆژی پێشوو باشتری دەبینی و یەک یەک کارتەکانم لێک جیا دەکردەوە و چەند نووسینێکیشم بۆ دەخوێنرایەوە، سێ پەرستاریش لە ژوورەکەدا پێکەوە ڕاوەستابوون و بە عەرەبی لەگەڵ یەک دەدوان، هەموو سەرقاڵ بوون بە قسەکردنەوە، کەسیان ئاگایان لای من نەبوو، بە فرسەتم زانی و بێدەنگ تاوێک لە کارتەکانم ڕوانی، گەلێکیان ، ،

خەتی گەورە لە سەریان نووسرابوو، 'تەندروستیت باش بێت.'
دیار بوو، مارتا لەو کاتەدا بەڕێککەوت بۆ لای کۆمیدیی تەنیشت جێگەکەی من هاتبوو، لێی ڕوانیم و بە دەنگێکی بەرز، وەکوو بیەوێت هەمووانی لێ ئاگادار بکاتەوە، وتی، 'مارتن، چۆنیت ئازیز، ئەوە بەئاگایت؟'
زەردەخەنەیەکم بۆ کرد و سەرم بۆ لەقاند، وەکوو هەموو چاوەڕوانی منیان کردبێت، چواردەوری جێگەکەیان دام و کەوتنە لێ ڕوانینم، جێگری باڵیۆز دەستێکی خستە سەر دەستم و بەهێواشی پێی وتم، 'مارتن، لە نزیکترین کاتدا دەگەڕێیتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆمان.'
زیاتر لێم هاتە پێش و دەنگی نزم کردەوە و چاوی لە چاوم بڕی و بەهێواشی، وتی، 'وەکوو باڵیۆزخانەی هۆڵەندا لە میسر، ئەو ئەرکەی لەسەر شانی ئێمە بووە، بێ کەم و زیاد، من و هاوکارانم پێی هەڵساوین، ئێستا ئەوەی ماوە، ئەوەیە بتنێرینەوە بۆ هۆڵەندا.'
مارتا دەستی خستە سەر قەراغی جێگەکەم و وتی، 'تەواو مارتن، ئەمڕۆ یان سبەینێ بە کەسوکارت و هۆڵەندا و ئەمستردام شاد دەبیتەوە.'
جێگری باڵیۆز نوشتایەوە و خۆی لێم نزیک کردەوە، لەبن لێوەوە چپاندی، 'مارتن، تۆ پێش زیاتر لە ساڵ و نیوێک، بۆ حەفتەیەک لە ڕێگەی مۆزەخانەی نیشتیمانیی ئەمستردامەوە بۆ میسر نێردراویت، بە مەبەستی سەردانکردنی مۆزەخانەی نیشتیمانیی قاهیرە، بەڵکوو ئەوسا بەڕێزت نە پەیوەندیت کردبوو بە مۆزەخانەوە لە قاهیرە، نە ئێمەیشت ئاگادار کردەوە، کە چ پلانێکی ترت هەبوون، زیاتر لە ساڵ و نیوێک، لە قاهیرە یان لە هەر

جێگەیەکی تر بوو‌بێتی لە باشووری ئەفریقا، ئێمە لەگەڵ دایک و باوکت و کارمەندانی باڵیۆزخانەی هۆڵەندا لە میسر و حکومەت لێرە، هەموو هەوڵێکمان دا بۆ دۆزینەوەت، هەرچەندە ئێمە لامان وا بوو، کە تۆ ڕفێندرابیت و لە جێگەیەک دەستبەسەر بیت، تۆ دەبووایە ئەو ماوە زۆرەی لێرە بوویت، ئێمەت ئاگادار بکردایەتەوە، تەنها بە نامەیەک یان تەلەفۆنێک، چونکە باڵیۆزخانەی هۆڵەندا لە میسرماڵی هەموو هۆڵەندییەکە، کە دێتە ناو سنووری ئەم وڵاتەوە، مانگ و نیوێک پێش ئێستا، کەسێک تۆی بە نیوە مردوویی گەیاندبووە نەخۆشخانەی سەلامە لە شاری ئەسیوط، هەر هەمان کەس پەیوەندیی بە ئێمەیشەوە کرد، گوایا تەرمی هۆڵەندییەک بە ناوی مارتن سەلەمۆ لە فلان نەخۆشخانەیە، ئەو کەسە تۆی بە مردوویی، لە دەرەوەی شاری ئەسیوط، لە بیابان بەرێکەوت دۆزیوەتەوە، هەرچەندە ئەو نەیویست ناوی خۆی ئاشکرا بکات، پێدەچێت هەر ئەو خۆیشی تاوانبارەکە بێت، ئەوەندەی من لە نەخۆشخانەی ئەسیوطم بیستبێت، یەکەم ڕۆژ تۆیان بەڕووتی گەیاندۆتە ئەو نەخۆشخانەیە، جزدان و پاسپۆرتەکەت و هەرچییەکت لەو کاتەدا پێ بووە، بردوویانە، پۆلیسی شاری ئەسیوط، بەردەوام لە گەڕاندان، لە داهاتوودا هەر هەواڵێکی نوێمان زانی، بێگومان ئاگادارت دەکەینەوە، بە هەرحاڵ، گرنگ ئەوەیە تۆ لە ژیاندا ماویت، لە کۆتاییدا، تەمەنای چاکبوونەوەت بۆ دەخوازم.'

پاشان جێگری باڵیۆز ڕاست بۆوە و لەگەڵ پزیشکەکاندا، بەدەم قسەکردنەوە لە ژوورەکە چوونە دەرەوە. قسەکانی بە جۆرێک قورساییان لەسەر زەینم کرد، لەو ساتەدا بێئاگا مام لەوەی لە

چـواردەورم چـی ڕوویـدا و کـێ چیـی وت، زیـاتر بیـرم لـەوە دەکـردەوە، 'کەسـێک منـی گەیاندۆتـە نەخۆشـخانەی ئەسـیوط. کەسـێک پەیوەنـدیی کـردووە بـە باڵێۆزخـانەی هۆڵەنـداوە، گوایـا تەرمی مارتن ناوێک لەوێیە.'

ئەو قسانەی جێگری باڵیۆز کردنی، لەناو گوێمدا دەزرینگانەوە. تاوێک بوو چاوم لێک نابوو، دەنگم لە خۆم بڕیبوو، دیار بوو مارتـا و هـانس لایـان وا بـوو، کـە مـن خەوتبـووم، لـە سـووچێکی ژوورەکـەدا لەسـەر دوو کورسـی دانیشـتبوون و باسـی ژیـانی خۆیان لە میسر دەکرد، گوێم لێی بوو مارتا بە هانسی وت، 'ئـەم ئاڵۆزییـە سیاسـییەی ئێسـتا وڵاتـی میسـر گیـرۆدەی بـووە، بـۆ ئێمەیەکی ئەوروپی، گونجاو نییە.'

'هـەمان ڕام هەیـە، ئەگـەر وا بـڕوات، شـەریعە دەبێتـە تـاکە یاساوڕێسای وڵات، ئەوسا ئەم وڵاتـە نـەک تـەنها بۆ ئێمـە، بـەڵکوو جێگەی هیچ مرۆڤێکی ئاسایی تێدا نابێتەوە.'

'بـەداخم، بەشـێکی گرنگـی مێـژووی مرۆڤایـەتی لـەم جێگەیەدایـە، ئەگەر ئەو سەلەفییانە دەسەلاتی ئێرە بگرنـە دەسـت، دڵنیام دار و بەردی ئەو ئەهرامانە دەخەنە دەریای سوورەوە.'

چەند جارێک خـەوم لـێ کـەوت و دیسـان بـەئاگا هاتمـەوە، ئـەوان هێشتا هەر دانیشتبوون و بەدرێژایی ئـەو دوانیوەڕۆیـە، بـەردەوام باسی ئێستا و ئەوسـای خۆیان دەکرد، بە قسـەکانیاندا دیـار بـوو، کە دوای دە ساڵێک ژیانیـان لـە میسر، بیانـەوێت بەزووترین کات بۆ هۆڵەندا بگەڕێنەوە.

ڕۆژی دوای ئـەو ڕۆژە، مارتـا بـەئاگای هێنـام، پـاش ئـەوەی

سەرنجی لە دەموچاوم دا، بەدەم پێکەنینەوە پێی وتم، 'هەستە خەوخۆش، وا دوانیوەڕۆیە.'
پێکەوە لەگەڵ هانس، کارتۆنێکیان لەسەر مێزێک دانابوو، ئەو کارت و کاغەزانەی ڕۆژانی پێشوو بە بۆردەکەوە هەڵیان واسیبوو، یەک یەک لێیان دەکردنەوە و لە کارتۆنەکەیان دەنا، هانس بەدەم لێکردنەوەی کارتەکانەوە، لەبەر خۆیەوە وتی، 'مارتن، کاتژمێر یەکی شەو دەبێت لە فرۆکەخانە بیت.'
ئینجا مارتا ڕووبەڕووم هات، لە کاتێکدا دوو بەستە کارتی لەسەریەک کەڵەکەکراوی بە دەستەوە بوو، وتی، 'ناتەوێت بزانیت کێ ئەم هەموو کارتە جوانەی بۆ ناردوویت؟'
سەیرێکی مارتام کرد و پێم وت، 'بەدڵنیاییەوە، لەوەتەی لێرە چاوم کردۆتەوە، بە سەرنجەوە لێیان دەڕوانم.'
'ئەوە هەمووی نییە، بەڵکوو چەندە لێرە دەبینیت، دوو ئەوەندەیش لە باڵوێزخانەیە، هەوڵ دەدەم هەموویان بە پۆست بۆ ئەدرەسی ماڵەکەتان ڕەوانە بکەم، ئەوسا لە ماڵەوە، بەهێمنی دەتوانیت سەیری هەموویان بکەیت.'
سەرم بۆ مارتا لەقاند و هیچم نە وت. لە کاتێکدا ئەوان هەموو سەرقاڵ بوون، سەرم هەڵبڕی و لەژێر چەرچەفە تەنکەکەوە دەستم کرد بە جووڵانی دەست و قاچم، کە هێشتا هەستم بە جۆرێک لە سڕییان دەکرد و بێوچان مێروولەیان دەکرد، دەستم هەڵبڕی و خستمە سەر دەموچاوم، زووزوو بە خۆمم دەوت، 'ئەمشەو دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە، دەگەڕێمەوە بۆ ئەمستردام.'
مارتا لەو دەمەدا، لەسەر قەراغی جێگەکەم دانیشتبوو، لەبەر خۆیەوە وتی، 'دەڵێم مارتن، ئەو ماوە زۆرەی تۆ بێهۆش بوو بە ..

باوکت لات بوو، زۆر خەمبار و تێکشکاو دیار بوو، شەو و ڕۆژ بەدیارتەوە بوو، چاوەڕوان بوو ئاخۆ کەی چاوت دەکەیتەوە.'

بە سەر سوورڕمانێکەوە لە مارتام ڕوانی و پرسیم،

'باوکم!'

'بەڵێ، باوکت، ئەی کارل باوکت نییە؟'

'کارل، کارل لێرە بوو؟'

'چەند ڕۆژێک پێش ئێستا بۆ هۆڵەندا گەڕایەوە، بۆ هەواڵپرسینت، هەموو ڕۆژێک پەیوەندیی بە باڵیۆزخانەوە دەکات، من بە تەلەفون هەواڵی بەئاگاهاتنی تۆم پێ ڕاگەیاند.'

'ئەی دایکم؟'

پاش تاوێک بێدەنگی، مارتا بێ ئەوەی لێم بڕوانێت، سەرێکی داخست و بە غەمگینییەکەوە وتی، 'ئێمە هەموو بەداخ بووین، شێرپەنجە بواری ئەوەی پێ نەدا بە تۆ شاد ببێتەوە، چەندین جار بەو نەخۆشییەوە بۆ سۆراغی تۆ بە مانگ لێرە بوو، مرۆڤێکی ئەوەندە جوان و پڕبەهرە، شایانی ئەوە نییە بە نەخۆشیی شێرپەنجە و ئاوا بەزەلیلی بمرێت.'

گەدەم گوشرابوو، هەستم دەکرد لەوەدا بووم بڕشێمەوە، چاوم پڕ بوو لە فرمێسک و بێ خواستی خۆم، زووزوو دەنگم لێ بەرز دەکردەوە، نازانم زیاتر چی ڕووی دا، یان دەبێت مارتا و هانس لەو کاتەدا چییان کردبێت، تەنها ئەوەندەم لەبیرە، چاوم لێک نابوو، توند دەستم لە قەراغی جێگەکەم گیر کردبوو، پاژنەی پێکانم بە خوارووی قەرەوێڵەکەدا دەکێشا، پێدەچوو لەو کاتەدا پەرستارەکان دەرزیی بێهۆشییان لێ دابم.

لە دەنگێکی گڕ بەئاگا هاتمەوە، کە جارجار لەگەڵ دەنگی دایکمدا

تێکەڵ دەبوو، بەردەوام گوێم لێ بوو، 'مارتن، مارتن.'
ویستم خێرا چاوم هەڵبڕم و لە چواردەورم بڕوانم، پێڵووی چاوم ئەوەندە گران بوو، بۆم هەڵنەدەبڕا، بێوچان زۆرم لە خۆم دەکرد و سەرم بە ڕاست و چەپمدا با دەدا، کاتێک بەئەستەم چاوم کردەوە، تارمایی زەلامێکی درێژ لەلای سەرمەوە ڕاوەسابوو، بە دەستێکم چاوم هەڵگلۆفت و دووبارە لێم ڕوانییەوە، بە شپرزەییەوە سەرم هەڵبڕی و بە سەرنجەوە لەسەر بۆ خوار لێم ڕوانی، لە کاتێکدا هێشتا دڵنیا نەبووم لەوەی کێ دەبینم، ئەو وتی، 'مارتن، ئازیزم شوکور بۆ خوا کە ماویت.'
خێرا دەنگیم ناسییەوە، زۆرم لە خۆم کرد، تاوەکوو لەسەر جێگەکەم خۆم ڕاست کەمەوە و دابنیشم، بە شپرزەییەکەوە، وتم، 'کارڵ، کارڵ تۆیت؟'
دانەوییەوە بەسەرمدا و هەردوو باڵە درێژەکانی بڵاو کردنەوە و باوەشی پێدا کردم و توند بە خۆیەوە گوشیمی، دەموچاوی لەسەر شانم دانابوو و گیانی دەلەرزی، ئینجا لەپڕێکدا دایە پرمەی گریان، خۆمم پێ ڕانەگیرا و بەقووڵی تاوێک بەسەر یەکدا گریاین، هێشتا دەستی لێ بەر نەدابووم و بەدەم گریان و هەنسک هەڵکێشانەوە وتی، 'هەستە، هەستە با بڕۆینەوە بۆ ماڵەوە.'
هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا و لەبەر خۆمەوە وتم، 'بە شانازییەوە.'
دوای ئەوەی کارڵ چەندین جار ڕوومەتمی ماچ کرد و تاوێک بوو دەموچاومی لەناو هەردوو دەست و پەنجە درێژەکانی ڕاگرتبوو، بێوچان لە چاومی دەڕوانی، وەکوو بیەوێت لەوە دڵنیا ببێت، کە ئەوە مارتن خۆیەتی، لەو کاتەدا گوێم لە دەنگی مارتا بوو، 'دەی

کوڕینە، دەستوبردی لێ بکەن.'

هانس هاتە پێشەوە لێم و سەرێکی با دا و لێی پرسیم، 'پێم بڵێ، مارتن، ئامادەیت بۆ باوەشی نیشتمانی باوکت بگەڕێیتەوە؟'

سەیرێکم کرد و بە پێکەنینێکەوە پێم وت، 'نەخێر هانس، بە شانازییەوە ئامادەم بۆ باوەشی نیشتمانی دایکم بگەڕێمەوە.'

هەموو دەستمان کرد بە پێکەنین و هانس وتی، 'بمبوورە، با بەدڵی تۆ بێت.'

لەو دەمەدا، چەند کارمەندێکی نەخۆشخانەکە خۆیان کرد بە ژووردا، یەکێکیان کورسییەکی تایەلەژێری بە دەستەوە و تا تەنیشت جێگەکەم هێنای، کارڵ و هانس لێم هاتنە پێش و ویستیان یارمەتیم بدەن، تاوەکوو بچمە سەر کورسییەکە دابنیشم، هێشتا ماسوولکەکانی لەشم سڕ و ماندوو بوون، بەئەستەم توانیم پێیەکانم لەسەر جێگەکە دابگرم و لەسەر کورسییەکە دابنیشتم، پاشان کارڵ لەپشتمەوە ڕاوەستا و دەستی کرد بە پاڵ پێوەنانم.

کاتێک گەیشتینە دەرەوەی نەخۆشخانەکە، پۆلیسێکی سپی پۆش دارێکی لە بنهەنگڵدا بوو، ڕاست لە بەردەرکی دەرەوەی نەخۆشخانەکەدا ڕاوەستابوو، هەموو مووەکانی لەشم ڕاست بوونەوە و کوتوپڕ ئارەقێکی سارد لەشمی تەڕ کرد، تاوەکوو لێی تێپەڕین چاوم لێک نابوو، گەیشتینە لای ئوتومبێلێکی نەخۆشبەر، دواماڵئاواییمان لە مارتا و هانس و پەرستار و پزیشکەکان کرد، هەموو یەک یەک دەستی تەوقەیان بۆ درێژ کردم و بەگەرمی هیوای چاکبوونەوەیان بۆ خواستم، من و کارڵ لە کابینەی پشتەوەی ئوتومبێلەکەدا بە شانی یەکەوە دانیشتین، کابرایەکی ڕەشتاڵەی لاوازیش ئوتومبێلەکەی لێدەخوڕی و ئافرەتێکی سپی

پۆشیش لەپێشەوە دانیشتبوو، بەردەوام بەدرێژایی ئەو ڕێگەیە، کە کاتژمێرێـک زیـاتر دەبـوو بـەڕێوە بـووین، دەمیـان دانەخسـت و بێوچان بە دەنگی بەرز قسەیان دەکرد.
کارڵ تورەکەیەکی ڕاستوچەپ لـەمل کردبوو، پێش ئـەوەی بگەینـە فڕۆکەخانــە، کردییــەوە و یەک یەک تەماشــایەکی پاســپۆرتەکانی کـرد، لــە کاتێکـدا ســەرقاڵی تەماشـاکردنی نـاو تورەکەکـە بـوو، گورزەیەک کلیلی دەرهێنا و لەسەر ڕانی چەپی دای نـا، بێ ئـەوەی پرسی پێ بکەم، گورزە کلیلەکەم خستنە نێو مشتم و لێم پرسـی، 'کارڵ ئەو هەموو کلیلانە چین؟'
بـێ ئـەوەی لـێم بڕوانێت، بـەدەم تەماشـاکردنی نـاو تورەکەکـەوە، وتی، 'کلیلیماڵەوەن.'
گورزە کلیلەکەم لەناو مشتم توند گرت، ڕووم لە کارڵ وەر گێڕا و بێدەنگ لـە گڵۆپی شـەقامەکانم ڕوانـی، لـە کاتێکدا کە ئۆتومبێلەکە بەخێرایی بەلایاندا تێدەپەڕی.

# ٢١

## هەوسەت

پێنجی مانگی چوار، دوای زیاتر لە ساڵ و نیوێک، بۆ شاری ئەمستردام گەڕامەوە، ئەو بەیانییەی بە جێبە سەوزەکەی کارڵ گەیشتینە ناو شار و خۆمان بە کۆڵانی فریدریکدا کرد، باران بەلێزمە دەباری و ڕەشەباش سەمای بە لێشاوی تنۆکی بارانەکان دەکرد، کاتێک گەڕەکەکەمانم بینی، کە چۆن نوێ کرابووەوە و داربەڕووە پیرەکان و دارگلۆپەکانی سەر شۆستەکان لا برابوون، غەریب و ڕەشوڕووت هاتە پێشچاوم. لە سەرەتاوە وام دەزانی کارڵ بە هەڵە ڕۆیشتووە، خۆی کردووە بە کۆڵانێکی تردا، کاتێک گەیشتینە بەردەمی ماڵەکەمان، ڕوانیم ئەو داربەڕووانەی بە هەموو تەمەنی من بە چواردەوری ماڵەکەماندا بوون، ئاسەواریان نەمابوو، لە جێگەیان، نەمامی کورتەباڵا و زەردەڵە نێژرابوون، چواردەوری ماڵەکە، یەکپارچە کرابوو بە هەرێز، ڕەنگی دەرگای گەراج و ماڵەکەیشمان گۆڕابوو.

کارڵ جێبەکەی لە بەردەمی گەراجەکەدا ڕاگرت و دابەزی، لە

ماڵەکەم دەڕوانی و هێشتا کلیلەکانم توند لەناو مشتم گرتبوو، کاتێک لەناو لەپی دەستمم ڕوانی، بینیم ئاسەواری فۆرمی چەندین کلیل لە پێستی بەری دەستمدا دیار بوو.

خۆم دەرگای ماڵەکەمانم کردەوە، پێش کارڵ چوومە ناو داڵانەکە و تاوێک لە دیوارەکانم ڕوانی، زۆرم لە خۆم کرد و بە چەند هەنگاوێک، خۆم گەیاندە هۆڵی دانیشتنەکە و لە ناوەڕاستیدا ڕاوەستام، بێجگە لە دوو کورسی و مێزێک، کە تەلەڤزیۆنێکی لەسەر بوو، هیچی تری تێدا نەبوو، تەنانەت دیوارەکانیشی سپی کرابوونەوە و هیچیان پێوە نەبوو، بێدەنگییەک دای گرتم و بەردەوام دەستم لە یەک هەڵدەگلۆفین، لە تینووانندا قوڕگم بە مەلاشومەوە نووسابوو، تووشی تەنگەنەفەسییەک ببووم، سنگم وەختەبوو شەق بەرێ، ئینجا چووم بۆ مەتبەخەکە و لەوێوە، بێ ئەوەی ئاوڕ لە کارڵ بدەمەوە، کە بەردەوام بەدوامەوە بوو، زووزوو بە سەرنجەوە لێی دەڕوانیم، گیانی پڕ لە ئازار و سڕم بەداوی خۆمدا کێش کرد و چووم بۆ نهۆمی سەرەوە، یەک بە یەکی ژوورەکانم بەسەر کردەوە، بێجگە لە ژوورەکەی دایکم، کە قەرەوێڵەیەکی ئاسن و دۆشەکێک و بەتانییەکی لەسەر قەد کرابوو، وەکوو تر، هەموو ماڵەکە گسکی لێ درابوو، دیوارەکانی لە سەرەوە تا خوار پاک کرابوونەوە و ڕەنگێکی سپی کرابوون.

کاتێک گوێم لە دەنگی پێیەکانی کارڵ بوو بە پلیکانەکاندا هات بۆ نهۆمی سەرەوە، چاوم تەڕ بوو، ویستم کارڵ دڵشکاو و بێزار نەمبینێت، خێرا چووم بۆ حەمامەکە و لەسەر دەستشۆرەکە دوو چنگ ئاوم پرژاند بە دەموچاومدا، کاتێک لە ئاوێنەکەدا لە خۆمم ڕوانی، چەند هەناسەیەکی پێ چوو، هەتا ڕوخساری خۆمم تێدا

ناسییەوە. کاتێک کارڵ هاتە بەردەمم، گۆزەیەکی دەسکداری سەرگیراوی بە دەستەوە بوو، بۆی ڕاگرتم و پێی وتم، 'ئەوەیش خۆڵی لاشەی دایکتە.'
کاتێ بە دڵتەنگییەکەوە گۆزەکەم لێ وەر گرت، زەرفێکیشی لە گیرفانی دەرهێنا و ئەویشی بۆ ڕاگرتم و دیسان وتی، 'دایکت داوای لێ کردم، ئەم زەرفەیشت بدەمێ.'
تاوێک بێدەنگ لە گۆزە و زەرفەکەی دەستم ڕوانی و لە دڵی خۆمدا وتم، 'دایکە، ئەوا پێت شاد بوومەوە.'
کاتێ لەگەڵ کارڵ لە دالانی نهۆمی سەرەوەدا ڕاوەستابووین، پشتم تێ کرد و چووم بۆ ژوورەکەی خۆم، گۆزە و زەرفەکەی دەستم لەسەر قەراغی پەنجەرەکە دانا و بێدەنگ بۆ لای کارڵ گەڕامەوە. کارڵ بە سەرسامییەکەوە لێی ڕوانیم و پێی وتم، 'مارتن، دەزانم ماڵەکە ئاوا بۆ تۆ ناخۆشە، بەچۆڵی دەیبینیت، بەڵام بێخەم بە، هەموو شتێکی تۆ و دایکتم پاراستووە و لە گەراجەکەن.'
بە ساردییەکەوە لە کارڵم ڕوانی و لێم پرسی، 'پێم بڵێ، دایکم کەی مرد؟'
'شەش مانگێک پێش ئەمڕۆ، لە نەخۆشخانە کۆچی دوایی کرد، هەر چنگێکی مابووەوە، ئەو شێرپەنجە کوشەندەیە، ئازای گیانی خواردبوو، ئەندامەکانی لەشی لە کار کەوتبوو، بەڵام چاوی شەو و ڕۆژ زرت دەیانڕوانی و چاوەڕوانی بینینەوەی تۆیان دەکرد، پێش ئەوەی تەواو پەکی بکەوێت، بەو نەخۆشییەوە هەرسێکمان بۆ سۆراغی تۆ بەردەوام بە ڕێگەی میسرەوە بووین.'
'هەرسێکتان؟'

'بەڵێ، من و دایکت و کارمن.'

دڵـم داخورپـا، تەزوویـەک لـە تـەوقی سـەرمەوە تـا کەڵەپەنـجەی پێیەکـانم ڕای وەشـاندم، سـەرم هـەڵبڕی و تاوێـک لـە بنمیچـی دالانەکەم ڕوانی، وەکوو لە خەیاڵمدا، لە وێنەیەکی کارمن بگەڕێم، شڵەژام و بـە دەنگێکی گڕ پرسـیم، 'کـارمن، چۆن کـارمن، یـانی کارمن بەردەوام...'

قسەکەم بۆ تەواو نەکرا، پاشان کارڵ بەردەوام بوو، وتـی، 'بـەڵێ، کـارمن، ئـەو پەیوەنـدیی لـێ نـەبڕیوین، دوای سـەفەرەکەی تـۆ بـۆ میسر، کـاتێ دوو حەفتـە بـە سـەردا تێپـەڕی و تـۆ هـیچ هـەواڵێکت نەبوو، ئینجا دایکت پەیوەندیی کرد بە بەڕێوەبـەری مۆزەخانـەوە، مەبەسـتم هێنـری پراخـە، لێپرسـراوی کارەکـەت، ئەوسـا هێنـری پەیوەندیی کرد بە مۆزەخانەی قاهیرەوە، ئینجا لامان ئاشکرا بوو، تۆ پەیوەندییت بـەو مۆزەخانەیـەوە نـەکردبوو، دەمـانزانی لـەو ڕۆژ و کاتەدا لە فڕۆکەخانـەی قـاهیرە دابـەزیبوویت، بـەڵام لـەدوای ئـەو ڕۆژەوە، کـەس هـیچ هـەواڵێکی نـەدەزانیت، دەزانیـت مـارتن، ئێمـە چەند هەوڵمان دا، باوەڕ بکە زیاتر لە ملیۆنێک وێنەی تۆمان کۆپی کرد و بە هەموو کوچە و کۆلانەکانی شار و شارۆچکەکانی وڵاتـی میسـردا بڵاومـان کـردەوە، ئیتـر بـا هـەوڵ و کۆششـی کارمەنـدانی باڵوێزخانەی هۆڵەندا لـەولاوە بوەسـتێ، چەنـدێک پێمانـەوە مانـدوو بوون، حکومـەتی میسـریش بـە هـەمان شـێوە، تیمێکیـان لەگەڵمانـدا تـەرخان کردبـوو، بـە دوو شـۆفێر و دوو ئۆتـومبێلی خۆیانـەوە، لەسەر نەخشە، سەرتاسـەری وڵاتـی میسر لەگەڵمانـدا گـەڕان، هـەر وا ئاسان نەبوو بۆ من لەگەڵ ئافرەتێکی نەخۆشی وەکوو دایکت و یەکێکی تری دووگیان، با ئەو گەرمایەیش لەولاوە بوەستێ، بـاوەڕ

بکە جێگە نەمابوو لە میسردا نەچین.'
'جگە لەو جێگەیەی منی لێ بووم.'
'کام جێگە؟'
'ئاخ، کارل، لە ڕاستدا خۆیشم نازانم لە کام جێگە بووم.'
'چەندین جار لە ڕادیۆ و تەلەڤزیۆنەکانی ئەو وڵاتەوە، بانگەوازمان بڵاو کردەوە، تەنانەت دایکت خۆی دوو جار چووە سەر تەلەڤزیۆن و بە دەنگ و ڕەنگی خۆی بانگەوازی کرد.'
'کارل، با پشوویەک بدەم، ئەوسا زیاتر قسەی لەسەر دەکەین، ئێستا پێم بڵێ، کارمن چۆنە و لەکوێیە؟'
'باشە، زۆر باشە، لێرەیە، لە ئەمستردام، لەگەڵ کچەکەیدا دەژی.'
'چیی، کارل، ئایا تۆ دەزانیت من پرسیاری کێت لێ دەکەم؟'
'بەڵێ، بەڵێ، بەدڵنیاییەوە، کارمن فرانکلین، ساڵ و نیوێک پێش ئێستا، لە بەلجیکاوە گواستیەوە تا لە ئەمستردام نزیکی ئێمە بژی.'
'ئەی دایکی؟ هەروەها تۆ باسی منداڵت کرد، کارمن منداڵی هەیە؟ تۆ دڵنیایت کە...؟'
'وابزانم، کارمن پەیوەندیی لەگەڵ دایکی نەماوە، کچەکەیشی، ناوی لۆتەیە و تەمەنی وا دەبێت بە ساڵێک.'
تاوێک بێدەنگ سەرنجم لە کارڵدا، بێ ئەوەی زیاتر هیچ بڵێم، پشتم لە کارڵ کرد، چەند هەنگاوێکم نا و دەستم بە قەراغی تەیمانی پلیکانەکاندا گرت و هێواش هێواش چوومە خوارێ، لە هۆڵەکە، لەسەر یەکێک لە کورسییەکان بێدەنگ دانیشتم، ناوی کارمن و لۆتە بەردەوام لەناو گوێمدا دەزرینگانەوە.
کارڵ هێشتا لە قاتی سەرەوە بوو، کاتێ لەناو بێدەنگیی ژوورەکەدا و لەسەر کورسییەک چاوم لێک نا و خۆم لێ درێژ

کرد، کوتوپڕ خۆم لە بیابانێکدا بینییەوە، بەردەوام لم بەسەرمدا دەباری و ڕەشەبایەک شەپۆلی بە لمەکە دەدا و وەک مزراح، بەدەوری خۆمدا دەیخولاندمەوە، لەناو ئەو دەریای لمەدا، بێ ئارام پەلەقاژێ و باڵەکوتەم بوو، دەستم دەکوتا لە چواردەورم، گفەی باکە وەک کوتەکێک دەیدا لە پەردەی گوێم، دەنکە لمە سوورەوەبووەکانیش، یەک یەک گەرمیی خۆیان لە پێستم دەسوی، بۆنی میزی جرج لووتیان پڕ کردبووم، چاوم پڕ بوو لەو وردەزیخانەی وەک پشکۆ دەگڕان، چەند جارێک لووتم بە لووتی مەرگدا تەقییەوە.

لە دەنگی خۆم بەئاگا هاتمەوە، بینیم کارڵ لەپێشمدا بە چۆکدا هاتبوو، هەردوو دەستمی توند گرتبوو، بۆنی ئارەقی لەشی خۆمم دەکرد، کارڵ پاش ئەوەی بە بەزەییەکەوە لە چاومی ڕوانی، پێی وتم، 'وەرە با بڕۆین، دەچین بۆ سەنتەری شار، پاشان لەوێ، لە چێشتخانەیەک نان دەخۆین.'

چەند ڕۆژێکی بەسەردا تێپەڕی، هەستم دەکرد ئەو ڕووداوانە، هەموو یەک یەک لە قووڵایی ڕۆحمدا لانەیان بۆ خۆیان دروست کردووە، بوون بە بەشێک لە من و لێم جیا نابنەوە، برینەکانی سەر جەستەم و ناو ڕۆحم ئەوەندە سەختن، بە هیچ دەوایەک ساڕێژ نابنەوە، نەمدەوێرا بۆ ساتێکیش چییە، چاوم لێک بنێم، شەوان بە سێ دەنک حەبی ڤالیۆم، چەند کاتژمێرێک دەخەوتم.

بەبیرم دێت، سمکۆ فەرهاد هەموو جارێک پێی دەوتم، 'توانیم جەستەم لەناو جەنگدا دەرباز بکەم و لێی هەڵبێم، بەڵام هەرگیز ناتوانم جەنگ لەناو ڕۆحم دەر بکەم.'

سمکۆ ئەمەی لە کاتێکدا دەوت، کە من لێم دەپرسی، 'بۆچی تۆ تەنها لە ڕابردووت دەدوێیت، لە باسی ڕابردووت و جەنگ زیاتر، هیچ باسێکی ترت لا نییە!'

ئەوسا کارڵ هەموو شتێکی بۆ ساز و ئامادە کردبووم و زۆر ماندوو دەبوو پێمەوە، نەمتوانی لە هیچ یەکێک لەو شتانەی بۆ حەوانەوەم ئامادەی کردبوو، بە دڵ بەشدار ببم، ماڵەکە لە یادەوەرییەکانم پاک کرابووەوە، بۆنی ڕابردووی لێ نەدەهات، مۆرک و جێگەدەستی دایکم سڕابوونەوە، لە ڕێگەی هیچ هەستێکمەوە نەمدەتوانی لە ماڵەکەدا ساتێک بەر ڕۆحی دایکم بکەوم و یادەوەرییەکی سەردەمی منداڵیم زیندوو بکەمەوە، وا هەستم دەکرد، بە شێوەیەکی کاتی تێیدا دەژیم، بەردەوام بە خۆمم دەوت، 'کاتێک دێت لە گۆشەیەک، کە نازانم ئێرەیە یان جێگەیەکی تر، دیسان ژیان دەست پێ دەکەمەوە.'

## ٢٢

# کارڵ

حەفتەیەک بوو لە میسر گەڕابوومەوە، ئەو بەیانییە، وەکوو هەموو بەیانییەکانی تری ئەو حەفتەیە، لە دەنگی خۆم و لەناو تەڕیی ئارەقی لەشمدا بەئاگا هاتمەوە، ماڵەکە بێدەنگ بوو، پەنجەرەی ژوورەکەم، کە هێشتا پەردەمان پێوە نەگرتبوو، بەیانییان زوو ژوورەکەمی پڕ دەکرد لە ڕووناکی، ئەو بەیانییە بەهەڵەداوان لەناو جێگەکەم هاتمە دەر، پانتۆڵ و کراسەکەم، کە ڕۆژی پێشوو بەسەر قەراغی جێگەکەمدا دابوو، لەبەرم کردن و بەپەلە لە ژوورەکەم دەر چووم، دیار بوو کارڵ هێشتا خەوتبوو، پاش چەند هەناسەیەک، خۆمم لەناو باخەکەماندا بینییەوە، هەوایەکی سارد و شێدار دای بە ڕوومدا، هەرێزەکە هێشتا تەڕیی شەونمی شەوی لەسەر بوو، گەڵای درەختەکان تەڕ دەیاننوواند، هەوای ئەو بەیانییە ئەوەندە شێدار بوو، کە تەیمانی جاڵجاڵۆکەکانیش دڵۆپ دڵۆپ شەونمیان لێ دەچۆڕا، ڕیزبەندیی دڵۆپی شەونمەکان بە خەتی تەیمانی جاڵجاڵۆکەکانەوە، لە

ملوانکەی مەرجان دەچوون، ئەو بەیانییە نە باڵندەیەکم بینی بفڕێ و نە گوێم لە دەنگی جریوە و خوێندنیشیان بوو، لە دوور گوێم لێ بوو زەنگی کەنیسەیەک بێوچان لێی دەدا.

بەرەو سەنتەری شار کەوتمە ڕێ، لە خەیاڵمدا بوو سەردانی قاوەخانەی گرانت بکەم، بە خۆمم وت، 'بەم بەیانی زووە تەنها خزمەتچییەکان لەوێن!'

وزەی خواستێک لە ناخمدا داوای لێ دەکردم پێیەکانم هەڵبگرم و هێز بدەمە بەر خۆم، تا خێرا بگەمە سەنتەری شار، ئاسەواری برین و شکاوییەکانی لەشم، لەگەڵ هەموو هەنگاوێکمدا دەیان زریکاند، لە ڕێگە بارانێکی لەناکاو دای کرد، هەستم بە یەکەبەیەکی ئەو دڵۆپانە دەکرد، کە دەکەوتنە سەر پێستی ڕزیو و وشک هەڵاتووم و تاڵی مووەکانمیان ئاو دەدا، بەدەم خەیاڵ و ونبوونم لەناو یادەوەرییەکانی ڕابردوومدا، بە بەردەم قاوەخانەی گرانتدا تێپەڕیبووم و بێئاگا بووم لێی، کاتێک گەیشتمە سەر شەقامی باخ لە گەڕەکی یۆردان، سەرسام و دڵگوشراو، لەمبەر و ئەوبەری ئەو شەقامەم دەڕوانی و لە خانووی ژمارە چلوهەشت دەگەڕام، ئەوەندە بێ ئارام و شپرزە بووم، هەموو ئەو پیادەڕەوانەی بەلامدا تێدەپەڕین، بە سەرنجەوە لێیان دەڕوانیم، لەژێر لێوەوە بەردەوام ژمارە ٤٨م دووبارە دەکردەوە، کاتیک خانووی ژمارە ٤٧م تێپەڕاند، بێ ئارام دڵم خێرا خێرا لێی دەدا، ماڵێکی دوونهۆمی، دیاربوو تازە نۆژەن کرابووەوە، دەرگایەکی سپیی گەورە، ماڵێکی پڕ لە پەنجەرە، پەردەکانی دادرابوونەوە، چەند جارێک سەرم نا بە شووشەی پەنجەرەکانەوە و ویستم هەر هیچ نەبێت، پێش ئەوەی لە دەرگا بدەم، سۆراغێکم دەست بکەوێت،

نازانم چەندێک بوو لە بەردەم ئەوماڵەدا ڕاوەستابووم و لە سەر بۆ خوار لە پەنجەرەکانم دەڕوانی، لەوە دەچوو بمەوێت هێزێک لە خۆمدا کۆ بکەمەوە، لە خەیاڵمدا بەردەوام وشەسازیم دەکرد، وشەم پێکەوە دەنا و لە ڕستەیەکی گونجاو دەگەڕام، نەمدەزانی ئاخۆ چی بڵێم و لەکوێوە دەست پێ بکەم، بەردەوام دەستم لێک هەڵدەسووین، هەرچەندە لەو دەمەدا باران و سەرماش بوو، بەڵام گەرمییەک لەشمی داگرتبوو، هەستم دەکرد هێشتا لەبەر ئەو خۆرە گەرم و سووتێنەرەی بیابانەکانی ئەفەریقادام، هەموو لەشم ئارەقی لێ دەچۆڕا.

چەند کەسێک بەلامدا تێپەڕین، سەگەکانیان بێ ئارام پێم دەوەڕین، وەختەبوو قاییشەکانی ملیان دەبچڕاند، دەمزانی ئەو ئاژەڵانە هەست بە بێ ئارامیی ڕۆحم دەکەن، تاوێک بوو هەردوو لەپی دەستم لەسەر ڕووی دەرگاکە دانابوو، سەرم خستبووە نێوان دەستم و ناوچەوانم نابوو بە ڕووی دەرگا ساردەکەوە، تەزووی ساردی دەرگاکە گەیشتنە ناو سەرجەم خانەکانی لەشم، هەناسەیەکم هەڵکێشا و بە دڵشکاوییەکەوە پشتم لە ماڵەکە کرد، چۆن چووبووم، ئاوایش بە هەمان ڕێگەدا بۆ ماڵەوە گەڕامەوە.

کاتێک گەیشتمە ناو دەرگای چێشتخاکەمان، کارڵ خەریکی قاوەلێنان بوو، دیار بوو تازە بەئاگا هاتبوو، چونکە بەردەوام چاوی هەڵدەگلۆفی و هێشتا بۆنی پاشماوەی خەوی لێ دەهات، کە بۆنی تێکەڵی بۆنی ئەرۆمای قاوەکە دەبوو. کارڵ لە ڕێوە، بێ ئەوەی لێم بڕوانێت، پرسیی، 'قاوەیەکی گەرم دەخۆیتەوە؟'

'بێگومان.'

'چوویت بۆ کوێ، بۆ چاوەڕوانی منت نەکرد؟'

'بۆ گەڕەکی یۆردان.'

'بەڕاست، ئەی کارمنت بینی؟'

'نەخێر، بەس...'

'مارتن، بەگومان مەبە لە کارمن.'

'نا، گومانم نییە لەو، بەڵکوو بەگومانم لە خۆم.'

'تۆ هێشتا ماندوویت، پێویستیت بە پشووی زیاتر هەیە.'

'ماندوویێتی شتێکە و تێکشکانیش شتێکی تر.'

'هەرچەندە دوو جاریش چوویت بۆ لای پزیشکی دەروونی، بەڵام لەگەڵ مندا دەتوانی گرێکانی دڵی خۆت بکەیتەوە.'

لە کاتێکدا کارڵ بەدەم قسەکردنەوە کوپێک قاوەی گەرمی دایە دەستم، لێم ڕوانی و لێم پرسی، 'کارڵ، باسی خۆتم بۆ بکە، پێم بڵێ دایکمت چۆن ناسی؟'

'بۆ، ناسینی منیش گرێیە لە دڵتا؟'

'ئەی چۆن، بەبیرم دێت، جارێکیان وتت، لە کەشتیی ماسیگرتنەکەی باوکتدا لەدایک بوویت.'

لە هۆڵەکە، لەسەر کورسییەکان دانیشتبووین، ئینجا کارڵ دوای تاوێک بێدەنگی و بیرکردنەوە، بەسەرهاتی خۆی ئاوا بۆ گێڕامەوە: 'بەڵێ، پەنجاوشەش ساڵ پێش ئێستا، لە بەلەمێکدا، لە بەندەری دوورگەی تێسڵ لەدایک بووم، باوکم، وەکوو زۆرینەی دانیشتووانی دوورگەکە، ماسیگر بوو، خاوەنی بەلەمێکی ڕاویش بوو.

کاتێک من لە دایکبووم پیتەری براگەورەم تەمەنی دە ساڵان بوو، من و پیتەر و باوکم و دایکم لە دێی دەکۆخ، لە خانوویەکی گەورەدا، لە هەمان دوورگە دەژیاین، دەتوانم بڵێم هەژار نەبووین،

باوكم ڕۆژانە هێندەی ماسی دەگرت، کە بژێویی ژیانمانی دابین دەکرد، دایک و باوکم کاتۆلیک بوون، من و پیتەر لەسەر ڕێنمایی و ڕۆشنایی ئەو باوەڕەدا گەورە کرابووین، لە ڕاستیدا ئەوەیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە مامم، با بڵێین براگەورەکەی باوکم، قەشەی کەنیسەی دێیەکەمان بوو، بەبیرم دێت، باوکم هێندەی لە ماسیگرتن و کەنیسە بوو نیو ئەوەندە لە ماڵەوە نەبوو.
لە ماڵی ئێمەدا، زۆر بەکەمی قسە دەکرا، بە هۆی ئەوەی دایکم کەڕولاڵ بوو، من و براکەم وا ڕاهاتبووین، ئەگەر تەنیاش بووینایە، هەر بە ئاماژە یەکترمان دەدواند، ئەگەر سەرنجت دابێت، کە لەگەڵ تۆدا قسە دەکەم، بە دەستم ئاماژە بە مانای زۆرینەی قسەکانم دەکەم، مەبەستم، یانی سەیر نەبێت بەلاتەوە.
با بێمەوە سەر باسەکەم، باوکم زۆر بێحەوسەڵە و تووڕە بوو، بەبیرم نایەت کە جارێک دواندبێتمی یان لێی ڕوانیبێم، یان دەستێکی بە سەرمدا هێنابێت، هەر ئەوەیش هۆکار بوو، کە من و پیتەر بەردەوام بە ئاماژە یەکتری بدوێنین.'
'ئەی ئێستا براکەت لەکوێ دەژی، ئایا پەیوەندیتان پێکەوە ماوە؟'
'ئارامت بێت، با لە سەرەتاوە بۆت باس بکەم. کاتێک تەمەنم بوو بە دە ساڵ، پیتەر بیست ساڵان بوو، لەگەڵ ئەوەیشدا کە دە ساڵێکمان بەین بوو، پەیوەندییەکی بەهێزمان پێکەوە هەبوو، هەروەها لە ژوورێکدا دەخەوتین.
باوکم هەموو جارێک پێی دەوتین، ئێوە وەکوو کوڕی ماسیگرێک لەدایک بوون، بەشی ئێوە هەر هێندەیە، کە خودا پێی داون و دەبێت پێی ڕازی بن، لە کاتێکدا باوکم ئەمەی دەوت، کە پیتەر بەردەوام ناڕەزایی و بێزاریی لە ژیان لەو دوورگەیە دەر دەبڕی.

ئەوسا پیتەر هەردەم خەونی بە گەشت و ڕۆیشتنەوە دەبینی، هەستم پێ دەکرد، کە هیچ شتێک لەو دوورگەیەدا دڵی ئەوی خۆش نەدەکرد.

بەبیرم دێت، ئەوسا ئەو ڕادیۆیەکی هەبوو، بەدزیی باوکمەوە گوێی لێ دەگرت، لە کاتێکدا ڕادیۆ و تەلەڤزیۆن لە ماڵی ئێمەدا یاساغ بوون، بێجگە لەوەیش لە کتێبی ئینجیل زیاتر هیچ کتێبێکی تر لە ماڵەکەماندا نەبوو، ئەوەی لە قوتابخانە باس دەکران و دەمانخوێند بۆمان نەبوو لە ماڵەوە باسیان لێوە بکەین، هەرچەندە ئەوسا پیتەر کتێبی تری بەدزییەوە دەخوێندنەوە و کاتێک تەنیا دەبووین، هەمووی بۆ باس دەکردم، ڕۆژێکیان پیتەر بە بەلەمە چارۆکەدارەکەی لە بەندەرەکە دەر چوو.

هەروەک خۆی هەموو جارێک دەی وت، دەچم فەڕڕەیەکی دەریا لێدەدەم و ئێستا دێمەوە، ئەو ڕۆیشتنەی ڕۆیی، دوای سێ ڕۆژ گەڕایەوە، باوکم پاش ئەوەی لێی تووڕە بوو، هەڕەشەی لێ کرد کە بەلەمە چارۆکەدارەکەی بسووتێنێت، ئەوسا ئەو بە باوکمی وت، "ڕەشەبای دەریا ڕێگەی پێ گۆڕیم و چەند شەو و ڕۆژ ناچار لە دەریادا مامەوە."

هەر ئەو شەوە پێش خەوتن بۆ منی باس کرد، کە بۆ شاری ئەمستردام چووبوو، ئەو شارەی ئەو خەونی پێوە دەبینی و تەمەنای بوو تەنها بۆ جارێکیش بێت بیبینێت، باوەڕ بکە مارتن، ئەوسا ئەو هێندەی باسی جوانیی ئەم شارە بۆ کردم، ئاوا تامەزرۆی بینینی بووم و ئەوسا هەمیشە خەونم پێوە دەبینی، جگە لەوە، هەموو شەوێک نەخشەی دونیای دادەنا و دەستی بە هێڵکاری و نووسین دەکرد، بە مەبەستی ئەوەی بە بەلەمە

چارۆکەدارەکەی، گەشتەکەی دەست پێ بکات و هەموو دونیا بگەڕێت.

چەند جارێک پێی وتم، کە لای باوکم باسی نەکەم و با نهێنیی نێوان خۆمان بێت، بەدرێژایی ئەو ساڵانە، کتێبەکەی چارلس داروین، گەشت بە بیگڵ دا، لەژێر سەرینەکەیدا بوو، شەو تا بەیانی سەری بەسەردا دەگرت و دەیخوێندەوە.

بەبیرم دێت، جارێکیان پیتەر پێی وتم، "من دەمەوێت لە دەریادا جێپێی داروین هەڵبگرمەوە و بۆ هەموو ئەو جێگەیانە بچم، کە ئەو کاتی خۆی بۆیان چووە."

ناوی هەموو ئەو جێگە و ڕێگەیانەی لەبەر کردبوو، کە کاتی خۆی داروین چووبوو یان پێیاندا تێپەڕیبوو، بەلەمە چارۆکەدارەکەیشی ناو نابوو بیگڵ، ناوی ئەو کەشتییە بوو، کە داروین گەشتە مێژووییەکەی پێ کردبوو.

کاتێک تەمەنم شازدە ساڵان بوو، لە ڕاستیدا لە خەیاڵمدا نەماوە چ ڕۆژ و مانگێک بوو، بەیانییەکیان زوو، پیتەر لەخەو بەخەبەری هێنام و پاش ئەوەی دەستی کردە ملم و تێر ماچی کردم، بینیم جلە موشەماکانی باوکمی لەبەردا بوو، ئەو جلانەی باوکم لەبەری دەکرد لە کاتی ماسیگرتندا، توورەکەیەکی گەورەی بە دەستەوە بوو، ماڵئاوایی لێ کردم و وتی، "دەڕۆم گەشت دەکەم، دەزانم دەڕۆم، بەلام نازانم دەگەڕێمەوە یان نا."

کتێبەکەی داروینی لەناو دەستدا بوو، بەرەو ڕووم ڕای گرت و دیسان وتی، "ئەو کتێبەیش بۆ تۆ، من پێویستیم پێی نییە، چونکە هەموویم لەبەرە، بەلام کارڵ، با نهێنیی بەینی خۆم و خۆت بێت، ئەگەر پرسیاری منیان لێ کردیت، تەنها بەم وشەیە وەلامیان

بدەرەوە، نازانم، نازانم."
دوای چەند ڕۆژێک، باوکم و هەموو خەڵکی دێکەمان لە گەڕاندا بوون و پاشان هەموو دانیشتووانی دوورگەی تێسلیشی لێ ئاگادار کرایەوە، ئینجا لە میدیاکانی سەرتاسەری هۆڵەندادا بڵاو بووەوە، گەنجێکی بەو ناو و ناونیشانە، بە بەلەمێکی چارۆکەدار لە دەوروبەری کەنارەکانی دوورگەی تێسل بێسەروشوێنە.
باوکم و خەڵکی دێ، بەردەوام بە کەنارەکانی دوورگەکەدا دەگەڕان، باوکم ئەوسا لە منی پرسی، "پیتەر هیچی لای تۆ نەدرکاندووە؟" لەوەڵامدا وتم، "نازانم،" وەکوو چۆن پیتەر ئامۆژگاریی کردبووم.
حەفتەیەک بەسەر ڕۆیشتنی براکەمدا تێپەڕیبوو، دایکم بەردەوام دەگریا و تەنانەت مانی لە نانخواردنیش گرتبوو، بە مەبەستی ئەوەی تۆزێک ئەو ئازارەی دڵی کەم بکەمەوە، بە دزیی باوکمەوە پێم وت، "پیتەر ماوە و سەفەرێکی دووروودرێژی کردووە، ئەوەندە دەزانم لە دەریایە و لە ژیاندا ماوە، بەڵام نازانم ئاخۆ دەگەڕێتەوە یان نا."
دیار بوو دایکم ئەو هەواڵەی منی زۆر بەلاوە گران بوو، مانگێک دوای ئەو ڕۆژە، نەخۆش کەوت و بەیانییەکیان باوکم بە گریانەوە لەخەو بەئاگای هێنام، کە دایکم مردووە.
دوای ڕۆیشتنی پیتەر و مردنی دایکم، پەیوەندیی نێوان من و باوکم، تا دەهات ڕووەو خراپی دەچوو، پاش ئەوەی دوو ساڵێک تەنیا لەوماڵەدا پێکەوە بووین، تەواو غەریب کەوتبووین بە یەکتری و زۆر کەم یەکترمان دەدواند و بەردەوام شەڕمان بوو، تەواو دڵم لەو دوورگەیە هەڵکەنرابوو، بەردەوام لە بیرکردنەوەی

ئەوەدا بووم، چۆن وەکوو پیتەر بەلەمێکی چارۆکەدارم دەست بکەوێت و خۆم بگەیەنمە لای ئەو.
پاشان پلانی ئەوەم دانا، کە لە بەندەری تێسڵدا، کە سەدان بەلەمی چارۆکەداری کۆن و نوێی لێ ڕاگیرابوو، بەلەمێک بدزم، پاش ئەوەی دوای چەندین ڕۆژ توانیم دانەیەک دەستنیشان بکەم، لە دەمەو بەیانییەکدا، کە هێشتا تاریک و ڕوون بوو، خۆم کۆ کردەوە و وەک براکەم، ڕووی دەریام گرتە بەر و بەرەو خوارووی کەنارەکانی ئەورووپا بەڕێ کەوتم.
هەموو پێداویستییەکم لەگەڵ خۆمدا بردبوو، بەتایبەتی چەند ئامێرێکی ڕێبەریکردن لە دەریادا، تا بتوانم هەمان ڕێگە بگرمە بەر، کە داروین لە کتێبی گەشت بە بیگڵدا ئاماژەی پێ دابوو، یان وێنەی کێشابوون.
لە سەرەتاوە شارەزاییم لە بەلەمی چارۆکەداردا نەبوو، تەنها ئەوەندە نەبێت، کە لە پیتەرەوە فێر بووبووم، بێباکانە خۆم دایە دەم هێزی شەپۆلی دەریا و ڕەشەبا، پاش ئەوەی زیاتر لە مانگێک لە دەریادا ون بووم و لە وشکایی و ئاوەدانی دابڕام، بە مەزەندەی خۆم، باشووری ئۆقیانووسی ئەتڵەسیم بڕیوە و گەیشتوومەتە کەنارەکانی ئەمەریکای باشوور، کاتێک لە بەندەرێک دابەزیم، بە ئاڵا و ڕەنگ و دەنگی خەڵکەکەدا زانیم، کە هێشتا لە ئەورووپام و لە وڵاتی پورتوگالم.
پاش مانگێک مانەوەم لەو بەندەرە، توانیم بە شەش حەفتە لە دەریادا بپەڕمەوە و بگەمە دوورگەکانی کاریب، لەو کاتەدا هەستم کرد، کە گەڕانم لە پیتەر لەوێوە دەستی پێ کردووە، لە هەموو جێگەیەک، نێزیکەی مانگێک دەمامەوە و سۆراغی تەواوی ئەوم

لەو جێگەیانەدا دەکرد و دیسان بەڕێ دەکەوتمەوە.
دەیان جار لە دەریادا بێهیوا دەبووم و لە برسان و لەدەست هێزی دەریا خۆم ڕادەستی مردن دەکرد، بەڵام هەموو جارێک هێزێکی نادیار منی نیوەگیان دەگەیاندەوە کەنار و وشکانی، دیسان هێزم دەدایەوە بەر خۆم و سەرلەنوێ بەڕێ دەکەوتمەوە، بەردەوام دەبووم لە چوونم بۆ ئەو کەنار و بەندەرانەی لەسەر کتێبەکەی داروین دیاری کرابوو.
پاش چەند ساڵێک، بە جۆرێک لە شەپۆلەکانی دەریا و با شارەزا بووبووم، بەدڵی خۆم بەرەو ڕووی چی جێگایەک بەڕێ دەکەوتم، بەکارم دەهێنان و ڕێگەکانم خێراتر دەبڕین، هەستم دەکرد با زۆر جار باڵی بە بەلەمە چارۆکەدارەکەم دەگرت، بەسەر ڕووی دەریادا دەیفڕاندم بۆ ئەو جێگەیەی مەبەستم بوو.
سی ساڵ بەو جۆرە، بەتەواوی هەموو دونیادا گەڕام و گشت ڕووبەریی ئاویی دونیام تەی کردن، هەموو بەندەر و کەناری دەریاکانی ئاسیا چووم، بێ ئەوەی هیچ سۆراغێکی پیتەرم دەست بکەوێت.'
'هەر نەتبینییەوە؟'
'نەخێر، هەتا ئەمڕۆیش پیتەرم نەبینیوەتەوە.'
'ئەی باوکت؟'
'باوکم، باوکمم بینییەوە.'
'ئەی چۆن ڕێت کەوتە ئەمستردام؟'
'مانگێک پێش ئەوەی بەڕێکەوت دایکت بناسم، لە ڕاستیدا مارتن، من زیاتر لە جێگەیەک دەگەڕام، شیاوی ئەوە بێت لێی بمرم، هەستم دەکرد هەر جێگەیەک دەچووم، پێشتر بۆی چووبووم،

وەکوو تر، تەواو لە گەڕان و ژیان لەناو دەریادا بێزار بووبووم، هەرچەندم کرد، نەمتوانی بگەڕێمەوە دوورگەی تێسڵ و شوێنی لەدایکبوونم، بڕیارم دا بێم بۆ ئەمستردام، حەفتەیەک لە ئەمستردام بەسەر بەرم و پاشان بۆ هەتاهەتایە کۆتایی بە ژیانی تەنیایی و ڕیسواییم بێنم و ماڵئاوایی لە ژیان بکەم.'

'ئەو جۆرە ژیانە، تۆ ناوی لێ دەنێیت ڕیسوایی؟'

'بێگومان، ئێمە هەردەم لە شوێنێکین، بەڵام کاتێک ئەو جێگەیە دەبێتە جێگا و ماڵی تۆ و کەسێکی تۆی لێ بێت، مەبەستم لەو جێگەیە پابەند بیت بە کەسێکەوە، ئێمەی مرۆڤ بەردەوام ڕیسوا و گەڕۆکین و بەدرێژایی ژیانمان، بە خەیاڵ لە گەشتداین. بمبوورە مارتن، تۆ لە سەرەتاوە پرسیاری ئەوەت لێ کردم، گوایا چۆن دایکتم ناسی، بەڵام من درێژەم بە باسەکە دا، بمبوورە، خۆ بێزارم نەکردوویت؟'

'ئیتر درێژەی پێ مەدە و پێم بڵێ چۆن لەگەڵ دایکم یەکتریتان ناسی!'

'کاتێک گەیشتمە بەندەری شاری ئەمستردام، زیاتر لە کاتژمێرێک لەناو بەلەمە چارۆکەدارەکەمدا لێی پاڵ کەوتبووم و نەمدەوێرا پێم بنێمە سەر خاکی ئەم شارە، باوەڕ بکە نەموێرا لێی بڕوانم، دوای ئەوەی بڕێک لەو تووتنە هۆشبەرەم کێشا کە لە هندییە سوورەکانی باکووری ئەمەریکاوە دەستم کەتبوو، پاش ئەوەی مەست بووم، ترسم شکا و بە سەر و گوێلاکی چڵکن و ڕیشن و جلکە دڕاو و چڵکنەکانمەوە، دابەزیمە سەر شۆستەی بەندەرەکە.

ئا لەو دەمەدا بەرێکەوت ڕووم بوو بە ڕووی دایکتەوە، با باش بیری لێ بکەمەوە، چۆن بینیم و چۆن یەکتریمان دواند.

ئا، ئا، بەم شێوەیە بوو، گوێ بگرە مارتن! لەسەر ئەو ڕاستە شۆستەیەی بەندەرەکە بێ ئارام ڕاوەستابووم و لە بیرکردنەوەدا بووم، سەرێکم هەڵبڕی و بە چواردەوری خۆمدا ڕوانیم، لەو دەمەدا بێجگە لە ئافرەتێکی سوور پۆش، کە دە مەترێک لەولای منەوە لەسەر کورسییەکی تەختە بەتەنیا دانیشتبوو و لە دەریاکەی دەڕوانی و شنەی قژە ڕەش و لوولەکەی بەسەر شان و ملیدا ڕژابوون، شنەی بایەک یاریی بە تاڵی قژەکانی دەکرد، کەسی دی لەو ناوە نەبوو، زیاتر سەرنجم نەدا و گوڕم دایە بەر خۆم، تا ملی ڕێگە بگرم بۆ ناوشار، کاتێک شۆستەی بەندەرەکەم بەجێ هێشت، لەپشتەوە گوێم لە دەنگێک بوو، "زەلام، زەلام."

ئاوڕێکم دایەوە، بینیم ئافرەتەکە هەستابووە سەر پێ و دەستی بۆ حەوا دام و چەند جارێک بانگی کردم، پاش ئەوەی تاوێک سەرسام لەملاولای خۆمم ڕوانی، لەو دەمەدا ئەو بەندەرە، جگە لە من و ئەو کەسی تری لێ نەبوو. زیاتر بۆ پێنج ساڵ ئەچوو نە کەسم دواندبوو و نە کەسیش دواندبوومی، ئەوە بە زمانی هۆڵەندی هەر مەپرسە، پێم وا بێت سی ساڵێک دەبوو قسەم پێ نەکردبوو، بەگومان بووم، ئاخۆ هیچم لەبیر مابێت، بەڵام ئەو سی ساڵە بەردەوام بە هۆڵەندی بیرم دەکردەوە و خەونم دەبینی.

بە هەرحاڵ، بەرەو ڕووی چووم، کاتێک گەیشتمە بەردەمی و لە نزیکەوە سەرنجم دا، تەزوویەک لە تەوقی سەرمەوە تا پێیەکانم کشا، بە پێکەنینێکەوە پرسیی، "لەکوێوە هاتوویت؟ ئایا تۆ مرۆڤی ئەم سەردەمەیت؟ پێم وا بێت بە هەڵە ڕێت کەوتۆتە ئێرە، دەزانیت، سێ سەدە پێش ئێستا، ئەم بەندەرە چەتەی دەریا ڕووی تێ دەکرد، پێت وا نییە تۆ درەنگ هاتوویت؟"

دیار بوو من زۆر سەرسام بووم پێی و بە سەرنجەوە لە شێوازیم دەڕوانی، لە سەرەتاوە قسەکانیم زۆر لەلا مەبەست نەبوو یان باش گوێم لێی نەبوو.

پاشان زیاتر لێی نزیک بوومەوە و ویستم لێی بپرسم، ئاخۆ مەبەستی لەو قسانەی چییە. دەستێکی نا بە شانمەوە و لە خۆی دوور خستمەوە و پێی وتم، "مەیەرە پێشەوە لێم، ناشیرین، بۆگەنت لێوە دێت."

لە کاتێکدا لە سەر بۆ خوار دیسان لە بالایم دەڕوانی، لەژێر لێوەوە پێم وت، "تۆیش هەناسەت بۆنی شەرابی لێ دێ."

دەستی لەیەک هەڵپێکان و بە تەوسێکەوە وتی، "ئەی لەوە، خۆ دەتوانێت بە زمانی مرۆڤ بدوێت، چەند تەیرێکی عەنتیکەیە، بە هۆڵەندییش دەدوێت، ناچێت بە مێشکمدا تۆ مرۆڤی ئاسایی بیت، ئایا تۆ خۆتت لە ئاوێنەدا دیوە؟"

هێشتا بەردەوام بوو لەسەر قسەکردن و گاڵتەپێکردنم، چووم لەسەر کورسییەکە دانیشتم و بێدەنگ لێم دەڕوانی، ئەو بەردەوام خۆی با دەدا و قسەی دەکرد و ناوبەناو قاقای لێدەدا، زۆری پێ نەچوو، هات لەتەنیشتمەوە دانیشت، تاوێک بوو هەردووکمان بێدەنگ لە دەریاکەمان دەڕوانی، هەر ئەوەندە بەس بوو، تاکوو بەسەرهاتی خۆمم بۆ گێڕایەوە، ئینجا ئەو ڕۆژە پێکەوە هاتین بۆ ئەم ماڵە، لێرە سەر و ڕیشم تاشی و خۆم شۆرد، پاشان پێکەوە چووین بەناو شاری ئەمستردامدا گەڕاین، ئەو شارەی لە دەمی براکەمەوە ناویم بیستبوو و هەمیشە خەونم پێوە دەبینی، دەزانی چی مارتن، باوەڕ بکە، ئەو ڕۆژە خۆشترین ڕۆژی ژیانم بوو.'

کارڵ هەناسەیەکی هەڵکێشا و بێدەنگ سەری داخستبوو، لێم

پرسی، 'ئەوسا ئەوەم لە دایکم بیست، گوایا بۆ پرسەی باوکت بۆ دوورگەی تێسڵ گەڕابوویتەوە؟'

'بەڵێ وابوو، پاش ئەوەی چەند حەفتەیەک لە ئەمستردام لای ئەیفا مامەوە، لەسەر داواکاریی ئەو، گەڕامەوە بۆ تێسڵ، لە ئەمستردامەوە سواری بەلەم بووم و بەڕێ کەوتم بۆ ئەو دوورگەیەی لە ڕاستیدا نەمدەوست ڕێگەم تێی بکەوێتەوە، کاتێک بەلەمەکە لە کەنارەکانی دوورگەکە نزیک بووەوە، لەشم دەلەرزی و دڵم وەختەبوو لە قەفەسی سنگمدا بێتە دەر و بفڕێت بەرەو ڕووی دوورگەکە، بەردەوام فرمێسک لە چاوم دەڕژا، بێ ئەوەی دەسەڵاتم بەسەر خۆمدا هەبێت، هەردوو باڵم واڵا کردبوو، وەکوو مەبەستم بێت دیمەنی دوورگەکە لە دوورەوە لەباوەش بگرم، کە لەو دەمەدا دووراو دوور پڕ بە باوەشێک دیار بوو، کاتێک پێم نایە سەر خاکەکەی، هەستم کرد تینوومە، برسیمە، بەردەوام هەناسەم هەڵدەمژی و هەناسەم دەدانەوە، بۆنی شتێکم دەکرد، کە لە هەموو دونیادا بێهاوتا بوو، بۆنێک، کە ڕۆحم ئاشنا بوو پێی و ماسوولکەکانمی گرژ دەکرد، بەرچاومیان زیاتر ڕۆشن دەکردەوە. تاوێک وەک شێت بەسەر شۆستەی بەندەری دوورگەکەدا، بە ڕاست و چەپمدا، بێ ئارام دەهاتم و دەچووم، هیچ شتێک لە پێشچاوم نەگۆڕابوو، ئەو بەندەرە هەر بۆنی ئەو بەیانییەی لێ دەهات، کە سێ ساڵ پێش ئەو ڕۆژە بەجێم هێشتبوو، خێرا خۆم گەیاندە ئەو ڕیزە تاکسییەی لە دەرەوەی تەیمانی گەراجی سەر بەندەرەکە ڕاوەستابوون، خۆم هاویشتە پێشی تاکسییەک، بێ سڵاوکردن بە شۆفێری تاکسییەکەم وت، "بۆ دەکۆخ، شەقامی کەنیسە، خانووی ژمارە سێ."

کاتێک تاکسییەکە گەیشتە بەردەمی کەنیسەکە، بە بەردەمی مالی مامدا تێپەڕی، کە بەتەنیشت کەنیسەکەوە بوو، مالی ئێمەیش بەتەنیشت مالی مامەوە بوو، تاکسییەکە لەبەرامبەر مالەکەمان وەستا، دابەزیم، تاوێک بوو لە سەر بۆ خوار لە بالای گەڕەکم دەڕوانی، دەیان وێنەی سەردەمی مندالیم بەخێرایی بە پێش چاومدا تێدەپەڕین، دەتوانم بلێم، لە چەند هەناسەیەکدا شێوەی پیتەری برام و هەموو مندالانی ئەوسای گەڕەکم هاتنەوە پێشچاو، هەنگاوەکانم هەلهێنانەوە و وەکوو جاران بە ڕاکردن خۆم گەیاندە دەرگای مالەکە، کە هەمان ڕەنگ و ڕەوالەتی جارانی هەبوو، کاتێک دەستم بەری کەوت، دەرگاکە کەوتە سەر پشت، باوەڕ بکە مارتن، بەبێ هیچ گومان و شەرمێک لەوەی سێ سالە بێ مالئاوایی بەجێم هێشتووە، خۆم کرد بە ژووردا، وەکو ئەوەی چەند کاتژمێرێک بوو بێت ئەو مالەم بەجێ هێشتبێت، لەناو دالانەکەوە باوکم بینی لەسەر کورسییەکەی ئەوسای دانیشتبوو، ئەو کورسییەی پیتەری برام ناوی لێ نابوو کورسیی پاشا، چونکە جگە لە باوکم، کەسی تر بۆی نەبوو توخنی بکەوێت، تەنانەت باوکم لە مالیش نەبووایە نەماندەوێرا لەسەری دابنیشین.

مالەکە هێشتا بۆنی دایکمی لێ دەهات، وەکوو لە دیوارەکانیدا دەنگی بۆلەبۆلی دایکم و زریکە و هاواری پیتەری تێدا هەلگیرابێت، یەک یەک دەیاندا بە گوێمدا، بەدەم لەرزین و دووچاوی تەڕەوە، ڕووبەڕووی باوکم چووم، زەق زەق لێی دەڕوانیم، بێ ئەوەی بتوانێت لە شوێنی خۆی ببزووێت، لەڕولاواز، پێستی دەموچاوی بەسەر ئێسقانەکانیدا نووسابوو، سیس و زەرد هەلگەڕاو، پاش ئەوەی بە ئاماژە سلاوم لێ کرد، لەسەر چۆک لە

بەردەم کورسییەکەدا دانیشتم، بێ ئەوەی هیچ بڵێم، سەرم خستە سەر ڕانی، هەستم کرد کە باوکم بەهێواشی دەستی جووڵاند و خستیە سەر سەرم، لەسەرخۆ پەنجەکانی لەناو قژمدا دەجووڵاند، کاتێک سەرم هەڵبڕی و تاوێک بە چاوی تەڕەوە لە یەکترمان ڕوانی، باوکم دەستی هەڵبڕی و بە ئاماژە وتی، "چاوەڕوانت بووم."

پاشان ئەو چاوی لێک نا، کورسییەکم هێنا و لەتەنیشتیەوە بێدەنگ دانیشتم، بێ ئەوەی چاوی هەڵببڕێت، دەستی هێنا و توند لەناو دەستی منی نا، نازانم چەندێک بوو بێدەنگ بە شانی یەکەوە دانیشتبووین.

زووزوو بە خەیاڵ دەگەڕامەوە سەردەمی منداڵیم و لەگەڵ پیتەردا بە ماڵەکەدا، لە سەر بۆ خوار، ڕاکەڕاکەمان بوو، هەستم بە دایکم دەکرد، کە لە چێشتخانەکە خەریکی ئامادەکردنی خۆراکی ئەو ئێوارەیە بوو، چاوێکم بەردەوام لە دالانەک بڕیبوو، ئاخۆ کەی پیتەر خۆی دەکات بە ژووردا و ئەو چاوەڕوانییە دوورەی من و باوکم دەشکێنێت، باوکم جارجار هێزی دەدایە بەر خۆی و دەستی دەگوشیم و لەو خەیاڵەمی دادەبڕیم.

چەند کاتژمێرێک بەو شێوەیە بێدەنگ دانیشتبووین، هەستم کرد لەناکاو دەستی باوکم لەناو دەستمدا سارد بووەوە و سەری هێواش هێواش کەوتە سەر شانم، ئەو ئێوارەیە، تا درەنگانێکی شەو، بەدەم بیرکردنەوە و گریانەوە بەتەنیشت لاشەی ساردوسڕی باوکمەوە خەوم لێ کەوت.

ڕۆژی دوایی لە دۆست و ناسیاوەکانم بیست، کە مامم دە ساڵێک پێش ئەو ڕۆژە، بە نەخۆشییەکی کوتوپڕ مردبوو، مامم بەدرێژایی

ژیانی، ژنی نەهێنابوو، ئەو ڕۆژە بووم بە خاوەنی دوو خانوو و بەلەمێکی ڕاوەماسی، بێجگە لە ئەلبوومی وێنە و چەند سندوقێک، کە پڕ بوون لە یادگاریی سەردەمی منداڵیم، بە حەفتەیەک، هەموویم فرۆشت و بۆ ئەمستردام و لای ئەیفا گەڕامەوە.'

٢٣

# تارمایی

مانگێک زیاتر بوو لە میسر گەڕابوومەوە، هەموو ڕۆژێک دوو جار بەتەنیا، بە پیاسە بۆ باخەکانی نزیکی ماڵی خۆمان دەچووم، لەگەڵ کارڵیش حەفتەی جارێک دەچووم بۆ نەخۆشخانە، زیاتر بۆ چاودێریکردنم و تیمارکردنی ئەو برینانەی لەسەر سمت و ناوک و بۆریی میزکردنمدا دروست بووبوون، بە هیچ دەوایەک سارێژ نەدەبوون، لە ماوەی ئەو مانگەدا، دوو جاریش سەردانی پزیشکی دەروونیم کرد، هەرجارە دوو کاتژمێرێک قسەم لەگەڵدا دەکرد، چوار جاریش سەردانی پزیشکی ددانم کرد، ئەو مانگە، لەسەر داوای کارڵ، نە پەیوەندییم بە کارمنەوە کرد و نە هاوڕێکانیشم ئاگادار کردەوە، تەنها ئەوەندە نەبێت، دوو جار بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ هێنری پراخ، بەڕێوەبەری مۆزەخانەی ئەمستردام کرد، هێنری پێی وتم، 'کەی چاک بوویتەوە و زانیت توانای کارکردنت هەیە، دەتوانیت لە مۆزەخانە دەست بکەیتەوە بە کارەکەت.'
کاتێک ئەو هەواڵەم بە کارڵ ڕاگەیاند، کارڵ پێی وتم، 'تۆ پێویستە

بۆ ساڵێک پشوو بدەیت، بۆ مەسەلەی پارەیش، هیچ خەمت نەبێت، چونکە ژمارەی حیسابییەکەم زیاتر لە ملیۆنێک ئێرۆی لەسەرە و تۆ پێویستیت بە کارکردن نییە.'

لە وەڵامدا بە کارڵم وت، 'با بزانم چۆن دەبێت و چەند مانگی داهاتوومان چۆن لێ دەگوزەرێت.'

پێکەوە ڕۆژانە سەرقاڵی ڕێکخستنەوەی ماڵەکە بووین، هەرچەند هەوڵم دا بزانم بە چی مەبەستێک هەموو کەرەستەی ماڵەکەی هەراجفرۆش کردبوو، بەڵام کارڵ نەیدەویست هیچ لەو بارەیەوە بڵێت، چەند مانگێک دوای گەڕانەوەم، لام ئاشکرا بوو کە کارڵ دوای مردنی دایکم و بێهیوابوونی لە گەڕانەوەی من، ویستبووی شاری ئەمستردام بەجێ بهێڵێت و دیسان بە بەلەمە چارۆکەدارەکەی، سەری خۆی بۆ دوورگەیەک لە دوورگە چۆڵ و بچووکەکانی دەریای هیندی هەڵبگرێت.

بۆ کڕینی کەرەستەی ناوماڵەکە، لە ڕێگەی ئەنتەرنێتەوە، ژووری خەوتن و چوار کورسی و مێزێکی نانخواردن و قەنەفە بۆ هۆڵی دانیشتنەکە، چەندین پێداویستیی ترمان داوا کرد، یەک یەک تابلۆ و سکێچەکانی دایکم هێنا و سەرلەنوێ بە سەر و خواری ماڵەکەدا دابەشم کردنەوە، گرێبەستی دەیان تابلۆی بەکرێدراوی دایکم لەگەڵ گەلەری و مۆزەخانەکاندا هەڵوەشاندەوە، ئەو تابلۆیانەی لەگەڵ دایکمدا پێکەوە کێشابوومان، لە ژوورەکەی خۆم جێگەم بۆ کردنەوە، ئەو گۆزە و نامەیەی دایکم، کە کارڵ یەکەم ڕۆژی هاتنەوەم دایە دەستم، هێشتا لەسەر ڕەفەی پەنجەرەی ژوورەکەم بوون، تا ئەمڕۆیش دەستم لێ نەداون و تەنها لێیان دەڕوانم.

ویستمان پاش ئەوەی ماڵەکەمان ڕێک خستەوە، کارمن و منداڵەکەی بۆ نانخواردنێکی ئێوارە بانگهێشت بکەین.
ئەو ڕۆژەی بە دڵپڕی و بێزارییەکەوە بەناو کەلوپەلە هەڵگیراوەکانی دایکمدا دەگەڕام، سندوقێکی داری ڕەنگکراوم بەرچاو کەوت. کاتێک لە ڕەنگ و ڕەواڵەتی سندوقەکەم ڕوانی، خێرا ناسیمەوە، زیاتر لە بیست ساڵێک پێش ئەو ڕۆژەی بەبیر هێنامەوە، کاتێک پێکەوە لەگەڵ دایکم ئەو سندوقەمان ڕەنگ کرد، ئەوەندەمان هێڵی ڕەنگاوڕەنگ بەسەر ڕووی ئەو سندوقە تەختەیەدا کێشابوو، لە سندوقی ئەفسوناوی دەچوو، هەرچەندە ڕەنگەکانی کاڵ بووبوونەوە و دێز هەڵگەڕا بوون، ئەو سندوقە هەڵگری نهێنی و کەرەستەی نیگارکێشانی دایکم بوو.
کردبوومەوە و لە کەرەستەکانی ناوی دەگەڕام، ژمارەی گۆڤارێکی هونەرم تێیدا بەرچاو کەوت، وێنەیەکی دایکم بەگەورەیی لەسەر بەرگی پێشەوەی بوو، لە کەنارەوە، لەسەر وێنەکە نووسرابوو،
"منێکی ڕەشبین، لەبەر ڕۆشنایی تابلۆکانمدا نەبێت، بەڕێی خۆم نابینم.
لێدوان لەگەڵ شێوەکار: ئەیفا سەلەمۆ"
لاپەڕەکانی گۆڤارەکەم هەڵدەدایەوە، درێژەی لێدوانەکەم خوێندەوە، سەرەتا پرسیارەکان بەگشتی لەسەر کارەکانی بوون، ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام، ئەم پرسیار و وەڵامە بوو:
"گۆڤاری هونەر: بەڕێز ئەیفا سەلەمۆ، تۆ لە لێدوانێکتدا چەند ساڵێک پێش ئەمڕۆ، کە لەگەڵ گۆڤاری کولتووردا ئەنجامت داوە،

دەڵێیت، 'کوڕەکەم خۆم خولقاندومە، هەر وەکوو هەموو فۆرم و کارەکتەرەکانی تری ناو تابلۆکانم.'

ئایا ئەگەر کوڕەکەت ئەم نووسینەت بخوێنێتەوە بەو لێدوانەت ڕازییە؟

ئەیفا سەلەمۆ: ساڵی ١٩٧٧، بۆ یەکەمین جار بوو لە هۆڵەندا، تاقیگەیەک بۆ ناشتنی شەهوەت لە منداڵانی ئافرەتدا دامەزرا، ئەو تەنها تاقیگەیەیش لە نەخۆشخانەی ئەمستردام بوو، پیاوانی خێرخواز شەهوەتی خۆیان لەو بەشە تەسلیم دەکرد، ئەویش دوای پشکنینی تەواوی ئەو پیاوانە لەلایەن پزیشکی تایبەتەوە و تۆمارکردنی هەموو زانیارییەک لەسەریان، بە مەبەستی ئەوەی ئەو ئافرەتانەی کە پیاوەکانیان کێشەیان هەیە و ناتوانن منداڵ دروست بکەن، لێی سوودمەند ببن، ئینجا بۆ ئەو ئافرەتانەی بە بێ پیاو دەیانەوێت منداڵیان ببێت، بێگومان من یەکێک بووم لەو ئافرەتانەی هەرگیز نەهاتبوو بە خەیاڵمدا، لەگەڵ پیاوێک بچمە ناو جێگەوە بە مەبەستی دروستکردنی منداڵ، دەمزانم ئەوە یاسای سروشتە، بەلام بە نەشازی دەزانم، منێکی مرۆڤ هەمان یاسا پەیرە و بکەم، کە هەموو ڕۆحلەبەرانی سەر ئەم هەسارەیە پەیرەوی دەکەن، مەبەستم لەو خووەیە، کە پێی دەڵێن *یاسای سروشت*.

کاتێک سەردانی ئەو تاقیگەیەم کرد، من یەکەم ئافرەت بووم لە هۆڵەندادا، خواستم بوو بێ پیاو منداڵێکم ببێت، کاتێک لەو تاقیگەیە پرسیاریان لێ کردم ئایا چ جۆرە منداڵێکم دەوێت، کچ، کوڕ، سوور، زەرد، ڕەش، سپی، بالابەرز، لە هەمان کاتدا وێنە و زانیاریی دەیان پیاویشیان نیشان دام، ئەوسا تەنها یەک شێوەی

مندالّم له خەیاڵدا بوو، ئەویش کوڕێکی چاو شین و قژ زەرد و باڵابەرز بوو، ئەو کوڕەی پێشتر لە چەند تابلۆیەکمدا وێنەیم کێشابوو.
ئینجا بە یارمەتیی دوو دڵۆپ شەهوەتی پیاوێکی نەناس، کە نازانم کێیە، خەونەکەم هاتە دی، دەمتوانی بزانم خاوەنی ئەو شەهوەتە کێیە و ناوی چییە و لەکوێ دەژی، بۆ من ئەوسا ئەوە گرنگ نەبوو، دیسان دەیڵێمەوە، مارتنی کوڕم، تەنها هیی خۆمە و ڕەنگ و ڕەواڵەت و ڕۆحی خۆم خولقاندوومە، مەبەستم ئەوەیە، کوڕەکەم پارچەیەکە لە ڕۆحم و هونەرەکەم."

کاتێک هێشتا خەریکی خوێندنەوەی لێدوانەکەی دایکم بووم، سەرم هەڵبڕی و بینیم کارل بەدیارمەوە ڕاوەستابوو، بێدەنگ لێی دەڕوانیم، بە ماتەمینییەکەوە لە کارلم ڕوانی، پاشان سەرم بەسەر بەرگی گۆڤارەکەدا داخستەوە و بە سەرنجەوە سەیرێکی وێنەکەی دایکمم کرد، کارل بێ ئەوەی هیچ بڵێت، هەناسەیەکی هەڵکێشا و بێدەنگ دەستی کرد بە کۆکردنەوەی هەموو ئەو کەرەستانەی من لە سندوقە ڕەنگاڵەکە دەرم هێنابوون و بە چواردەوری خۆمدا بڵاوم کردبوونەوە، پاشان هەستایەوە و دەستێکی بۆ درێژ کردم و دەستی گرتم، ویستی یارمەتیم بدات، تاکوو هەستمە سەر پێ، پێی وتم، 'خۆراکم ئامادە کردووە، وەرە با سارد نەبێتەوە، نامەیەکیشت لە میسرەوە بۆ هاتووە.'
بەردەوام قسەکانی دایکمم لە مێشکمدا لێک دەدایەوە، بێ ئەوەی وەڵامی کارڵ بدەمەوە، هەستام و بێدەنگ دوای کەوتم و پێکەوە چووین بۆ چێشتخانەکە، مێز و کورسییەکان هێشتا نوێ بوون، بۆ

جاری یەکەممان بوو، نانیان لەسەر بخۆین، کارڵ نامەیەکی لەناو دەستی بۆ ڕاگرتم و وتی، 'ئەوە نامەکەیە، ئەگەر خۆت پێی ڕادەگیرێت، دوای نانخواردن بیخوێنەرەوە.'

سەرم بۆ کارڵ لەقاند و نامەکەم لە دەستی وەر گرت، تەماشایەکی ناوونیشانی نێرەری نامەکەم کرد، ناوونیشانی باڵیۆزخانەی هۆڵەندا لە میسری لەسەر بوو، نامەکەم لەولای خۆمەوە دانا و لەگەڵ کارڵ دەستم کرد بە نانخواردن.

٢٤

# یادگاری

درەنگانی ئێوارە، ئەو ڕۆژەی لێدوانەکەی دایکم خوێندەوە، دوای ئەوەی لەگەڵ کارل پێکەوە نانمان خوارد، زیاتر لە کاتژمێرێک لەسەر مێزی نانخواردنەکە باڵەکانم لەسەر سنگمدا لەیەک هەڵپێکابوون و بێدەنگ بەرامبەر کارل دانیشتبووم، لەو کاتەدا کارل سەر مێزەکەی پڕ کردبوو لە کاغەز و سەری بەسەردا شۆڕ کردبوونەوە و بێدەنگ سەرقاڵی ژمێریاری بوو.

لەو دەمانەدا دایکم و بیرەوەرییەکانی، بە جۆرێک قورسایی خۆیان خستبووە سەر زەینم، پەلکێشیان دەکردمە ناو قووڵایی خەیاڵمەوە، بە جۆرێک، کە یەک بە یەکی وێنەی یادەوەرییەکانی خۆم و دایکم بەڕوونی بە پێش چاومدا دەهاتن و دەچوون، وێنەی سەردەمانێک، کە پێدەچێت تەنها لە دەمی دایکم خۆیەوە گوێ بیستیان بووبێتم و من بە یادەوەریی خۆمم کردبن، وێنەی دایکم دەبینی، دەمێ دووگیان بوو، وێنەی ساتی لەدایکبوونم، وێنەی یەکەم هەنگاوم، یەکەم وشەم، یەکەم ددانم و بۆ یەکەم جار کە

کەوتووم، وێنەی یەک بە یەکی ئەو ئافرەت و پیاوانەی ئەوسا میوانداریيان دەکردين، دەيان پۆرترێتی دايکم، بەردەوام دەمبينی لەبەر ئاوێنەيەکی گەورەدا پۆرترێتی خۆی دەکێشا.

ئەوەندە بەقووڵی خەياڵم ڕۆ چووبووە ناو ڕابردوومەوە، لە کارل بێئاگا بووبووم. کاتێک کارل کوپێک قاوەی گەرمی خستە بەردەمم، ڕاچڵەکيم و لە خەياڵم دابيڕيم، قومێکم لە قاوەکە دا، نامەکەم لەژێر کاغەزەکانی کارڵدا دەرهێنا و کرمەوە، بە ئينگليزييەکی ناڕەوان و خەتێکی خوار و خێچ نووسرابوو:

*"بەناوی خوای گەورە و ميهرەبان،*

*سەلام...*

*بۆ بەڕێز مارتن سەلەمۆ "خنزير"،*

*لە کارمەندانی باڵيۆزخانەی هۆڵەندام بيست، کە ماويت و پاش چەند مانگێک لە نەخۆشخانە، بەسەلامەتی گەڕاويتەوە بۆ هۆڵەندا، ئەو ڕۆژەی ئەو هەواڵەم بيست، خوا ئاگادارە زۆر زۆر دڵخۆش بووم.*

*من ئێستا لە قاهيرە دەژيم، نەک وەکوو جاران ڕيسوا و بێدەرەتان، بەڵکوو خاوەنی شوقەی خۆمم، خۆت دەزانيت بۆ من ئەوە خەونێکە و هاتووەتە دی، يانی لە قاهيرە خاوەنی جێگە و ماڵی خۆمم.*

*تەمەنا دەکەم ڕۆژێک بێت چاومان بەيەک بکەوێتەوە.*

*ناوونيشانی ماڵەکەم:*

*سەليم عومەر عەبدلڕەحمان*

*١٣، شارع احمد عرابي، ٢٣١٢*

*هاوڕێ و هاودەنگی ساڵێک بەندینخانەت*
*سەلیم عومەر "حمار!"*

لە ڕۆژێکی باراناوی سەرەتایی مانگی پێنجدا، لەگەڵ کارڵ لە خۆئامادەکردندا بووین بۆ پێشوازیکردن لە کارمن و لۆتەی کچی. ئەو بەیانییە، لەگەڵ کارڵ چووین بۆ سەردانی ئەو مەخزەنە، دایکم دە ساڵێک دەبوو گرتبووی بە کرێ و کەرەستەی زیادەی ناوماڵ و نیگارکێشیی تێدا هەڵدەگرت، مەخزەنەکە لە سەنتەری شاری ئەمستردام بوو، ئەوسا من و کارڵ بۆ جاری یەکامان بوو سەردانی ئەو جێگەیە بکەین، کاتێک لەگەڵ کارڵ مەخزەنەکەمان کردەوە، تەنها دوو سندوقی دارینی گەورەی لاکێشەیی تێدا بوو، کاتێک سندوقەکانمان کردەوە، سەرجەم تابلۆ و سکێچەکانی سامان خدریان تێدا بوو، ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام، ئەو نامەیە بوو کە لە یەکێک لە سندوقەکاندا بوو، بە خەتێکی گەورە نووسرابوو:

*"بۆ هاوڕێم مارتن،*
*دوای ئەوەی تۆ گەشتت کرد، بڕیارم دا بەیەکجاری بۆ عێراق بگەڕێمەوە، چەند ڕۆژێک پێش نووسینی ئەم نامەیەم، دایکتم بینی و پێکەوە لە قاوەخانەی گرانت دەربارەی تۆ و سامان خدر قسەمان کرد، هەر لە یەکەم ساتەوە، بە تۆ و دایکت سەرسام بووم. هەوڵی زۆرم دا تاکوو تابلۆکانی سامان بگەیەنمەوە عێراق، بەڵام بەداخەوە، نەمتوانی. پێم وایە ناسینی ئێوە، هەر وا*

*ڕێکەوتنێکی ئاسایی نەبووە، من ئێوە بە جێگەی متمانە و باوەڕی خۆم دەزانم، هەتا ڕۆحی سامان خدر و سەرجەم کارەکانی ئەو بەئامانەت بە ئێوە بسپێرم.*

*ماڵئاوا هاوڕێم*

*سمکۆ موراد"*

هەر ئەو بەیانییە، لەگەڵ کارل سندوقەکانمان گەیاندنەوە ماڵی خۆمان و لە گەراجەکە دامان نان.

ئەو ڕۆژە تا ئێوارەم بە بێدەنگی و دڵ پڕ لە گومان گوزەراند، ئامادە بووم پێشوازی لە کارمن بکەم و لە هەمان کاتیشدا، ئامادەیش نەبووم، هەستم دەکرد هێشتا بۆنی لمی بیابان و ژووری زیندانەکەم لێ دەهات، ئەوەندە خەیاڵم پەرت و شێواو بوو، نەمدەزانی لەکوێوە لەگەڵ کارمن دەست پێ بکەمەوە، هەموو ڕۆژێک پاک خۆم دەشۆرد و دەچوومە دەرەوە و هەوای پاکم هەڵدەمژی، بە مەبەستی ئەوەی ڕۆحم لە تەپوتۆز و کەڕووی بەندینخانە پاک بکەمەوە، با مردنی دایکیشم لەولاوە بوەستێت، چەند بۆشاییەکی گەورەی لە ژیانمدا دروست کردبوو.

لە سەرەداوێک، پارچەیەک، دەگەڕام، تەنها دیمەنێک لە ڕابردووی خۆم و کارمن، هەتا لەوێوە سەرلەنوێ دەست پێ بکەمەوە، وەکوو بۆ جاری یەکەمم بێت لە ژیانمدا ببیینم، ناچار ئەو ڕۆژە چەند جارێک پەنام بۆ کارڵ برد و لێم پرسی، 'کارڵ، کە کارمن هات، چی بکەم باشە؟ چۆن پێشوازیی لێ بکەم و چیی پێ بڵێم؟'

بەبیرم دێت، کارڵ لە وەڵامدا وتی، 'هەر وەک جاران.'

کاتێک لە ژوورەکەی خۆم، لەسەر جێگەکەم دانیشتبووم، لە ئەلبوومی وێنەکانی خۆم و کارمنم دەڕوانی، گوێم لە دەنگی زەنگی دەرگاکە بوو، خێرا ئەلبوومەکەم لەژێر سەرینەکەم نا و بە چەند هەنگاوێک، خۆم گەیاندە حەمامەکە، کاتێک لەبەر ئاوێنەکەدا ڕاوەستابووم و بە سەرنجەوە لە خۆمم دەڕوانی، گوێم لە دەنگی کردنەوەی دەرگاکە و دەنگی کارڵ بوو، پاشان دەنگی لۆتە، کچەکەی کارمنم هاتە گوێ، لەو دەمەدا دەنگی کارمنم نەبیست، دەستم بە دەموچاومدا هێنا و قەراغی کراسەکەم ڕێک کرد، گوڕم دایە بەر خۆم و قاچێکم لە دەرگای حەمامەکە بردە دەرەوە و سەرم هەڵبڕی، تا بەرپێی خۆم ببینم، بینیم کارمن لە بەردەممدا ڕاوەستابوو، ڕاچڵەکیم و دڵم داخورپا، بەرامبەر یەکتر، کە نیو مەترێکمان بەین دەبوو، سەرم گێژی دەخوارد و بەردەوام بە لەپی دەستم، دەموچاوم هەڵدەگلۆفی، لە قووڵایی خۆمدا لە وزە دەگەڕام، بەڵکوو بیاندەمە بەر ئەژنۆم، تا بتوانن جەستەی گرانم لەسەر خۆیان ڕابگرن، کارمن زووزوو لچ و لێوی لەیەک هەڵدەپێکان و ماسوولکەی دەموچاوی گرژ دەکرد، لەناکاو چاوی پڕ بوو لە فرمێسک و بەخوڕ بەسەر ڕوومەتە ساف و سوور و سپییەکەیدا هاتنە خوار.

ئەو لە پێش چاومدا هیچ شێوەی نەگۆڕابوو، دەموچاوی و قژە لوولە ڕەشەکەی، وەکو جاران بوو، دڵۆپ دڵۆپی فرمێسکەکانیم ناسییەوە، ئەو گریانە بەکوڵ و بێدەنگەی ئەو، کە هەستم دەکرد دڵۆپی فرمێسکەکانی بۆنی خوێنیان لێ دەهات، هەستەکانمیان بە جۆرێک ورووژاند، کە لافاوی گەرمییەک لە قووڵاییمەوە بەگوڕم شەپۆلی بە دیوارەکانی پێستمدا دەدا، دەستم لەیەک هەڵگلۆفت و

بە پرتاوێک باوەشم بە ملیدا کرد، بێ ئەوەی هیچمان وشەیەک چییە بدرکێنین، تاوێک بوو ماچی یەکترمان دەکرد و بۆنمان بە لامل و سنگی یەکترەوە دەکرد، ناو دەمم پڕ بووبوو لە سوێراوی فرمێسکەکانی ئەو.

ئەوەندە قووڵ سەرنجمان لە یەکتری دابوو، بێئاگا بووین، کارڵ کچەکەی کارمنی بە باوەشەوە بوو، بێدەنگ لەتەنیشتمانەوە ڕاوەستابوو.

ئاوڕم دایەوە و بینیم، کارڵ کچێکی قژ کاڵی چاو شینی لەباوەشدا بوو، قەڵەمی دەموچاوی لە کارمن خۆی دەچوو، کارڵ دەستی بۆ من درێژ کرد و ڕووی لە لۆتە وەر گێڕا و وتی، 'لۆتە، ئەوە مارتنە.'

کارمن، کە هێشتا باڵەکانی بەسەر شانەکانی مندا ڕاخستبوو، بە دەنگێکی نووساوەوە وتی، 'ئەو ناوەی دەمێکەیە بیستووە و چەندین جاریش وێنەکەیم پێ نیشان داوە.'

پاش ئەوەی ئاوڕم لە کارمن دایەوە و بە سەرنجەوە لێم ڕوانی، دەستم لە کارمن بەردا و لە بەردەمی کارڵدا باوەشم بۆ لۆتە کردەوە و بە ڕووخۆشییەکەوە پێم وت، 'وەرە، وەرە بۆ لای مارتن.'

لۆتە خێرا خۆی خستە باوەشمەوە، نووساندم بە خۆمەوە و ماچێکی ڕوومەتیم کرد، بۆنی کارمنی لێ دەهات، گەرمیی لەشی و نەرمیی پێستی، لەگەڵ دایکیدا هاوشێوە بوو، ئەو شەوە لە باوەشم نەهاتە دەر و لەسەر سنگم خەوی لێ کەوت، لەگەڵ کارڵدا، دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، ورچێکی سپیمان بۆ لۆتە کڕیبوو، ورچەکە دوو هێندەی لۆتە دەبوو، هەستم دەکرد لۆتە ئەوەندە بە

ترسەوە لە ورچەکەی دەڕوانی، کە نەیدەوێرا دەستی بۆ بەرێت، ناچار ورچەکەم دوور لە خۆمان، لە سووچێکی قەنەفەکەوە بەرامبەر تەلەڤزیۆنەکە دانا.

کارمن باسی چۆنیەتیی لەدایکبوونی لۆتەی بۆ کردین، من و کارل بە سەرنجەوە گوێمان لێ گرتبوو، لەسەر قەنەفەی هۆڵەکە، بێدەنگ دانیشتبووم و لۆتە لە باوەشمدا خەوتبوو، کارل و کارمن بەماڵەکەدا دەستیان کرد بە گەڕان، کارل کەرەستە نوێکانی ناو ماڵەکەی پیشانی کارمن دەدا.

لە کاتژمێر دەی شەودا، کاتێک کارمن خۆی کۆ کردەوە و بەتەمای ڕۆیشتن بوو، لە جێگەی خۆمەوە، بێ ئەوەی لە کارمن بڕوانم، پێم وت، 'کارمن، بۆ ئەمشەو لێرە نامێننەوە.'

کارمن سەیرێکی کارلی کرد و بە دەنگێکی شەرمنانەوە، 'ئەگەر کارل ڕازی بێت.'

'جێگەی شانازیمە.'

کارل ئەمەی وت و پاشان من بە لۆتەوە هەستامە سەر پێ و ڕووبەڕووی کارمن چووم و وتم، 'دە با لۆتە بەرین، تا لە جێگەکەی خۆیدا بخەوێت.'

کارمن بە سەرسامییەکەوە لێی ڕوانیم و وتی، 'جێگای خۆی؟'

لەو دەمەدا کارل بێدەنگ هاتبوو لەتەنیشتمانەوە ڕاوەستابوو، بەڕێکەوت هەردووکمان لە وەڵامدا، بەکۆرس وتمان، 'بەڵێ جێگەی خۆی.'

کارمن بە پێکەنینێکەوە لە هەردووکمانی ڕوانی و پێی وتین، 'دەترسم بێ ئاگاداری من، جێگەکەیتان هێنابێت بۆ ئێرە.'

لەگـەڵ کـارڵ دەسـتمان کـرد بـە پێکـەنین و کـارمنیش بـە سەرسامییەوە لێی دەڕوانین، کارڵ بێدەنگ دەستی کارمنی گرت و بـەدوای خۆیـدا ڕایکێشـا بـۆ نهـۆمی سـەرەوە، دوای ئـەوەی هەڵوێستەیەکم کـرد و بێدەنگ لـە لۆتـەم ڕوانـی، ئەوەنـدە قـووڵ خەوتبوو، تەنها بە گەرمیی جەستەی و ترپەی دڵیدا هەستم پێ دەکـرد، کـە گیـانی تێدا بـوو، کاتێک گەیشـتمە سـەرەوە، کـارڵ و کـارمن لـە بـەردەرگای ئـەو ژوورەدا ڕاوەسـتابوون، کاتێـک کـارڵ داوای لە کارمن کرد بە دەستی خۆی دەرگای ژوورەکە بکاتـەوە، کارمن بە سەرسووڕمانێکەوە سەیرێکی من و کارڵی کرد، دەستی دایە کێلونی دەرگاکە و کردییەوە، ئەو ژوورەی مـن و کـارڵ دوو حەفتە بوو بۆ لۆتـە، خـەریکی ڕەنگکـردن و ڕازاندنـەوەی بووین، ژوورێک، جگە لە جێگەیەکی خەوتن، هەموو پێداویستییەکانی تری تێدا بوو، کارمن بە سەرسامییەوە بەدەوری خۆیدا دەخولایەوە، لـە کەرەستەی ناو ژوورەکەی دەڕوانـی. پاش ئەوەی مـن لۆتـەم برد لـەناو جێگەکـەی خۆیـدا پاڵم خسـت و چەرچەفێکم پێدا دا، کـارمن ئەملاولای کـارڵی مـاچ کـرد و سوپاسـی کـرد، گوێم لـە کـارڵ بـوو وتی، 'ئەوە بیرۆکەی مارتنە، دەتوانیت سوپاسی ئەو بکەیت.'

کاتێک ئاوڕم لێ دانـەوە، هـەردووکیان بەرامبـەرم ڕاوەسـتابوون و لێیـان دەڕوانـیم، ڕووم لـە کـارڵ کـرد و پێم وت، 'کـارڵ، دەتوانیـت بەتەنیا بەجێمان بهێڵیت؟'

کارڵ پێکەنی و ئینجـا سـەرێکی بـا دا، 'شتی وا نییـە، مـن بەتـەمام ئەمشـەو قومێـک شـەرابتان لەگەڵـدا بخۆمـەوە، تکایـە گـەرمی و کەفوکوڵی هەوەستان سـارد بکەنـەوە و ئـەو گانـەتان هـەڵبگرن بۆ دوایی.'

لەگەڵ کارمن دەستمان کرد بە پێکەنین و بە شەرمەوە سەیرێکی یەکترمان کرد و بانگم لە کارڵ کرد، 'تەنها پێنج خولەک، تۆ شەراب و پەرداخەکان ئامادە بکە و پاشان ئێمەیش دێینە خوارێ.'

'چاوەڕوانتانم، تکایە لەبیرم نەکەن.'

گوێم لە دەنگی پێیەکانی کارڵ بوو، کە بە پلیکانەکاندا چووە خوارێ، کارمن لەژێر قژە لوولەکەیەوە بەردەوام لێی دەڕوانیم، لەبەر خۆیەوە لێی پرسیم، 'بۆ ئەمە؟'

لە کاتێکدا ئەمەی وت، کە بە هەردوو دەستی ئاماژەی بە هەموو کەرەستەی ناو ژوورەکە دەکرد، چوومە بەردەمی و شانیم گرت و لێم ڕوانی، 'ئەی تۆ بۆ وڵاتی خۆتت بەجێ هێشتووە و هاتوویت لە ئەمستردام دەژیت.'

'تا وەکوو...'

'تا نزیک بیت لە...'

'تا نزیک بم لە کەسێکەوە، کە دوای هەوا و هەوەسی خۆی کەوت و ساڵانێک لێی نەپرسیمەوە.'

'ئێ، ئەی ئێستا چی بکەین؟'

'مارتن گوێ بگرە، دەترسم، زۆر دەترسم، تەنها لەبەر خاتری لۆتە ئەمەت کردبێت، نەک من، لە کاتێکدا من دڵنیا نیم، نازانم، بەڕاستی نازانم چۆنت پێ بڵێم، لە ڕاستیدا نازانم تۆ باوکی ڕاستەقینەی ئەویت یان...!'

'یان هەرکەسێک، من پێویست ناکات ئەوە بزانم، کارمن، من هەرگیز نامەوێت ئەوە بزانم، گرنگ ئەوەیە تۆ منت قبوڵ بێت وەک، نازانم، وەک هاوڕێ، دۆست، یان هەرشتێک، ئیتر کە تۆ ناوی لێ بنێیت، بۆ خۆت و بۆ کچەکەت.'

ئارەق لە ڕووی دەچۆڕا، چاوی توند نووقاند، لەگەڵ کردنەوەیاندا، فرمێسک بەخوڕ پیایاندا هاتنە خوار، باڵەکانی هەڵبڕی و توند لە ملمیەوە ئاڵاندن و وتی، 'تەنها وەک باوکێک بۆ کچەکەم و بەس؟ چونکە هەست دەکەم دڵم زۆر لێت ڕەنجاوە و باوەڕ ناکەم جارێکی تر...'

'تکایە، زیاتر لەسەری مەڕۆ، پەیوەندیی من و تۆ زۆر لەوە زیاترە، کە تەنها لە وشەیەکدا کورتی بکەینەوە، کاتی دەوێت، ئێمە پێویستمان بە کاتی زیاترە، تاکو...'

خۆم توند پێوە نووساند و لچ و لێوم لە ڕوومەتی خشاند، کاتێک دەمم نایە ناو دەمی، هەستم کرد یەک یەک برینەکانی لەشم سارێژ دەبوون و تەڕی و لیکی ناو دەمی ئەو، تینوویێتیی چەند ساڵەیان دەشکاندم، هەستەکانم لە لەزەتی ئەو ماچەدا ڕاگرتبوون، وزە و کەفوکوڵی شەهوەتێک، کە لە خوێنمدا دەکوڵا، زووزوو مووچڕکیان بە لەشمدا دەهێنا، هەردووکمان لە دەنگی کارڵ ڕاپەڕین، لە نهۆمی خوارەوە بەردەوام بانگی دەکردین.

ئەو شەوە هەرسێکمان تا نیوەی شەو شەرابمان خواردەوە، ڕۆحم ئەوەندە بە لەزەتی شەراب غەریب کەوتبوو، لەگەڵ هەموو قوملێدانێکیدا، هەموو ماسوولکەکانی لەشم گرژ دەبوو.

## ٢٥

# کەنارگرتووەکان

کارمن و لۆتە لە ماڵی ئێمە دەژیان، ماڵەکە، جیاواز لە چەند مانگی ڕابردووی، شەو و ڕۆژ پڕ بووبوو لە دەنگ و ڕەنگ و جووڵە، هەرچەندە کارمن لەگەڵمدا دوودڵ و سارد ڕەفتاری دەکرد، منیش توانای ئەوەم تێدا نەبوو، ڕاستیی ونبوونمی بۆ باس بکەم، لەو ڕۆژانەدا، تیمێکی کەناڵی دوو، چەند جارێک سەردانیان کردین، بە مەبەستی ئامادەکردنی دۆکیومێنتارییەکی لەسەر ژیان و کارەکانی دایکم.

هەر هەمان تیم، لە ڕابردوودا دوو دۆکیومێنتارییەکی لەسەر دایکم، لە کەناڵی دووی هۆڵەندا پەخش کردبوو.

حەفتەی یەکەمی مانگی پێنج، من و کارمن سەردانی مۆزەخانەی ئەمستردامامان کرد، داوامان لە بەڕێوەبەری مۆزەخانە، هێنری پراخ، کرد، بەڵکوو ڕێگەمان پێ بدات پێشەنگایەک لە مۆزەخانەکە بکەینەوە، پێشانگەیەک بۆ ئەو تابلۆیانەی دایکم، کە هێشتا

دەرەوەی ماڵی خۆمانیان نەبینیبوو، لەگەڵ کارەکانی سامان خدردا، کە ئەوانیش ساڵێک زیاتر دەبوو لە دوو تابووتیان نابوون.

دە ڕۆژێک دوای چوونی من و کارمن بۆ مۆزەخانە، لەلایەن مۆزەخانەی ئەمستردامەوە بە نامەیەک ئاگادار کراینەوە، کە یەکی مانگی شەش، تا پازدەی هەمان مانگ، لە کۆی شەش هۆڵی مۆزەخانەدا، پێنج هۆڵمان بۆ ئامادە دەکرێت، هەر لە نامەکەیشدا نووسرابوو، کە ئەوان ئەرکی پۆستەر و ڕیکلام دەگرنە ئەستۆی خۆیان. بڕیارمان دا پێشانگەکە ناوونیشانی *کەنارگرتووەکانی* لێ بنێین، ئەو ناوونیشانە، ناوی دەیان تابلۆی سامان خدر بوو.
ئەو ڕۆژانەی لەدوای گەیشتنی نامەکەی مۆزەخانەوە تێپەڕین، هەمووومانی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردبوو، کارل و کارمن لە من زیاتر پەرۆشی هاتنی ڕۆژی یەکی شەش بوون، سی تابلۆی سامان خدرمان لەناو زیاتر لە سەد کاریدا هەڵبژارد، بە جێیەکەی کارل گەیاندنمانە مۆزەخانە، تاکوو چوارچێوەی گونجاویان بۆ هەڵبژێرن، من و کارڵ و کارمن چەندین شەو و ڕۆژمان پێ چوو. ئینجا توانیمان لەناو کارەکانی دایکمدا، سی تابلۆی هەڵبژێرین بۆ پێشانگەی کەنارگرتووەکان.

حەفتەیەک پێش ڕۆژی کردنەوەی پێشانگەکە، پۆستەرەکەی لە گەلێک کوچە و کۆڵانی شاری ئەمستردامدا هەڵواسرابوو، لە چەندین کەناڵی تەلەڤزیۆن و ڕادیۆوە، لێدوانی کورت و درێژیان لەگەڵدا کردم، بڕیار وا بوو شەوی پێش کردنەوەی پێشانگەکە، لە کەناڵی دوو، دۆکیومێنتارییە نوێکە، کە دەربارەی دایکم و

کارەکانی بوو، پەخش بکرێت، ئێمەیش ڕۆژێک پێش ئەو ڕۆژە سەرجەم تابلۆکانمان گوێزانەوە بۆ هۆڵی مۆزەخانە و ئەو شەوەی بۆ بەیانی یەکەم ڕۆژی کردنەوەی پێشانگەکە بوو.

هەموو لەوێ بووین، تەنانەت لۆتەیشمان لەگەڵ خۆماندا بردبوو، پاش دابەشکردنی تەواوی تابلۆکان بەسەر هۆڵەکاندا، دوو لادیوارمان بە بەتاڵی هێشتەوە، یەکەمیان بۆ ئەو دۆکیومێنتارییەی لەسەر دایکم ئامادە کرابوو، تاکوو بە بیمەر بەدرێژایی ڕۆژ کار بکات و چەند کورسییەکیشمان بەرامبەر دانا، بە هەمان شێوەیش، لە یەکێک لەو دوو هۆڵەی کارەکانی سامان خدری لێ بوو، دۆکیومێنتاری *میللەتێکی بێوڵاتی* نووسەر و ڕۆژنامەنووس خیرارت نۆیەر نمایش بکەین، دۆکیومێنتارییەکە لەگەڵ کارەکانی سامان خدردا تەواوکەری یەکتری بوون، پێکەوە نمایشی دیمەنی هەزاران ڕووداویان دەکرد، لەپێشدا چ تابلۆکان و چ دۆکیومێنتارییەکە، بە شوێنی جوگرافیا و سروشتی وڵاتی کوردستان دەستیان پێ دەکرد، پاشان نمایشکردنی مرۆڤی کورد، ئینجا وێنەی ئاسەواری جەنگ لەسەر مرۆڤ و گیانلەبەری و سروشتی وڵاتی کوردستان.

جگە لە کارەکانی سامان و دایکم، کە بەسەر پێنج هۆڵدا دابەشمان کردبوون، دوو تابلۆی خۆمم لە ڕاڕەوی مۆزەخانەدا هەڵواسی، یەکەمیان، پۆرترێتی فاتمە بوو، وەکوو چۆن لەسەر دیواری ژووری زیندانەکەم کێشرابوو، دووەمیان، پۆرترێتێکی سەلیم بوو، هەر لە ڕاڕەوەکەدا و بەرامبەر ئەو دوو پۆرترێتەی فاتمە و سەلیم، دوو پۆرترێتی ترمان هەڵواسی، کە کاتی خۆی دایکم کێشابوونی، یەکێکیان پۆرترێتی کارمن بوو، لە کاتێکدا دووگیان و

سكی نۆ مانگ بووه و ئەوی تریان، پۆرترێتی دایكم خۆی بوو، كاتێك ئەویش بە من دووگیان بووە.
دوو تابلۆ، كە زۆر هاوشێوەی یەكتری بوون، چ وەك ڕەنگ و فۆرم، چ وەكوو هێلكاریی كارەكان، هەردووكیان بەڕووتی بە پێوە ڕاوەستابوون و هەردوو دەستیان لەسەر سكیان دانابوو و لە سكی هەڵئاوساوی خۆیانیان دەڕوانی.
ئەو شەوە، پاش دابەشكردنی سەرجەم تابلۆكان و دامەزراندنی دوو بیمەر بەرامبەر ئەو دوو خامە سپییەی بە دیوارەكاندا هەڵواسرابوون، لەسەر ئەوە ڕێك كەوتین، كە ڕۆژانی پێشانگەكە كارمن و كارل پێكەوە لەو هۆڵانەدا ئامادە بن، كە كارەكانی دایكمی لێ نمایش كرابوو، منیش بەدرێژایی ڕۆژ لە لای كارەكانی سامان خدر ئامادەبم.
ئەو شەوە، كاتێك ئێمە هەموو كارەكانمان تەواو كردبوو، لە خۆكۆكردنەوەدا بووین تا ماڵەوە بگەڕێینەوە، هێنری پراخ سەردانی مۆزەخانەی كرد و پێی وتین، 'كاتژمێر هەشتی سەرلەبەیانی، وەزیری هونەر و كولتووری هۆڵەندا خۆی ئامادە دەبێت بۆ ڕێوڕەسمی كردنەوەی پێشانگەكە، هەروەها پارێزگاری ئەمستردام و دەیان كەسێتیی ناوداری تری وڵاتیش ئامادەییان دەبێت، شێوەكار و هونەردۆست و بازرگانانی تابلۆیش دێن، زۆرێك لە بەڕێوەبەر و خاوەنی گەلەری و مۆزەخانەكانی نەك هۆڵەندا، بگرە دونیاش دوێنێ و ئەمڕۆ هاتوونەتە ئەمستردام، بەتایبەتی بۆ بینین یان كڕینی تابلۆكانی ئەیفا سەلەمۆ و سامان خدر، دەبێت كارێكی وا بكەین، سبەینێ نەبین بەژێر دەستوپێی ئەو هەموو میوانە زۆرەوە، جگە لە سەرجەم میدیاكانی وڵات،

سبەینێ کاتژمێر هەشتی سەرلەبەیانی، چەندین میدیای بێگانەیش دێن. بە پێویستی دەزانم، هەواڵێکی گرنگتان پێش وەخت لا ئاشکرا بکەم، تا ئێوە دەرفەتتان هەبێت، باش بیری لێ بکەنەوە و خۆتانی بۆ ئامادە بکەن، دوو مۆزەخانەی ناوداری دونیا، لە شارەکانی بەرلین و نیۆرک، ئەوان پێشنیاری ئەوەیان کردووە، بەڵکوو هەمان ئەم پێشانگەیە لە داهاتوودا لای ئەوانیش نمایش بکرێت، ئەوەیش تەنها بۆ زانیاریی ئێوە، بەڵام جارێ با بە هەموومان تەواوی سەرنجمان، لەسەر سبەینێ و ئەو ڕۆژانەی لە دوای سبەینێوە دێن، ڕابگرین.'

کاتژمێر دەی ئەو شەوە، پاش هەڵبچڕینی شووشەیەک شەمپانیا و لێدانی لێواری پەرداخەکانمان لە هیی یەکتری، کۆتاییمان بە کارەکانمان هێنا و لە مۆزەخانە هاتینە دەر و پێکەوە بە پیاسە بەرەو ماڵ بەڕێ کەوتین، شار کشومات، شەقامەکان بەدەگمەن پیادەڕەویان لەسەر بوو، شەو تاریکیی خۆی بەسەر هەموو شتێکی شاردا ڕاخستبوو، لێرە و لەوێ، ڕووناکیی دارگڵۆپەکان، وەکوو هەموو شەوانێکی ڕابردووی ئەو شارە، بە ئەرکی خۆیان هەستابوون و بەرپێی شەوگەڕەکانیان ڕووناک دەکردەوە،

دارە پیرەکانی سەر شۆستەکان، پرچیان بە شانوملی دارگڵۆپەکاندا پەخش کردبوو، هەوای ئەو شەوە وشک و بۆنی تەپوتۆزی لێ دەهات، لە سنووری ڕووناکیی دارگڵۆپە دوورەکاندا، تەموومژی خۆڵبارینم بەدی دەکرد، چاوم دەکزانەوە و خێرا خێرا بەسەر قۆڵی چاکەتەکەم زەرداوم لێ دەسڕین، لە تینووانندا قوڕگم

به مەڵاشوومەوە نووسابوو، سەر ئەو شەقامە پڕ بووبوو لە کوڕ و کچ، سەرجەم جلی پۆلیسییان لەبەردا بوو، پێدەچوو بۆ ئاهەنگ خۆیان گۆڕیبێت، ئەو شەوە بە جۆرێک لەنێوان خەیاڵ و ڕاستیدا گیرم خواردبوو، خوازیار بووم زوو بگەینە ماڵەوە، تا بە چەند پەرداخێک شەراب تینوویێتیم بشکێنم و وەک شەوانی ڕابردوو، پەنا بەرمە بەر مەی بۆ هێمنبوونەوەی ڕۆحم.

لۆتە چەند کاتژمێرێک دەبوو لە عەرەبانەکەیدا خەوی لێ کەوتبوو، کارڵ بەسەر عەرەبانەکەدا نوشتابۆوە و پاڵی پێوە دەنا، من و کارمن لە شانی یەکەوە بێدەنگ، بەرەو ماڵەوە شوێنپێی کارڵمان هەڵدەگرت.

## چاپکراوەکانی نووسەر

| | |
|---|---|
| نیشتمانی سارا | ٢٠١٩ |
| خەمی مەستوورە | ٢٠٢٠ |
| ڕۆژی ڕەشنووس | ٢٠٢١ |

دەنگەکـەم ناسـییەوە، پەشـۆکام، گیانـم داهێـزرا و خێـرا ئـاوڕم لـێ دایـەوە، ڕووناکیـی دارگڵۆپەکانـی کـۆڵان بەکـزی دەگەیشـتنە نـاو ژووری چێشـتخانەکە، دەموچاوێکـی خەواڵـوو، بەڕووتـی، دیـار بـوو ئەویـش شـەرابی سـوور قوڕگـی وشـک کردبـوو، لـە تینوواندا بەخەبـەر هاتبـوو، تاوێـک بێدەنـگ بەرامبـەری یـەک ڕاوەسـتاین و هیچمان بەیـەک نـە وت، پاشـان لـە شـانی یەکـەوە ڕاوەسـاین و لـە گڵۆپـی سـەر شۆسـتەی شـەقامەکانمان دەڕوانـی، بەئەسـپایی دەسـتی لـە دەسـتم هەڵپێـکا، نازانـم ئـەوکات چیـم لـە خەیاڵـدا بـوو، بێجگـە لـەوەی ئەوەنـدەم بـەس بـوو، کـە تەنهـا بێدەنـگ ببـم، کارمـن ئـەو بێدەنگییـەی شـکاند، 'لـە زەتـت لـە ئانـا بـرد؟'

Miran Abraham

The NightWalkers

Novel




٦٠٠٠ دینار

پڕۆژەی هاوبەشی

**ناوەندی کەپر | دەزگای جەمال عیرفان**

لەسەر ئەرکی (د. تەها ڕەسوڵ) چاپ کراوە